تصوير ابو عبد الرحمن الكردي
بارانی ڕەنگاوڕەنگ
( کۆی بەرهەمەکانی مامۆستا فەرەیدون عەلی ئەمین )
ساغکردنەوە و نووسینەوە و ئامادەکردنی
کاوە ئەحمەد میرزا
سەلام مستەفا

# بارانی ڕەنگاو ڕەنگ

## (کۆی بەرهەمەکانی مامۆستا فەرەیدوون عەلی ئەمین)

ساغکردنەوەو نووسینەوەو ئامادەکردنی

**کاوە ئەحمەد میرزا**

**سەلام مستەفا**

سلێمانی ٢٠٠٦

# سەرنامە

خوێنەری هێژا:

ئەم کتێبەی لەبەردەستاندایە: بریتییە لە بەشی هەرە زۆری بەرهەمەکانی خوالێخۆشبوو مامۆستای ئەدیب و ڕووناکبیر(فەرەیدوون عەلی ئەمین)، لەگەڵ بەشێك لەو وتارو نووسینانەی کەلەدوای کۆچکردنی لە هەردوو چلەی بەغداو سلێمانیدا خوێندرابوونەوە و هەندێکیان چاپکرابوون و بڵاوبووبوونەوە و هەروەها بەشێکی تریش لەو بەرهەمانەی خوالێخۆشبوو کە بۆ یەکەمجارە لەم کتێبەدا بەرچاوئەکەون.

مامۆستا(فەرەیدوون عەلی ئەمین) یەکێکەلەو نووسەرە گەورانەی کە لەبواری ئەدەبی منداڵاندا(شیعر و چیرۆك) شوێنێکی دیار و پێشەنگی هەیە... ئەمە جگەلەو دەیان وتارو لێکۆڵینەوە و نووسینانەی کە لە سەردەمی جیاجیادا، لە ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردییەکاندا بڵاوی ئەکردنەوە.

هەروەها مامۆستای خوالێخۆشبوو چراوگێکی بیری کوردایەتی و نیشتمانی بوو، یەکێك بوو لەو ڕووناکبیرو ئەدیبە چاونەترسانەی کە زۆر زووچووە پاڵ پێشمەرگەکانی شۆڕشی ئەیلول و لەناوچەی(ماوەت)دا درێژەی بەخەباتی نەتەوەیی و پێشمەرگانەی خۆیداو لەوپێناوەدا دەستبەرداری ژیانی گەنجێتی و هەموو خۆشییەکی خۆیبوو. مامۆستا خاوەنی بیروباوەڕو هەڵوێست و مرۆڤێکی جوامێرو زرنگبوو، هەرکەسێ ڕۆژێ لە ڕۆژان لەنزیکەوە ئەوی ناسیبێ، ڕووخۆشی و دڵپاکی و دەم و دووی شیرین و قسەی پاراوی ئەو پیاوەی لەبیرناچێتەوە. خۆی مامۆستای سەرەتایی بوو لەبواری پەروەردەی منداڵان و پێگەیاندنی نەوەی تازەدا شارەزاو مۆدێرن بوو. چەندین نەوە لەبەردەستی ئەودا درووستبوون و پێگەیشتوون، خۆشەویستی منداڵانی کوردستان بوو بوو بەخەم و خولیای شەو و ڕۆژی، شێوازی نووسین و زمانە کوردیەکەی تابڵێی

ڕەوان و بێگرێ و گۆڵبوو. ئەگەرچی مامۆستا لە سەرەتای پەنجاکانی سەدەی ڕابردووەوە و بۆ یەکەمجار لەڕێی هەفتەنامەی(ژین)ی سلێمانیەوە دەرکەوت و ناسرا، بەڵام نووسینی نەکردبوو بەپیشەی خۆی، ناو بەناو ئەینووسی، هەندێجار شیعریشی ئەنووسی، ڕەنگە شیعرە ناسکەکەی(نوقڵێ)ی نموونەیەکی جوانی ئەو ئەدەبەی بێت.. مامۆستا ساڵانی دوایی ژیانی بەهۆی کارەکەیەوە لە بەغدا بردە سەرو هەر لەوێش دوای نەشتەرگەرییەکی پشت کۆچی دواییکردو تەرمەکەی هێنرایەوە بۆ سلێمانی و لەگردی سەیوان. بەخاك سپێردرا.

یەکێك لەو پرۆژانەی کە دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم خستبوویە بەرنامەی خۆیەوە چاپکردنی کۆی بەرهەمەکانی خوالێخۆشبوو بوو. بەڵام ئاستەنگییەکی زۆر لەبەردەمی جێبەجێکردنی ئەم کارەدا هەبوو، بەشێك لەبەرهەمە بڵاونەکراوەکانی کە هەموویان یەکەم ڕەشنووسی نووسەربوون کەوتبوونە لای مامۆستا(کاوەی ئەحمەد میرزا)ی خزمی نزیکی، ئەم ڕەشنووسانە پێویستیان بە ساغکردنەوەو وردەکارییەکی زۆرهەبوو، مامۆستا کاوە ئەم ئەرکەی خستە سەرشانی خۆی و ئەنجامیداو ئێمەیش لەدڵەوە سوپاسی ئەم هاریکاری و دڵسۆزییەی ئەکەین، لەلایەکی تریشەوە ئەوەی پەیوەندی بە بەرهەمە بڵاوکراوەکانیەوە هەبوو، پەرشوبڵاوو هەریەکەو کەوتبوونە لاپەڕەی یەکێك لە ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردیەکانی ساڵانی زۆرکۆنەوە... واتە ئەبوو ئێمە هەر لەسەرەتای پەنجاکانەوە تا کۆتایی هەشتاکان، لە هەفتەنامەی(ژین)ەوە دەستبکەین بەگەڕان و پشکنین تا هەموو ئەو گۆڤار و ڕۆژنامانەی کە لە بەغداو سلێمانی دەرئەچوون بۆ ئەوەی بەرهەمی مامۆستا بدۆزینەوە. دیارە ئەویش کارێکی ئاسان نەبوو، بۆیە دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم کاك(سەلام مستەفا)ی شاعیرو ڕۆژنامەوانی ڕاسپارد تا ئەم ئەرکە بگرێتە ئەستۆو لە ڕاستیدا کاك(سەلام)یش زۆر دڵسۆزانەو ئەوەندەی توانی هەوڵیداو لە هەمانکاتیشدا خوێنەرانیشی لەم مەسەلەیە ئاگادارکردەوە بۆ ئەوەی هەرکەسێ بەرهەمێکی مامۆستا فەرەیدوونی کەوتبێتەلا بۆمان بنێرێ.. هەر سەبارەت بەم هەوڵو تەقەللایەیش کاك(جیهان عەلی ئەمین)ی برای خوالێخۆشبوو ئەویش لای خۆیەوە چی لابوو لە نووسین و وێنە بۆیهێنایین و سوپاسی ئەکەین هەروەها سوپاسی

کاك (نیهاد مەحمود)ی ئامۆزای مامۆستای خوالێخۆشبوو ئەکەین کە وێنەیەکی دەگمەنی ئەوی بۆ هێناین.

هەر بۆ ئەم مەبەستەش پەیوەندیمان بەکاك(ئالان)ی کوڕی مامۆستا فەرەیدوونەوە کرد بۆ ئەوەی بزانین ئایا خوالێخۆشبوو هیچ بەرهەمێکی بڵاونەکراوەی تری هەیە، بەتایبەتی لە کتێبخانەکەی بەغدایا؟! یان ئایا ئەتوانن جارێکی تر ئەو کتێبخانەیە لە بەغدا بەسەربکەنەوە؟ بۆ ئەمەی دواییان، واتە سەردانی بەغدا، بەتایبەتی لەو بارودۆخە ناخۆشەی ئێستادا، نەمانویست لە سەری بڕۆین و لە وەڵامیشدا کاك(ئالان) پێی وتین: ئەوەندەی ئەو بزانێت بەرهەمە بڵاونەکراوەکان هەر ئەوانەن کە کەوتوونەتە لای مامۆستا کاوە.

بەمجۆرە لێرەدا ئیتر کۆتاییمان بە سۆراخ و گەڕان و پشکنینی تر هێنا، لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە تا ئەم دەقیقەیش سەد دەرسەد دڵنیانین لەوەی کە ئەم کتێبە کۆی هەر هەموو بەرهەمەکانی خوالێخۆشبووبن. بەڵام دڵنیاین کە بەشی(هەرە زۆرێتی) و هەر ئەوەندەیش بە ئێمەکراوە.

لە کۆتاییدا ئومێدئەکەین بەم کارەمان توانیبێتمان لە زنجیرەی کتێبەکانماندا، کتێبێکی جوانی دیکە پێشکەش بەکتێبخانەی کوردی بکەین و ڕۆحی سپی مامۆستا(فەرەیدوون عەلی ئەمین)یش شادبکەین. سوپاس بۆ هەموو ئەوانەش کە هاریکارییان کردین.

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

سەرەتای ٢٠٠٦

# کورتەی ژیننامەی مامۆستا فەرەیدون

- ناوی تەواوی فەرەیدونی مەلا عەلی حاجی ئەمینی کاکە حەمەی ئەلیاسە قوچەیە. لەگەڵ دروستبوونی شاری سلەیمانیدا ئەمانیش هاتوونەتە شارەوە. شاعیری ناسراوی کورد فایق بێکەس ١٩٠٥-١٩٤٨ هەر لەم بنەماڵەیەیە.

- لە ١٩٣٣/٤/٢٩ لە شاری سلێمانی هاتۆتە دنیاوە.

- خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی هەر لەوشارە تەواوکردووە، ساڵی ١٩٥٣ لە قوتابخانەی(دارالمعلمين) لە بەغدا دەرچووەو بۆتە مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی لە شارباژێر و سلێمانی و چوارتا.

- ساڵی١٩٦٢ چۆتە بەغداو لە وەزارەتی کاروباری ژوور و بە(باحث علمی) دامەزراوە، پاشان لە بەڕێوەبەرێتی گشتیی خوێندنی کوردی سەر بە وەزارەتەکە بووە بە بەڕێوەبەری بەشی(هۆی فێرکردن).

ساڵی١٩٧٥ بوو بە سەرپەرشتی پەروەردەی قوتابخانەکان.

ساڵی١٩٧٥ لە زانکۆی مستنصرییە لە بەغدا بڕوانامەی(بەکالۆریۆسی) وەرگرت. لە بەشی سەرپەرشتی پەروەردەدا.

- ساڵی١٩٨٢ لەسەر داخوازیی خۆی خانەنشینکرا.

- ساڵی١٩٨٥ بوو بە دەرسبێژی(محاضر) لە بەشی کوردییەکەی کۆلێجی پەروەردە لە زانکۆی بەغدا و تا ساڵی١٩٨٩ بەردەوام بوو.

- ئەندامی دامەزرێنەر و دەستەی بەڕێوەبەری یەکیەتیی نووسەرانی کورد بووە.

- ئەندامی دامەزرێنەری کۆمەڵەی ڕۆشنبیریی کورد بووە.

- یەکەم نووسینی ساڵی١٩٥٤ لە ڕۆژنامەی ژینی سلێمانیدا بڵاوکردۆتەوە.

## بەرهەمە بڵاوکراوەکانی:

١- پاڵەوانی دوا ڕۆژ(ئەدەبیاتی منداڵان)- ساڵی ١٩٥٨ بە هاوبەشی لەگەڵ عومەر عبدالرحیم.

٢- پیاوە بچکۆلەکە(چیرۆك و هەڵبەست بۆ منداڵان) ساڵی ١٩٧٢.

٣- کارژۆڵە(چیرۆك و هەڵبەست بۆ منداڵان)- ١٩٧٢.

٤- پاکڕی(چیرۆکێك بۆ منداڵان)- ١٩٧٤.

٥- سێو(چیرۆکێکی وەرگێڕدراو بۆ منداڵان)- ١٩٧٤.

٦- گەنمەشامی(چیرۆکێك بۆ منداڵان)- ١٩٧٤.

٧- جووجەڵەو بێچوەمراوی(چیرۆکێکی وەرگێڕدراو بۆ منداڵان)- ١٩٧٤.

٨- چەند سەرنجێك لە پیرەمێردی نەمر- (لێکۆڵینەوەی ئەدەبی) — ساڵی ١٩٧١.

٩- پیرێکی ریش درێژبوو(چیرۆك و هەڵبەست — هەڵبەستەکان لە ئینگلیزییەوە کراون بە کوردی) -١٩٨٥.

١٠- کۆمەڵێك وتاری ئەدەبی و ڕەخنەیی لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی ژین، نووسەری کورد، بەیان، ڕۆشنبیری نوێ، ڕەنگین، هاوکاری و هی تردا بڵاوکردۆتەوە.

١١- بەهاوکاری چەند وەرگێڕێك، کۆمەڵێ کتێبی خوێندنی قوتابخانەی کردووە بە کوردی لە بابەتی پەروەردە و جوغرافیا و زانیاریدا.

١٢- پەخشان لە ئەدەبی کوردیدا(بەرۆنیۆ)٦٧ل، لە بڵاوکراوەکانی معهد التدریب و التطویر التربوي/١٩٨٧.

- ساڵی ١٩٧٢ خاتوو ناهدە جەمال تاڵەبانی بوو بە هاوسەری و دوو کوڕیان هەیە(ئاسۆ) ساڵی١٩٧٣ هاتۆتە دنیاوە و(ئالان) ساڵی١٩٧٦ لەدایك بووە.

- لە١٩٩١/١١/٢٥ لەبەغدا کۆچی دواییکرد.

- ڕۆژی١٩٩٢/١/١٢ دەزگای ڕۆشنبیریی و بڵاوکردنەوەی کوردی لە بەغدا کۆڕی چلەی ماتەمینی بۆ ڕێکخست کە ژمارەیەك نووسەرانی کورد هەستی ڕێزلێنان و هەڵسەنگاندنی دەوری مامۆستایان لە ئەدەب و ڕۆشنبیری و نیشتمانپەروەریدا دەربڕی.

# پیاوە بچکۆلەکە

لە نامەخانەی نیشتمانیدا ژمارە(٨٨٤)ی ساڵی ١٩٧٢ی دراوەتێ، بەیارمەتی وەزارەتی کاروباری ژوورو(٨٠٠٠) دانەی لێ چاپکراوە، چاپخانەی(سلمان الاعظمي) بغداد.

# سەرەتا و پێشکەش

گەورەکان:

ئاگادارییەك لە ٢٠ی تشرینی دووەمی ساڵی١٩٥٩دا لە بارەی مافی منالەوە بڵاوکراوەتەوە، ئاگادارییەکە هینی نەتەوە یەکگرتووەکانەو بریتییە لە دە بەند و هەر دە بەندەکەشی پشتگیریی مافی منالەکەن و تێکڕا ئەڵێن: ئەبێ منالْ بپارێزرێت و ڕێی پەروەردە و خوێندن و فێربوونی ببێت، ئاگاداری تەندروستیی بکرێت، لە ژێر سێبەری ئازادی و سەربەستی و سەربەرزیدا گەشە بکات، لە ڕۆژی لە دایکبوونییەوە ناو و نەژادی دیاریبکرێت، لە خۆراکی تەواو و لانەوبان و وەرزش و خزمەت بێبەش نەبێت. لە تەنگانەدا دەستی یارمەتی و بەزەیی بۆ درێژبکرێت و لە بەلا بپارێزرێت، دنیایەکی پڕ لە خۆشەویستی و ئاسایشی بۆ بهێنرێتەکایەوە تا بە دڵنیایی بخەملێت و گەورەببێت، پشتگوێ نەخرێت و دڵڕەقی بەرامبەر نەنوێنرێت و نەچەوسێنرێتەوە، ڕەفتاری وای بەرامبەرنەکرێت کە بۆنی جیاوازیی لێ بێت، بانگی ئاشتی و لێبوردن و دۆستایەتیی نێوان گەلانی بە گوێدا بدرێت.

ئێمەی گەورە و لە خەم ڕەخسیو ئەگەر بە باشی لەم بەندانە وردببینەوە هەر زوو ئەوەمان بۆ دەرئەکەوێت کە هیچێکی ئەوتۆمان بۆ منالانی کورد نەکردووە کە شایانی باس بێت و بگرە قەرزارباریشیانین، دەبا ڕێگای دانەوەی ئەو قەرزە بگرین و دواڕۆژێکی وایان بۆ سازبکەین کە ئەو بەندانەو لەوانەش زیاتریان بۆ بهێنینەدی، چونکە منالانی کوردیش وەکو هەموو منالانی جیهان جوانکیلەو ئێسك سووك و شایانی خزمەتن.

دەبا لەسەرمانا هەڵنەلەرزن و سەری کوڵمەکانیان خوێنی تێنەزێت و سنگ و بەرۆکیان دانەچەکێت و خیزەخیزی نەیەت، با پێخاوس نەبن و قاچوقولیان زامدار نەبێت. با لە چڵکدا گەرنەبن و لە برساندا سکیان بە پشتیانەوە نەنووسێت و چاویان بە قوڵدانەچێت، با لە نەزانین و نەخوێندەواریدا کوێرایيان دانەیەت و لەوە زیاتر بە

قوڕدا نەچنەخوارەوە. با ژەنگی زۆرداری و ژێردەستی و بێخزمەتی لەسەرلەش و ڕوویان بتەکێنین و ڕەنگوڕووە ڕاستەقینەکەی خۆیان دەربکەوێت ئەوسا بزانن چۆن وەك گوڵ ئەگەشێنەوە و چۆن ئەدەنە قەدو باڵاو تواناو داناو خزمەتگوزارئەبن.

با ڕاست و ڕەوان پێتان بڵێم: خوڕەی فەڵبەزی کوێستانەکانمان پولێك ناهێنێت ئەگەر قاقاو تریقەی منداڵەکانمانی لەگەڵدا نەبێت، قاقاو تریقەی منداڵەکانیشمان نابێت ئەگەر ئێمە نەبین.

منداڵەکان:

نازانم چ بەهرەیەکی خوایی و چ هێزێکی نادیار و تەلیسماویتان پێیە، هەر چەند سەیرتان ئەکەم، هێمنی و دڵنیایی و بێخەتایی و ئێسك سووکی و جوانکیلەیی و ساکاری و خۆشی و گەشی و ڕووناکی و هیواو زەردەخەنە ئەبینم.

ئێوەبەو منداڵییە وەك ئەستێرەیەکی جریوەدار، پرشنگی ئەو هەمووشتانە بە دەوری خۆتاندا ئەپرژێنن، بۆیە بەرامبەر بەوە بە خۆمدا ڕائەپەرمووم کە ئەم دیارییە پچکۆلانەیەتان پێشکەش بکەم، هیوادارم بە دڵتان بێت.

فەرەیدون

١٩٧٢/١١/١

# بەرخۆڵەو کۆترە کێویلەو مناڵ

دێیەکی خنجیلانە بە قەدپاڵی شاخێکەوەبوو، فڕۆکەیەك لە دوورەوە ڤڕڕ... ڤڕڕ... ڤڕڕڕ..... هات، هەر هات، هەر هات، لە پڕ ... بۆم م... بۆم م... بۆم م... بۆم م م... دەستیکرد بە بۆم بۆردومان.

منالانی دێیەکە ڕایانئەکرد و هاواریانئەکرد:

- تەیارە هات... تەیارە هات، بۆ ژێر درەختەکە... بۆ ژێر درەختەکە.

کۆترە کێویلەیەك بە لقێکی درەختەکەوە خۆی متکردبوو، منالێك وتی:

- کۆترە دەنگ خۆشەکە، ئەوە بۆ ناخوێنی... ئەوە بۆ نالێیت.. باق.. باق.. بوو.. باق.. باق.. بوو؟! کۆترەکە وتی:

- وازبێنە بۆ خاتری خوا وازبێنە، لە ترسی هەڵۆیەکی دڵڕەق خۆم لێرەدا شاردۆتەوە.

هەشت، نۆ بەرخۆڵەی ناسکۆڵە و ئێسك سووك بە هەناسە بڕکێ خۆیان بە ژێر درەختەکەدا کرد منالێك وتی:

بەرخۆڵە جوانەکان ئەوە بۆ باعە باعتان نایەت؟! بەرخۆڵەکان وتیان:

- بێدەنگ بە کاکە گیان بێدەنگ..، لە ترسی گورگێکی لۆز ڕەش خۆمان کردووە بێرەدا.

منالەکە وتی:

- بەخوا ئێمەش لە ترسی بۆردومانی تەیارە هاتووینە بن ئەم دارە.

منالەکان و بەرخۆڵەکان و کۆترە کێویلەکە لە ژێر ئەو درەختەدا بوونە هاوڕێ و بە ئاشتی پێکەوە ژیان.

فڕۆکەکە... ڤڕ... ڤڕڕ... ڤڕڕ... ڤڕڕڕ... ملی شکاند و ڕۆیشت. منالەکان لە خۆشیا هاواریان لێ هەستا:

- هێی... هێی... هێی....، بەدەم هێی... هێیەوە ڕایان کردەوە بۆ ناو دێ. کۆترەکە سەیرێکی دەوروپشتی خۆی کرد، سەری هەڵبڕی وتی:

- باق.. باق.. بوو، باق.. باق.. بوو.

سەرێکی لەقان و دای لە شەقەی باڵ و فڕی.

بەرخۆلەکان دەستیانکردەوە بە باعە باع و قەڵەمباز، لە خۆشیا بەگاڵتەوە گازیان لە یەکئەگرت.

شوانێکیش لە بنبەردێکی نزیکی درەختەکەدا خۆی شاردبووەوە، ئەویش سەرێکی دەرهێناو نەختێك خۆیتەکان، ئینجا شمشاڵەکەی دەرهێناو چووە سەر بەردەکە، بەدەم شمشاڵ لێدانەوە ئەی وت:

- خۆزگە هەڵۆ کۆترە کێویلەی نەئەخوارد.

خۆزگە گورگ بەرخۆلەی نەئەفڕاند.

خۆزگە تەیارەش هیچ کوێیەکی بۆردومان نەئەکرد، خۆزگە کەس هەقی کەسی نەئەخوارد و هەموو بەئاشتی و خۆشی پێکەوە ئەژیان.

# پیاوە پچکۆلەکە!!

مام پیرۆتی باوکی دلێر پۆلیسی ڕێوبان بوو، لەسەر ڕێگا قیرتاوەکان بەجلوبەرگە جوانەکانییەوە ئەوەستاو ئۆتۆمۆبێل و ڕێبواری بەڕێئەکرد.

چەند ڕۆژێك پێش جەژن مام پیرۆت وتی:

- دلێرگیان، با بچین بۆ بازاڕ، جلوبەرگی جەژنت بۆ بکەم.

دلێر وتی:

- بابەگیان، حەزئەکەم لە جلوبەرگەکەی خۆتم بۆ بکەیت.

باوکی وتی:

- لەمەی خۆم؟! وەی بەسەرچاو، بۆت بە دروون ئەدەم. جەژن هات، دلێر جلوبەرگە جوانەکانی لەبەرکرد و بەخۆشییەوە چووە ناو هاوڕێکانی، جەژنە پیرۆزەی لێکردن و نەختێك گەڕان. دلێر وتی:

- وەرن یارییەکی خۆشبکەین.

هەموویان وتیان:

- دەی باشە، یارییەکە چییە؟!

دلێر وتی:

- ئادەی ببن بە دوو دەستەوە، دەستەیەکتان ببن بە ئۆتۆمۆبیل و دەستبکەن بە وڕە وڕ و دیدە دید. دەستەکەی تر وتیان:

- ئەی ئێمە ببین بەچی؟!

- ئێوەش ببن بە ڕێبوار، لەو لاڕێیە بوەستن، تا من ڕێگاتان نەدەم مەپەڕنەوە.

دلێر دەستێکی بۆ ڕێبوارەکان بەرزکردەوە وتی:

- ڕاوەستن... ڕاوەستن لە جێی خۆتان.

ئنجا بە دەستەکەی تری ئیشارەتی بۆ دەستەی ئۆتۆمۆبێلەکان کردو وتی:

- تێ پەڕن بڕۆن.. دەی... دەی... هەر بڕۆن... هەر بڕۆن... دوای نەختێك هەر بەدەستەی ئۆتۆمۆبێلەکانی وت:

- هۆپ... هۆپ... ڕاوەستن.

دلێر ئیشارەتێکی بۆ ڕێبوارەکان کردو وتی:

- فەرموون بپەڕنەوە... فەرموون دەی فەرموون.. چەند جارێك ئەمەیان دووبارەکردەوە، ناوبەناویش دەستەکانیان ئەگۆڕی، ئەوانەی ئەبوونە دەستەی ئۆتۆمۆبێل، پاش ماوەیەك ئەبوونە دەستەی ڕێبوار. هاوڕێکانی دلێر زۆر دڵیان بەم یارییە خۆشبوو و ئافەرینی دلێریان کردو وتیان:

- کاکە دلێر بەم جلوبەرگەوە لە پیاوێکی پچکۆلە ئەچیت!

هەموو منداڵەکان ئیتر لەم یارییەوە فێربوون کە لە ماڵەوە ئەچوونە دەرەوە و پۆلیسی ڕێوبان و ئۆتۆمۆبێلی ڕاستەقینەیان ئەدی، سەیری دەستی پۆلیسەکەیان ئەکرد تا ئەو نەیوتایە نە ئەپەڕینەوە.

# جووجەڵەو ڕێوی

جووجەڵەکان:

جیو... جیو... جیو، تێرمان خواردووە، دڵمان خۆشە، خوا دایکمان لێنەسێنێت.

- قرت.. قرت.. قرت، ئێوارێیە درەنگە، ئێوارێیە بۆ کولانە.

- جیو.. جیو.. جیو، ئینجا نۆرەی خەوتنە، خەوی بنباڵی دایکمان.

مریشکە کونجە- قرت.. قرت.. قرت، لای لایە جووجەڵەکانم لایلایە، لایلایە کۆرپەکانم لایلایە.

جووجەڵەکان- پرخخ... پرخخ... پرخخ.

نیوەشەو مام ڕێوی بە دزەدزە هات، دەرگای کولانەکەی کردەوە، قەپی بەملی مریشکە کونجەدا کردو فڕاندی.

جووجەڵەکان- جیو.. جیو.. جیو، مام ڕێوی دایکمانی برد، جیو.. جیو.. جیو، مام ڕێوی دایکمانی خوارد.

بەیانی هیوا خەبەری بووەوە، سەیریکرد مریشکە کونجە خوراوە و پەڕ و باڵەکەشی لەو ناوەدا فڕێدراوە.

جووجەڵەکان:

- جیو.. جیو.. جیو، کاکە هیوا فریامانکەوە، مام ڕێوی دایکمانی خوارد.

هیوا:

- مەگرین.. مەگرین قەیناکا، شەرتبێ ئەبێ ئەمشەو تەڵەی بۆ بنێمەوە و خۆشمی تا بەیانی بۆ لێماتبدەم. شەوی دووەم مام ڕێوی هاتەوە، دەمی چەورووبوو بوو، لە خۆشیا پێی نەئەکەوتە سەرئەرز، گاڵتەی بە دنیا ئەهات، بە ئەسپایی وردە وردە پێی دائەنا. ئاو بە دەمیا ئەهاتە. خوارەوە، تامی مریشکە کونجە هێشتا لە بندانیدابوو. لەبەرخۆیەوە ئەی وت:

- بە ئەسپایی بەبێ خشپە، بەبێ خشپە بە ئەسپایی، ئەمجارەش لرفی لێئەدەین، ئەمجارەش لرفی لێئەدەین. لە پڕێکا شەقە هەستاو تەڵە تەقی.

**مام ڕێوی:**

**- واق.. واق.. واق..**

**هیوا:**

**- وەی دەرد، دەرد، دەرد، خوای مریشکە کونجە ئاوا پێت ئەنوێنێ!**

**جیو.. جیو.. بژی کاك هیوا بۆ خۆت و تەڵەت.**

**مام ڕێوی- بەخوا ئیتر واناکەم، هەر ئەمجارە بەرمبدەن، هەر ئەمجارە، ئیتر واناکەم. توخوا هەر ئەمجارە، توخوا!**

**هیوا:**

**بەم قسانە چۆن ئەخەڵەتێم فێڵباز، وائەزانی منالم و هیچ نازانم!! با مژدەت بدەمێ دەمێکە خوێندوومە کە:"ڕێوی بەفێڵ ناوەستێ، مەگەر تەڵە بیبەستێ".**

**جووجەڵەکان- جیو.. جیو..جیو، کاکە هیوا ڕاست ئەکا، کاکە هیوا ڕاست ئەکا.**

**مام ڕێوی- توخوا وازم لێبێنن. بەخوا من هیچم نەکردووە. بەخوا من نەبووم.**

**هیوا- ئەی فێڵبازی درۆزن!! ئەی ئەوە کێبوو لەبەرخۆیەوە ئەی وت: ئەمجارەش لرفی لێئەدەین، من خۆم گوێم لێتبوو، من خۆم!!.**

**مام ڕێوی:**

**- ت.. ت.. ۆ.. تۆ؟! تۆ لەکوێبووی؟!**

**هیوا — من لە ئێوارێوە خۆم لێماتداویت هەی فێڵبازی کەڵەکباز!!**

**مام ڕێوی:**

**- واق... واق... واق...**

**هیوا:**

**- هەتا ئێوارە واقەواق بکەیت بەپوولێك ناچێ، ئەبێ هەر بەم تەڵەیەوە بیت تا گیانت دەرئەچێ!**

**جووجەڵەکان:**

**جیو.. جیو.. جیو.. کاکە هیوای خۆمانە، جیو.. جیو.. جیو، بۆ ئێمە پشتیوانە.**

# چۆلەکە بۆر ڕزگاری بوو

ئەردەڵان:

ـ ئەوە ئاسۆسە، دیسانەوە چۆلەکەی گرتووە، ئێوە سەیرکەن بزانن چۆن توند گوشیوێتی! بەخوا خەریکە جیق و فیقی بێنێتەدەرەوە.

ئارام:

ـ ئەوە هەر خەریکی ئەو بەزمەیە، ڕاوەستن بزانن چۆن ئەو چۆلەکەیەی لە دەست ڕزگارئەکەم.

ئەردەڵان:

ـ ئادەی بەقوربانی کوڕبم، ئادەی...

ئارام:

ـ ئێوە هەمووتان وەرن با بچین لە پڕ چۆن و چاکییەکی گەرمی لەگەڵ بکەین و بیشڵەژێنین.

مەریوان:

ـ ئێی!؟ ئەی دوای ئەوە.

ئارام:

ـ ئێی پێ ناوێ، دوای ئەوە ئەیبینین.

سوارە:

ـ مەریوان، ئارام فێڵی چاك ئەزانێ. بابزانین چیی لە ژوورسەردایە!.

سالار و سامان:

ـ ڕاست ئەکا.. ڕاست ئەکا.

ئارام:

ـ ئەوا من و ئەردەڵان ئەچین چۆنی و چاکیی لەگەڵ ئەکەین، بەدوای ئێمەدا ئێوەش وەرن.

مەریوان و سوارە و سالار و سامان:

ـ باشە دەی بڕۆن، وا ئێمەش هاتین.

ئارام و ئەردەڵان:

ـ ئای کاکە ئاسۆس!! چۆنی چاکی، دەستەکەت بێنە لێی دەرەوە.. ئەوە بۆ دیارنیت.

هێشتا ئارام دەستی هەر لە دەستی ئاسۆسدابوو و هەر بە ئەنقەستیش بەری نەئەدا تا مەریوان و ئەوان ئەگەن.

مەریوان و سوارە و سالار و سامان گەیشتن و وتیان:

ـ ئای کاکە ئاسۆس!! چۆنی، باشی، دەستەکەت بێنە.. لێی دەرەوە! ئەوە دەرناکەویت؟! ئەوە خەریکی چیت؟!.

ئاسۆس سەری لێشێواو شڵەژا، دەستی چۆلەکەکەی درێژکرد و چۆلەکە فڕی.

ئارام:

ـ قاقا.. قاقا.. قاقا، فێڵەکەمان سەریگرت، چۆلەکەمان ڕزگارکرد.

منداڵەکان:

قاقا.. قاقا.. قاقا، چۆلەکەبۆر ڕزگاریبوو.

چۆلەکەکە:

ـ سەرشۆڕ ئاسۆسی بەدخوو.

ئاسۆس بەدەم گریانەوە:

ـ ئیی ى.. ئیی ى.. ئیی ى، چۆلەکەکەم ئەوێتەوە.

چۆلەکەکە:

ـ ئەگەر ئازای بمگرەوە:

منداڵەکان بەدەم چەپڵە لێدانەوە:

ـ قاقا.. قاقا.. قاقا، چۆلەکەبۆر ڕزگاریبوو.

چۆلەکەکە:

ـ جیك جیك... جیك جیك، ئای کە ڕزگابوون خۆشە.

جیك جیك... جیك جیك، ئاسۆس حسابی بۆشە.

# کاکە ئالان مارهات، ماری ژمنگوژارهات

ئالان بە گوێی دارایدا چرپاند:

ـ بابچین هێلانە چۆلەکە دەربێنین.

دارا:

ـ دەی باشە بابچین، بەڵام لە ئێستاوە پێت بڵێم چەندمان دەرهێنا بە شەریکی وەك برا بەشیئەکەین، باش؟

ئالان:

ـ باشەباش، تۆ هەر لە ئێستاوە وائەزانی گزیت لێئەکەین.

دارا:

ـ نا کاکی خۆم قسەلەم سەرەوە خۆشە، ئینجا با شتێکی کەیشت پێبڵێم.

ئالان بە لالووتێکەوە:

ـ دەی فەرموو شتەکە چییە؟!

دارا:

ـ ئەگەر جووتمان دەرهێنا ئەوە هیچ وەکو وتم وەك برا بەشی ئەکەین، بەڵام ئەگەر تاکبوو، بۆ ئەوەمانە کە دەستئەکات بە هێلانەکەدا.

ئالان:

ـ ئەمیشیان باشە، بەڵام ماڵت بەقوڕنەگیرێ، بۆ ئەمەندە لەسەرشت ئەڕۆی، دەبڕۆ درەنگە تا کەس دیارنییە. بۆ ئەوەندە بیانوومان پێئەگریت.

دارا:

ـ باشە با بڕۆین.

ئالان لەبەرخۆیەوە:

ـ ئەم گوێسەوانەیەش هیچ ئەوی کەیان، ئەمەشیان نا، دەی بڕۆ.. هەر بڕۆ، ئاتۆ دەنگ.. وس.. وس گوێم لە جریوە جریوێکە...

دارا:

- ئەرێ بەخوا خۆیەتی!

ئالان:

- دەی زوو بە زوو پشتم بۆ دانەوێنە، جارێکی کە من پشت بۆ تۆ دائەنەوێنم.

دارا پشتی بۆ دانەواندو بە دەم پشتدانەواندنەوەکەوە وتی:

- باشە ئاخر بیرت نەچێ، جارێکی کە نۆرەی خۆمە.

ئالان:

- مەجوولێ بەقوربانتبم، یەك نەخت خۆتڕاگرە، هەریەك نەخت... ئای دارا کە پووشی زۆرە!!!.

دارا:

- ئەوە پڕیەتی پڕ.. دەزووکە چیتکرد، من بوومایە تا ئێستا هەموویم دەرهێنابوو.. دەزووکە دەی پشتم شکا پشت! ئەوە چییە چەند قورسی؟!!

- کوڕە تۆ بۆ ئەوەندە قسەئەکەیت، دەیەك نەخت ڕاوەستە، ئەوا پووشەکەم هەمووی لابرد.

ئالان:

- دە قۆڵی پیابکە قۆڵ.

ئالان قۆڵی پیاکرد و هاواری لێ هەستا:

- ئای.. ئای.. پێوەیدام.. ماربوو، ماربوو

ئالان لەسەر پشتی دارا کەوتەخوارەوە، دارا کە ئەمەی دی لە ترسا تێی تەقان و بەفرکانێك خۆی گەیاندەماڵەوە. خەڵکی گەڕەکەکە بەدەم هاوارەکەوە هاتنە دەرەوە، ئالانیان ناسییەوە، بەڵام ئالانی چی!! دەمی لە گۆکەوتبوو، لرخە لرخێکی لێوەئەهات بە هەزار حاڵ تێی گەیشتن ئەی وت:

- ماربوو.. ماربوو.

خەڵکەکە گورج پەلاماریانداو بردیان بۆ خەستەخانە، هێشتا نەگەیشتبوونە خەستەخانە ئالان لە ڕێگا گیانی دەرچوو!.

# تامی تامی گەنمەشامی

بەیانییەك، شوان و شیروان ئەچوونە مەكتەب، لەدەمی كۆڵانەكەی ماڵی خۆیاندا چالاك و بێباكی دراوسێشیان پێگەیشتن، بەیانیتان باشیان لەیەككردو پێكەوە ڕێگای مەكتەبیان گرت.

بەوبەر دەرگای مەكتەبەوە، مام ڕۆستەم دانیشتبوو، فیرتەبەقێك گەنمەشامی و نوقڵی لەبەردەمابوو مێشیان لێنیشتبوو.

مام ڕۆستەم:

- ئەوە بەلێو ئەخورێ گەنمەشامی. ئەوە نوقڵی ترشوشیرین، وەرنەوە منداڵەكان وەرنەوە...

چالاك:

- من ڕۆژانەكەم لێرە خەرج ناكەم.

شوان و شیروان:

- ئێمەیش لێرە هیچ ناكڕین، دوكانی قوتابخانە خۆش بێت ئەم شتە پیسانە چین.

بێباك بێدەنگبوو، نەختێك وەستا، لووتێكی بۆ خوراند و دەستێكی بە گیرفانیداكردو پارەی دەرهێنا، تۆپەڵێك گەنمەشامی و مستێك نوقڵێكڕی.

دەستی بە نوقڵ داكرماندنكرد و ناوبەناو تۆپەڵە گەنمەشامییەكەی بەدەمیدا ئەهێنا و ئەیووت:

- تامی تامی گەنمەشامی، تامی تامی گەنمەشامی... دوای دەرسی دووەم ناڵەناڵ و هاوار هاوار لە بێباك هەستا:

- ئائای... ئائای... ئائای سكم، ئەهـ.. ئەهـ ...ئەی هاوار... ئای.. ئەی هاوار... ئائای.. ئای... ئەهـ.. ئەهـ.

مامۆستا:

- ئەوەچییە بێباك؟! ئەوەچیتە؟!

بێباك:

- ئای.. ئەه.. سکم.. سکم.. ئەه.. سکم ژانئەکا... سکم ئەیەشێت... ئای... ئائای.
- ڕاوەستە هەر ئێستا لەگەڵ چالاکی براتدا بەتایبەتی ئەت نێرم بۆ خەستەخانە.
بێباك:
- ئائای.. ئەه.. ئائائای.. ئەهه.
- ئادەی چالاك هەر ئێستا بێباك بۆ خەستەخانە بەرەو ئەم نامەیەشتان پێبێت بۆ دکتۆر.
پاش ماوەیەك لە خەستەخانە گەڕانەوە، بێباك نەختێك ئازارەکەی کەم بووبووەوە و یەك دوو شووشە دەرمانیشی بە دەستەوەبوو.
ماموستا:
- بەخێربێنەوە... هاچی بوو.
چالاك:
- ماموستا گیان، دکتۆر سەیری کردو دەرمانی دایە، وتی بێباك شتی پیسی خواردووە. بێباك سەری شۆڕکرد، چالاك سەیرێکی بێباکی کرد ئینجا ڕوویکردەوە بەلای ماموستاداو قسەی نەکرد.
ماموستا:
- ئەوە بۆ قسەناکەن... شتی پیس!! شتی پیس!! گوایە ئەبێ چیی خواردبێ؟! قسەبکە بێباك، قسەبکە چالاك.
بێباك هەر سەری شۆڕکردبوو ڕووی نەئەهات سەر هەڵبڕێ، چالاك سەیرێکی بێباکی کردەوە ئنجا ڕوویکردە ماموستاو وتی:
- ئەوی ڕاستیبێ ماموستا گیان، بێباك لەو گەنمەشامییە تۆپەڵەو نوقڵە پیسەی ئەو بەرەوەی خواردووە.
ماموستا زۆر بەسەر سوڕماوییەوە وتی:
- ئای بێباك چۆن شتیوات کردووە؟! ئەی ئەمە دوکان نییە لێرە، ئەی نابینی هەمووشتێکی خۆشو پاکی تیایە، ئەها چۆن سەری شتەکان داپۆشراون.

- ماموستا گیان بەخوا ئیتر پوولێك لە دەرەوە خەرج ناكەم و جارێكی كە خۆم تووشی ژانەسكی واناكەم.

ماموستا سەرێكی بۆ لە قاندو وتی:

- ئا... ئا... ئەبێ وابكەی، ئەگینا نەخۆشئەكەوێ.

چالاك و بێباك:

- زۆر سوپاس ماموستا گیان زۆر سوپاس.

# پشکۆ و شێرکۆ شەڕیانە لەسەر دەنگێ زەنگیانە

پەردەی یەکەم

دەرسی سێیەم تەواوبوو، زەنگی لێداو قوتابییان چوونە حەوشە، شێرکۆ لە تینووواندا خۆشی نەیزانی چۆن خۆی بگەیەنێتە ئاوخۆرەکە، لەپڕشانی کەوت لە شانی پشکۆ و پشکۆ کەوت بەدەما.

پشکۆ:

ئەوە کوێربوویت؟! بۆ چاوت لەبەرپێی خۆت نییە؟ خۆ تۆ شانت خستمە خوارەوە.

شێرکۆ:

- نەمزانی بەخوا، ئەوەندەم تینووە لە تینواندا ئاگام لە خۆم نەماوە.

- نەتزانی ڤیروسیا، تینووتە، تینووت نییە چش، درۆئەکەیت هەر بە ئەنقەست شانت لێدام، بۆم ڕاوەستە ئەچینەدەرەوە.

- نەختێك ئاگات لە دەمی خۆتبێت، من ئەڵێم نەمزانی.

- ئاگام لە دەمی خۆم نابێت و زیاتریش. خوابمکات بە قوربانت تا ئەچینەدەرەوە بزانە ئەیەڵم ئەم هەقەت بە سەرەوە بڕوا.

- کە مادام ئەوەندە فیشاڵکەرو شەڕفرۆشی، بڕۆ چیت لە دەستدێت تەخسیری مەکە.

- باشە پیشانت ئەدەم فیشاڵە یان نا! بەڵام ئەگەر ئازایت خۆت مەشارەوە.

- من خۆم بشارمەوە؟! من؟! بەخواجوانە!! با من بچم جارێ ئاوەکەم بخۆمەوە چاومان بە یەك ئەکەوێتەوە!!

پەردەی دووەم

کە دەوام تەواوبوو باران ئەباری، هەر نەختێك لەولای قوتابخانەوە، پشکۆو شێرکۆ پەلاماری یەکیاندا. چەند قوتابییەك دەورەیاندان و ئەیانووت:

ـ کەس لێکیاننەکاتەوە! کەس ناوبژیان نەکا، شەڕە کەڵەشێرە.. شەڕە کەڵەشێرە.

قوتابییەك وتی:

پشکۆ پاشقول، پاشقول، ئەوە بیرتچۆتەوە داوەشێیت. پاشقول.. مستەکۆڵە.

چەند قوتابییەك بەدەم چەپڵە لێدانەوە ئەیانووت:

پشکۆو شێرکۆ شەڕیانە... لەسەر دەنکێ زەنگیانە.

قوتابییەکی کە دانی جیڕکردبووە و ئەیووت:

ـ ئادەی شێرکۆ... ئادەی شێری خۆم، ناودەمی سوێربکە، ناودەمی... ئادەی بۆکس.. بۆکس.. قوتابییەکی کە:

ـ کوڕە ڕاوەستن دەفتەر و کتێبەکانتان هەمووی کەوتە قوڕولیتەوە.

قوتابییەکی تر بە پێکەنینەوە:

ـ کوڕە دەفتەر و کتێبی چی.. ئەها، ئەها سەیربکە هەمووی پەڕە پەڕەبوو، ئەها بەبن پێڵاوی ئەو پیاوانەوە نووساون.

مامە پیرەیەك بە لایاندا ڕابوردو لەبەر خۆیەوە وتی:

ـ ئەی ڕووی ئەو دایك و باوك و مامۆستایانە سپی نەبێت کە پەروەردەیان کردوون.

مامۆستایەکیان بەوێدا ڕابورد، خەریکبوو لێیان بچێتە پێشەوە بەڵام کە گوێی لەو قسەیەی مامە پیرەکەبوو، سەریخۆی داخست و ڕووینەهات خۆی بکات بە خاوەنیان.

## پەردەی سێیەم

بەیانی دوای شەڕەکە، لە حەوشەی قوتابخانە، قوتابییان هەموو ڕیزکران، باوکی پشکۆو باوکی شێرکۆش بانگکرابوون.

مامۆستاکەیان کە ئاگای لە شەڕەکەیان بوو، بە دەنگێکی بەرز وتی:

ـ شێرکۆی سابیر سیوەیلی و پشکۆی شەریف شاسوار بێنەدەرەوە.

هەردووکیان هاتنە دەرەوە و لە ناوەڕاستی حەوشەکەدا ڕاگیران.

مامۆستاکەیان چیی دیبوو هەمووی گێڕایەوە، قسەکەی مامەپیرەکەشی هەر گێڕایەوە.

پشکۆو شێرکۆ تەریقبوونەوە و لە شوێنی خۆیان بوون بە تنۆکێك ئاو.

قوتابییەك:

- حەیف نییە بە هۆی دووکەسی شەڕانییەوە قسەی وابکرێت!

قوتابییەکی کە:

- مامۆستاکان و دایك و باوکمان هەر خەتایان نییە، ئەوان هەزارجار پێمان ئەڵێن کە شەڕ بە یەکتر نەفرۆشین و وەکو برابین.

مامۆستا:

- ئەمە زۆر ڕاستە، ئێمە بۆیە باوکی شێرکۆ و باوکی پشکۆشمان بانگکردووە بۆ ئەوەی بزانن کە چۆن ئەوانیش بەهۆی کوڕەکانیانەوە بە ناهەق جنێویان پێدراوە.

شێرکۆ:

- بەخوا مامۆستا خەتای منی تیانییە، ئەمە دەستیکرد بە هەڕەشەکردن و هەر لە خۆیەوە شەڕی پێ فرۆشتم.

مامۆستا:

- ئینجا تۆ شەڕەکەت لێ نەکڕییایە، تۆش خەتات هەیە، ئێمە هەموو قسەکانتانمان پێگەیشتۆتەوە.

شێرکۆ:

- باشە مامۆستا خەتای من چییە؟! من چیم کردوە؟!

مامۆستا:

- ئا... ئا پێت بڵێم خەتای تۆ چییە؟ خەتای تۆ ئەوەیە ئەبوایە بهاتیتایە شکاتت لێبکردایە... وانییە؟!

شێرکۆ بێدەنگبوو و سەری داخبست.

پشکۆ سەیرێکی باوکی کرد تەریقبووەوەو ئینجا چاوێکی بە مامۆستاکانا گێڕا دیسان تەریقبووەوە، ئینجا سەرێکی هەڵبڕی و بەدەنگێکی نەختێ نووساوەوە وتی:

- ئەگەر ئەمجارە چاوم لێبپۆشن، شەرتبێ ئیترقەت، قەت شەڕ بەکەس نەفرۆشم.

مامۆستا:

- ئەی شێرکۆ تۆ ئەڵێی چی؟!

شێرکۆ:

ـ مامۆستا منیش هەر کەسێك شەڕی پێفرۆشتم یەکسەر ئێوە ئاگادارئەکەم، خۆشم شەڕ بەکەس نافرۆشم.

مامۆستا:

ـ زۆرباشە، کەوابوو تا زووە ئاشت ببنەوە دەی دەی زوو.

پشکۆ و شێرکۆ توند دەستی یەکتریان گوشی و دەستیان کردە ملیەك و ئاشت بوونەوە.

مامۆستا:

ـ دەئینجا بچن دەستی مامۆستاکان و باوکیشتان بگوشن. چوون و دەستیان گوشین، قوتابییەکان هەموویان چەپڵەیەکی توندیان بۆ لێدان، ئنجا سروودێکی خۆشیان وت و قوتابییەکیش شیعرێکی خوێندەوەو چوونە ژوورەوە بۆ خوێندن.

# زەنگۆڵە

کاروان لە سەربان خەوتبوو، سەربانەکە هەمووی بووبوو بە هەتاو، کەچی ئەم هەر ئەم دیو و ئەو دیوی ئەکردو لە خەو هەڵنەئەستا دایکی لە حەوشەوە بە دەنگێکی بەرز وتی:

ـ کاروان.. کاروان... ڕۆڵە کاروان، ئاخر ئەمە تاکەی تۆ بەیانیان وائەکەیت.. دەهەستە درەنگە بۆ مەکتەبەکەت درەنگە!

کاروان:

ـ ئم هـ.. دەجارێ زووە، ئم هـ.. با نەختێکیتریش بنووم.

دایکی:

ـ کوڕە زووی چییە بۆ خاتری خوا وانیوەڕۆیە!

کاروان:

ـ توخوا هەر نەختێکی کە.. هەر نەختێ.

دایکی:

ـ سیروانی برات نەختێکی کە ئەڕوات و بەجێت ئەهێڵێ، ئیتر لەدواییدا نەڵێیت، ها

کاروان:

ـ باشە ناڵێم، با بڕوا کەیفی خۆیەتی.

باوکی:

ـ کوڕم سیروان تۆ بڕۆ، من سبەینێ چاری ئەم درەنگ لە خەو هەستانەی کاروان ئەکەم.

سیروان:

ـ بابە گیان چۆنی چارئەکەیت؟

باوکی:

- کورِم ئێستا پێت ناڵێم سبەی بەیانی خۆت ئەیبینی. باوکی چوو بۆ بازاڕ، زەنگۆڵەیەکی کڕی، هێنایەوە بۆماڵەوە، پەتێکی درێژی پێوەبەست، زەنگۆڵەکەی بە کۆڵەکەی سەربانەوە قایمکرد، پەتەکەشی ڕایەڵکرد بۆ خوارەوە و بەستی بە قۆڵی کورسییە گەورەکەی خۆیەوە کە لە سەری دائەنیشت.

بەیانی ڕۆژی دووەم، سیروان وەکو جاران هەستاو ڕێکوپێك خۆی کۆکردەوە و ئامادەبوو، کاروانیش هەر وەکو جاران لە جێگاکەیدا تلی ئەدا.

باوکی پەتەکەی ڕاکێشاو زەنگۆڵە دەستی پێکرد:

- زنگ زنگ زنگ زنگ....

کاروان ڕاپەڕی و لەبەرخۆیەوە وتی:

- ئای... ئای... ئەمە چییە؟!!

زەنگۆڵەکە:

- زنگ زنگ زنگ زنگ زنگ ....

کاروان:

- ئای... ئای... دایە... دایە ئەمەچییە؟!

زەنگۆڵەکە:

- زنگ زنگ زنگ زنگ زنگ زنگ...

کاروان:

- دەبوەستە قسە لەگەڵ دایکم ئەکەم!

زەنگۆڵەکە:

- زنگ زنگ زنگ زنگ زنگ زنگ...

کاروان:

- وا دیارە ئەمە گوێی نییە گوێ، زۆر لاسارە، با هەستم باشترە.

زەنگۆڵەکە:

- زنگ زنگ زنگ زنگ زنگ زنگ...

کاروان:

- دەباشە باش... تێگەیشتین، ببڕێتەوە مێشکی سەرتبردین، واهەستام، ئیتر چیت ئەوێ!! کاروان هاتەخوارەوە، سەیری پەتەکەیکرد بە قۆڵی کورسییەکەی باوکییەوە، تێگەیشت مەسەلە چییە، سیروان و باوکی سەیرێکی یەکیانکرد، زەردەخەنەیەك گرتنی، ئینجا ڕوویانکردە کاروان و دایانە قاقای پێکەنین، کاروانیش نەختێك بێدەنگبوو، ئەویش دایە قاقای پێکەنین و وتی:

- بابە ئەم بەزمە هەمووی هەر لەبەر ئەوەی من زووهەستم!!

باوکی:

- ئەیچۆن کوڕم، کە درەنگ هەستایت لە دەرس و دەورت دوائەکەویت، دوای ئەوە تۆ ئەزانیت دایکت حاڵی چیبوو بە دەستتەوە؟!! بەیانیان قوڕگی ئەنووسا ئەوەندەی بانگ ئەکردیت.

کاروان:

- ئەم قسانە هەمووی ڕاستن، بەڵام توخوا ئەگەر ئیتر زەنگۆڵەم بۆ لێدەن.

سیروان:

- باشە ئەگەر زەنگۆڵەکە لێنەدەن ئەترسم هەر درەنگ هەستیو وەکو جاران دەستپێبکەیتەوە.

کاروان:

- وەکو جاران دەست پێناکەمەوە! ئەگەر لەمەولا لە پێشتۆدا هەڵنەستام هەقتە!

باوکی بە پێکەنینەوە:

- ئەی گوایە ئێمە چیمان ئەوێ! دە تۆ زوو هەستە بزانە ئیتر گوێت لە دەنگی زەنگۆڵە ئەبێت؟

کاروان:

- باشە بابەگیان، ئیتر نەئەیەڵم دایکم دەنگی بنووسێت و نەتۆش ناڕەحەت بیت...

- سیروان قسەکەی بۆ تەواوکرد:

- .... نەمنیش بە تەنیا بچم بۆ مەکتەب.

کاروان:

- ئەی دەمخۆش، ئا، ئا، نەتۆش بە تەنیا بچیتە مەکتەب. باشە؟!

سیروان:

- زۆرباشە ئافەرین.

باوکی:

- ئافەرین کوڕم، هەرخۆش بیت کاروان.

- - -

باوکو کوڕ

باوک:

کوڕم من تۆم زۆرخۆش ئەوێ

قەزات لە ماڵی من کەوێ

کوڕ:

بابە تۆش پشتیوانمی

گۆرانیی سەرزمانمی

باوک:

کوڕم تۆ چرای ماڵمی

تۆ هێزمی، تۆ باڵمی

کوڕ:

بابە تۆش هەردووچاومی

گیان و هێز و هەناومی

- - -

# باخ

باخەکەمان ڕازاوە
هەموو کاتێك تێراوە
شوێنی پەپوولە و هەنگە
هی گوڵی ڕەنگاوڕەنگە
هەنگی باخ ناوروژێنم
پەپوولە ناتۆرێنم
باخەوانێکم بۆ خۆم
خزمەتی وا لە ئەستۆم
بژی گوڵ، بژی مناڵ
مار و مێروو بۆ ناوچاڵ

- - -

# بۆق

قیڕ.. قیڕ.. قوڕباقە
بۆقی سەرزل چوار لاقە
قوڕباقە باش ڕاوئەکا
مێشوولە لەناو ئەبا
بۆق... بۆق.. بۆقیلە
سك سپی، چاوزەقیلە
لە وشکانی و لە ئاوا
لە سێبەر و هەتاوا
بەهەوەس دێیت و دەچی
بژی قوڕباقەی ڕاوچی.

- - -

# دراوسێ

دوێنێ مامۆستا(وەسمان)

قوتابییەکانی وەستان

ئامۆژگاری ئەکردن:

قەدری دراوسێ بگرن

دراوسێتی بفامن

دراوسێ خاڵ و مامن

نابێ بانەوبان بکەن

هاوسێ هەراسان بکەن

بەردەبارانیان مەکەن

تووشی ئازاریان مەکەن

منداڵیان مەتۆرێنن

قاچ و قولیان مەشکێنن

هاوسێی باشتان خۆشبوێ

تا زوو فریاتانکەوێ

...

# کۆتری پەڕلەپێ

مندالّ:

کۆتری پەڕلەپێ، چاوپچکۆلانە

بۆ نایەیتەدەر لە ناو هێلانە

کۆتر:

ئاخر ئەترسم لە پشیلەی سەرخڕ

پشیلەی فێڵباز، چاوچنۆك و دڕ

مندالّ:

کۆتری پەڕلەپێ، گیانی شیرینم

ئاخر حەزئەکەم نەختێ بتبینم

دوو مشت گەنمم هێناوە بۆ تۆ

بیخۆ لە جیاتی ژەمی نیوەڕۆ

پشیلە دیارنییە، خۆمم بە تەنیا

وەرە گۆرانی بلێین بۆ دنیا

کۆتر:

باشە وادێمە خوارەوە بێباك

گۆرانی ئەلێین بە دلێکی پاك

باق باق بوو... ئیتر ئازادی باری

باق باق بوو... ئیتر نەما زۆرداری

- - -

# ناوماڵ

ماڵەکەمان خاوێنە
پاکە وەکو ئاوێنە
دایکم ئاوای ماڵیوە
ئەلێی یەك پارچە زیوە
دیسان خۆشم خاوێنم
قاپ و شووشە ناشکێنم
من ژوور پیسناکەمەوە
ناوماڵ تێك نادەمەوە
ئەزانم کە میوان هات
حەز لە ماڵی پاك ئەکات

...

# خووی خراپ

نینۆک بە دان ناقرتێنین
ڕیپۆق بە دەست دەرناهێنین
دکتۆر ئامۆژگاریی کردووین
برینی لەش ناخورێنین
مامۆستایان پێیان وتووین
زەردەواڵە ناوروژێنین
دوێنێ دایکمان تێی گەیاندووین
چا بە گەرمی هەڵناقوڕێنین
خۆمان لە نان ناتۆرێنین
قسەی خۆمان نادۆڕێنین

---

# بۆڕبۆڕێن

بابزانم کێ بەگوڕە
کێ لە ڕاکردنا کوڕە
کێ یەکەمی هەمووتان بێ
خەڵاتی تۆپێکی جوانبێ
لەسەرخەتێ ڕێك ڕاوەستن
تا نەڵێم: (سێ) نابێ دەرچن
کەس پێی لە خەت زیاتر نەڕوا
گزی نەکا، حەرام نەخوا
هەرکەس ئامادە ڕاوەسێ
ئەوا ئەڵێم: یەك و.. دوو... سێ
دەی هەر ڕاکەن، گوڕبەستنەوە
وەکو شێر گرەو بەرنەوە
وا ئاسۆ کەوتە پێش هەمووان
تەکانیدا وەك پاڵەوان
ئەی ئافەرین کاکە ئاسۆ
فەرموو ئا ئەم تۆپە بۆ تۆ

- - -

# من مناڵم

من مناڵم، دڵ ناسکم
ئێسك سووکم، کارئاسکم
سوێسکەو بارەکەوی شاخم
پەپوولەو بولبولی باخم
پێم بخوێنن، فێرم بکەن
پەروەردەم کەن، تێرم بکەن
نەخۆشکەوتم دەرمانم کەن
فێری ڕەوشتی جوانم کەن
ئەوسا بزانن دەستبەجێ
چۆن کوڕێکم لێ دەرئەچێ

- - -

# باخی جانەوەران

وەرن بچین بۆ سەیران
بۆ باخی جانەوەران
سەیرانێکە مەپرسە
یەکجار خۆش و بێترسە
فیل وەستاوە لەولاوە
ڕێوی فێڵی نەماوە
شێر یان بازی زل ئەدا
یان لە داخا تل ئەدا
هرچ هەڵئەسێتە سەرپێ
بەراز بۆ خۆی مانئەگرێ
گورگ لۆزی خواتەوە
بیر لە گۆشت ئەکاتەوە
دەبابچین سەیرانە
سەیری خۆش و هەرزانە

# پیرێکی ڕیش درێژ.. بوو

**لە نامەخانەی نیشتمانیدا ژمارە(٥٧١) ساڵی ١٩٨٥ی دراوەتێ، لە چاپخانەی(دار افاق عربية) چاپکراوە.**

# پێشەکی

برایان و خوشکانی بەڕێز....

من لام وایە کە بەرهەم بۆ منداڵ زۆرجار پێویستیی بە دوو پێشەکی یان پێشەکییەك و پێشکەشکردنێك هەبێت، یەکێکیان بۆ گەورە و ئەویدییان بۆ گچکە، چونکە هەندێك قسەی پێویست یان هەندێك ڕوونکردنەوەهەن کە منداڵ تێیانناگات و ئەبێ بۆ گەورەیان باسبکەیت تا بتوانن پرسی منداڵان- ئەگەربوو- وەڵام بدەنەوە، ئەمە جگەلەوەی کە ئەدەبی منداڵان خۆی بۆخۆی بەشێکە لە ئەدەب، لەبەرئەوە گەورەش هەقی خۆیەتی کە خەمخۆری بێت و کۆڵی پێوە هەلگرێت و بە تەنگ گەشەو پێشکەوتنییەوە بێت، تاوتوێی بکات، هەڵیسەنگێنێت، چاکو خراپی لەیەك جودا بکاتەوە.

ئەوی ڕاستی بێت بەرهەمێکی زۆرم بۆ منداڵان نووسیوە، بەڵام هەرجارە ئەمەندەی کە بۆ ڕۆژگاری ئەمڕۆبشێت، بەسە. هەوڵمداوە وێنەی ڕەنگاوڕەنگیشی تێدابێت، چونکە لێکۆڵینەوە زانستییەکان ساغیانکردۆتەوە کە(ڕەنگاو ڕەنگ) چێژێکی تایبەتیی لای منداڵ هەیە و بۆ زووتێگەیشتن و فێربوون، ڕێباش خۆشدەکات. هەر لەبەر ئەم لایەنە زانستییەبوو کە سووربوم لەسەر وێنەی ڕەنگاو ڕەنگ چاپکردن، دەنا ئەرکی چاپەکەی زۆرگرانە و مایەی نووسەر دەکاتە مایەی پیازفرۆشی(جاران!) هەر لەبەر ئەمەیشە هەندێك نووسەر لە چاپکردنی ڕەنگاوڕەنگدا بەناچاری دوورە و پەرێز دەوەستن، نییانەو نەبوونیش عەیب نییە.

ئەم بەرهەمە چوار شیعر و چوار چیرۆکە، شیعرەکانم لە ئینگلیزییەوە کردوون بە کوردی لە(Poems and Rhymes)وە وەرمگرتوون کە بەشێکە لە زنجیرەی.World Book - Childcraft Interna- tional, lnc

چیرۆکەکان خۆم دامناون، چیرۆکی(نە قەڵەم دزراوە و نە هیچ)، حیکایەتێکی پچووکی لەسەرە، ئەویش ئەوەیە کە کاك(ئەنوەر فەخری)ی هاوڕێم، بەو ناوەوە کە سەرپەرشتکاری پەروەردەیە لە سلێمانی، سێ چوار ساڵێك لەمەوبەر بۆی گێڕامەوە

وتی:"بۆ سەردانی قوتابخانەکان چوومە هەڵەبجە، قوتابییەکی هەشت ساڵان، لەسەرئەوەی شتێکی جوانی هاوڕێکەی خستبووە جانتاکەیەوە، لە ناوەڕاستی قوتابییەکاندا، لە حەوشە ڕاگیرابوو، شلکوتی مەرگ کرابوو، وەکو دزیان لە کەلەبەردا گرتبێت ئاوابوو، قوتابییەکان بە(دزە، دزە!) دوایکەوتبوون، منداڵە قوڕبەسەرەکەش لەبەر ئازار ئاگای لەخۆی نەمابوو، هەر پەنجەکانی ئەکرد بەدەمیدا و ئەیهێنانە دەرەوە، واقیووڕمابوو، نە ئەیزانی دزی چییەو نە ئەیزانی بۆ پێی دەڵێن دز. ئەم چیرۆکە چارەکردنێکی پەروەردانەیە بۆ حاڵەتێکیوا، هیوادارم مامۆستاکان بە پێی توانا پەیڕەویی بکەن و سوودی لێوەربگرن.

لە شیعری(تەنیا یەك دایك)دا، ناوی(گوێچکە ماسی) هاتووە، کە بریتییە لەو پارچە(سەدەف)ەی کە ئاوی دەریا بەدەم هەڵچوونەوە ڕایدەماڵێت بۆ لێواری دەریا، لەبەرئەوەی هەندێکیان لە(گوێچکە ماسی) دەچن، لای خۆمان ئەوناوەی بەسەردا بڕاوە، پێم وابێت ئێستا نموونەشی لەماڵاندا هەبێت. کە بۆ جوانی دایانناوە.

## پێشکەشە

## بەئێوە ئەی منداڵانی کورد

ئەبێ ئێمە بەرامبەر ئێوە، ڕوومان نەیەت سەرهەڵبڕین، چونکە لە مەیدانی ئەدەبی منداڵاندا، هیچی وامان بۆ نەکردوون.

ئەوەی کە لە بەردەستاندایە، لەچاو ئەوەدا کە پێشکەش بە منداڵانی وڵاتان دەکرێت، هەر هیچ نییە، بەڵام هیوادارم ئێوەش گۆڤار و کتێبی ڕەنگاوڕەنگی خۆتان ببێت، جیهانی منداڵێتیتان، پڕبێت لە زەردەخەنە جوانەکەی سەر لێوتان و زمانە شیرینەکەی کوردی، واتان دڵخۆش بکات، کە خۆشتان بوێت و خۆشی بوێن و لەیەك دوورنەکەونەوە.

# پیرێکی ڕیش درێژ... بوو

شیعری: ئەدوارد لیر

پیرێکی ڕیش درێژ.. بوو،

ترسا، جێگای پێ لێژبوو،

ئەیووت: ئا ئەم ترسەی من،

بۆ چییە؟! گوێم لێبگرن:،

دوو کوندەپەپوی چاوزەق،

کەڵەشێری نینۆك ڕەق،

چوار کڵاوکوڕەی نەرمۆڵ،

فیسقەگولەی ووریا و زۆڵ،

هەموو هێلانەی خۆیان،

لە ناو ریشما دامەزران،

# تەنیا یەک دایك

شیعری: جۆرج کوپەر

سەدان ئەستێرە بە ئاسمانەوە،
بە سەدان(گوێچکە ماسی) لای ئاودا.
سەدان پاساری بە بانانەوە،
سەدان بەرخۆلە لە خۆرەتاودا.
دلۆپەشەونم، ڕیزبوون بە سەدان،
(ڕۆژتان باش) یانە لەگەڵ بەیاندا.
بە سەدان هەنگی ئێسك سووك و جوان،
وان لە سێپەڕەی ڕەنگ ئەرخەواندا،
سەدان پەپوولە لە سەوزەگیادا،
"بەڵام یەك دایك لەناو دنیادا"

# سەمای سێبەر

شیعری: ئیڤیو ییستویك

سێبەرەکەم، سێبەری خۆم،
من هاوڕێی تۆم،
بە ئاگری ناو ئاگردان،
سەما بکە لەسەر دیوار
وەك منداڵان، وەك شاگردان
بازان ئەدەین، لەسەر تا خوار
ئە ئاوها باڵم بەرزئەکەم،
تۆش وابکە ئازیزەکەم!
پێئەکەنین، هەڵئەبەزین،
لە دیوارەوە بۆ بنمیچ،
دێین و دەچین، هەڵئەلەرزین.
هەر خۆم و خۆت وازیئەکەین
دڵی یەکتر ڕازیئەکەین

# بەستەی سابوونە لاسارەکەم

شیعری: دوروسی ئەلدز

چەند لاسارە سابوونەکەم،
من وا لە داخدا شەق ئەبەم.
هەر خۆم شۆری و دەستم بۆ برد،
خۆی شاردەوە بە دەستوبرد.
بازێك ئەدەی لە پەنجەوە، سابوونەکەم،
دوایی ئەخشێیت و ئەخلیسکێیت.
ئەی سابوونە چەتوونەکەم،
تۆ هەر خەریکی چاوشارکێیت.
لە تەشتێ ئاودا، لەناو بنەکەی،
خۆت شاردۆتەوە، گزیم لێ ئەکەی.
لەم عاسی بوونەت، دەست هەڵناگری،
بۆیە ڕۆژ بە ڕۆژ تەنکترئەبی.

# نە قەڵەم دزراوە و نەهیچ

ماموٚستا نەریمان ئەو ڕۆژە لەبەر نەخۆشی نەچوبوو بۆ قوتابخانە. ماموٚستا ئازاد بە قوتابییەکی پۆلی شەشەمی وت: هەروا نەختێك بەسەر قوتابییەکانی پۆلی سێیەمی(ب) وە بوەستە، چاودێرییەکیان بکە تا خۆم دێم.

ئەوەندەی پێنەچوو قوتابییەکەی پۆلی شەشەم هاتو نەختێك بە چپە بە ماموٚستا ئازادی ووت: قوتابییەکی ئەو پۆلە دەڵێت:"من چاوم لێبوو(گۆران) قەڵەمێکی بۆیەی سەوزی بریقەداری لەم قەڵەمەی منی لە جانتاکەی(دیار) دەرهێناو بە دزییەوە خستییە جانتاکەی خۆیەوەو بردی بۆ خۆی".

ماموٚستا ئازاد: نا.. نا وانییە، گۆران نە دزەو نەفرِی بە دزییەوەیە، ئەوەندە هەیە منداڵ لەم تەمەنەی گۆراندا حەزئەکات هەمووشتێکی ببێت و هەمووشتێك هەر بۆ خۆی بێت، ئەمە بە هەقێکی خۆی دەزانێت.

قوتابییەکەی پۆلی شەشەم: ئەی باشە ماموٚستا، ئەو قەڵەمە هەروا گۆران بە خۆڕایی بیبات بۆ خۆی؟!

ماموٚستا ئازاد: نا.. نا، نە قەڵەم براوە و نە ئەبرێت. تۆ جارێ پێم بڵێ لەو قەڵەمە لە کوێ ئەفرۆشن؟

قوتابییەکە: ئەم بەیانییە لەو قەڵەمەم لەو کتێبخانەیەی ئەو بەرمانەوە دی.

ماموٚستا ئازاد: زۆرباشە، هەر چەندە حەزناکەم تۆ بچیت بەڵام لەگەڵ مام برایمی باخەواندا بچۆ هەر ئەوەندە قەڵەمەکەی پیشانبدە و بە فڕکانێك بگەڕێرەوە پۆلی خۆت، دوایی خۆم پارەکەی ئەدەمەوە بە مام برایم. وا خۆشم دەچم بۆ پۆلی سێیەم.

(ماموٚستا ئازاد ڕوویکردە قوتابییەکان: )

هەر کەسێك ئەمڕۆ چالاك بێت دیارییەکی جوانی پێشکەش ئەکەم، با ماموٚستا(نەریمان) نەڵێت من لەوێ نەبووم دەرسیان نەخوێند، ماوەیەکی کەمی پێچوو مام برایم گەڕایەوە، هەر لەبەر دەرگای پۆلەکەدا، کاغەزێکی پێچڕاوەی دایە دەست ماموٚستا ئازاد.

دوای ئەوەی دەرس گەرمبوو، ماموٚستا وتی: ئەمڕۆ گۆران زیرەك و چالاکە، لەبەرئەوە ئەم دیارییەی پێشکەش ئەکەم، کە کاغەزە پێچڕاوەکەی کردەوە، قەڵەمێکی بۆیەی سەوزدەرکەوت، ئەبریقایەوە.

گۆران قەڵەمەکەی وەرگرت و سوپاسی ماموٚستایکرد، نەختێك وەستا، بیرێکی کردەوە، دەستیبرد بۆ ناو جانتاکەی، قەڵەمێکی سەوزی وەك قەڵەمەکەی خۆی دەرهێناو وتی: ماموٚستا ئەم قەڵەمەم دۆزیوەتەوە!.

(دیار) ڕەنگێکی هێناو برد، لە پڕ دەستیکرد بە ناو جانتاکەیدا، لە دڵی خۆیدا وتی: قەڵەمەکەی من نەبێت؟!!

کە ماموٚستا وتی: کێ ئەم قەڵەمەی بزرکردوە؟

(دیار) یەکسەر وتی: ماموٚستا گیان من!!

(دیار) هەستا دەستی(گۆران)ی گوشی و سوپاسی کرد.

# بۆچی بۆق مێشوولەی خۆش ناوێت؟!

بەهاربوو، ئیتر خۆتان ئەزانن ئەو وڵاتەی خۆمان بە دار و ئاو و شاخ و باخییەوە دەبێتە بەهەشت.

کۆمەڵەماڵێك پێکەوە چوون بۆ سەیران، هەندێك لە منداڵەکانیان کەوتنە چەپڵەڕێزان و گۆران، تەنیا دوو دێڕ لە(ئەم ڕۆژی ساڵی تازەیە، نەورۆزە هاتەوە) یان دەزانی، هەر دەیانووت و دەیانووتەوە.

(بۆقێکی جوان و سەرسەوز) سەری لە ئاوی چەمێکی نزیکیانەوە هێنایەدەر. هەوەسی گۆرانیی هەستا، دەستیکرد بە قیڕەقیڕ، وەختەبوو لە خۆشیدا باڵبگرێت. زۆر حەزی بە هاوڕێیەتیی منداڵەکان کرد.

ئەوەندەی پێنەچوو مێشووله منداڵەکانی پەستکرد، ئەمەندە نووسا بە دەست و قۆڵ و دەموچاویاندا پەستیکردن، خۆیان ئەخوراند، سەیریانکرد مێشووله وازناهێنێ، بە دڵناخۆشی گەڕانەوە.

بۆقەکە سەری سوڕما، بە قیڕەقیڕ هاواری لێکردن مەڕۆن توخوا مەڕۆن، فرمێسك بە چاویدا ئەهاتەخوارەوە، یەکێك لە منداڵەکان وەستاو بە دەنگێکی بەرز بە بۆقەکەی وت: لە داخی ئەو مێشوولانە ئەڕۆین، ئەوەندە گازیان لێگرتین تا پەستیانکردین، جێگا گازەکانیان سوورهەڵگەڕاون و لیریانکردووە، لیر، بۆقەکە کە گوێی لەم قسانەبوو، پیشی خواردەوە و وتی: ڕاوەستن بۆم مێشووله، هەر وایووت و لە ئاوەکە هاتە دەرەوە و بە قەڵمباز بۆیان چوو، کەوتەناویانەوە، زمانەدرێژ و لینجەکەی دەرکێشا، هەر مێشوولەیەکی بەرچاو بکەوتایە بە زمان لوولی ئەداو بە قەپێك وەك حەڵوا قووتی ئەدا، پاساری و بلبلەکانیش دەیانووت: نۆش، نۆش، نۆشی گیانت بێت.

لەوساکەوە بۆق مێشوولەی خۆشناوێت، لە هەر شوێنێك بیبینێ بە قەپێك دەیخوا!!

# ئەقڵ

چاو بە دەستی وت: چەند چڵکنیت، هەموو پێستت قلیشاوە، هەمووی کرێشە، ژێر نینۆکی پەنجەکانت چەند ڕەش و پیسن، یەع!

دەست: دیارە خۆتت نەدیوە، بۆیە واقسەت زلە! قنچکەت، پڕێتی لە ریپۆقە زەردە.

لووت بە گوێچکەی وت: هەی های... هەی های، تەپوتۆزی دنیات پێوەیە ناشرین.

گوێچکە: دەمنگەمنگ! لەبەر چڵم هەناسەت بۆنادرێت! تۆش وات لێهات گاڵتەمان پێبکەیت؟!

دەم بە قژی سەری وت: ها.. چۆنی مووی بزن؟! ئەوە چەندە خۆت شانەنەکردووە؟!

قژی سەر: خۆت لەبەر چەوری و زەردێنەی هێلکەو نەوسنیی هەر دیارنیت، بڕۆ لیکی لالغاوەت بسڕە، ئینجا ئەم قسە زلزلانە بکە!!

پێڵاو قاقا بە گۆرەوی پێکەنی و وتی: ئەوە بۆچی ئاوەژوویت، هەی داوەشێیت؟!

گۆرەوی: هەر وەختێك فێربووی ئاوزەنگییەکەی خۆت باش ببەستیت و جوان لە پێدا بوەستیت، ئەوسا وەرە من فێربکە!

کراس بە پانتۆڵی وت: قۆپچەکانت دابخە با نەتبینن.

پانتۆڵ: وادیارە یەخەی خۆتت نەدیوە، هۆقەیەك چڵکی پێوەیە، برای برام!

لەولاوە(ئەقڵ) وردە وردە، بە ئەسپایی هاتەپێشەوە، وتی: گوێم لە هەموو قسەکانتان بوو، ئا وەرە پێشەوە چاو: هەڕو هەر ئێستا خۆت بشۆرە، قنچکەکانت پاك پاك بکەرەوە.

چاو: بەڵێ قوربان.

ئەقڵ بە دەستی وت: برۆ یەك دوو ڕۆژ بە مەرهەم پێستەکەت چەوربکە، کە قلّیشاویی و کرێشی نەما، پاك پاك بە سابوون بێشۆرە، نینۆکیش بکە.

(دەست، تەق سەلامێکی کردو ڕۆیشت!)

ئەقڵ: (چاوێکی گێڕا)... ئاوەرە لووت، هەرئێستا بڕۆ سێ چوار(فم) بکە، با هەر پاك و خاوێن بیت.

لووت: هەر ئێستا گەورەم!

ئەقڵ: ئا وەرە گوێچکە... نا.. نا نەختێ وەرە پێشترەوە، تێگەیشتیت چیم بەوانەی پێش تۆ وت؟

گوێچکە: باش تێگەیشتم... گەورەم.

ئەقڵ: دەتۆش برۆ خۆت وەکو ئەوان پاکبکەرەوە.

گوێچکە: وەی بەسەرچاو.

ئەقڵ: ئەی ئەوە کوا دەم کوا؟ لە کوێیە؟!

(دەم لە پەنایەکەوە هاتە دەرەوە): قوربان لە شەرمدا خۆم شاردبووەوە.

ئەقڵ: نا.. نا.. شەرمی پێ ناوێ، برۆ خۆت بە ئاو و سابوون بشۆرە، ددانەکانیشت بە فلّچەو دەرمانی ددان پاکبکەرەوە.

قژی سەر بە ئەقڵی وت: ئەی قوربان من چ بکەم؟!

ئەقڵ: تۆش ئەو چلکو تەپوتۆزە بە خۆتەوە مەهێڵە، دوای ئەوە خۆت شانەبکە، بزانە چۆن دەبێت بە گوڵ.

ئەقڵ ڕوویکردە پێڵاو: ئاوزەنگی ئاوها دەبەسرێت، تێگەیشتیت؟! ئینجا ڕوویکردە گۆرەوی: ئا ئەمە دیوی دەرەوەتە ئا ئەمە، ئیتر ئاوەژوو مەبە(پێڵاو و گۆرەوی بەیەك دەنگ): بەڵێ باشە.

ئەقڵ(نەختێك وەستا) : وەرن کراس و پانتۆڵ، لاموایە هەر ئێوەماون! ڕوویکردە کراس: برۆ ماڵەوە خۆت بشۆرە، بە پانتۆڵیشی وت: تۆش دەڕۆیتەوە قۆپچەکانت لێدەنێیتەوە، خەتی ئوتوەکەشت دیار نییە لە بیرت نەچێت!

کراس و پانتۆڵ پێکەوە وتیان: وەی بە سەرچاو.

(دوای چوار پێنج سەعات...)

چاو، دەست، لووت، گوێچکە، دەم، قژی سەر، پێلاو، گۆرەوی، کراس، پانتۆڵ، هەموویان لە منداڵێکی ڕووخۆشدا یەکتریان دییەوە، سەیری یەکدیانکرد، یەك لە یەك خاوێنتر و جوانتربوون، دەستیانکردە ملییەك، منداڵەکەش لە خۆشیدا بە دەم گۆرانییەوە بردنی بۆ سەیری یاریی تۆپێن. سەگیماڵی منداڵەکەش بە ڕاکردن تا ماوەیەك دوایانکەوت.

منداڵەکە پێی وت: دەی: (زەردە) بگەڕێرەوە بۆ ماڵەوە، شوێن یاری جێگای تۆ نییە، ئەترسم منداڵەوردکە ئازارت بدەن!.

# منداڵێك و چۆلەكەیەك

منداڵێك لە ژێردارتوویەكدا كتێبێكی منداڵانی دەخوێندەوە. چۆلەكەیەك بەسەردارەكەوە ئەیجریوان، نە جریوەیەك، نە دووان نە دە، نەسەد، ئەو ناوەی كردبوو بە ڕۆژی خۆی، بلبلێك بە دارەكەوەبوو، لەبەر چۆلەكەكە ڕێگای نەبوو بەو دەنگە خۆشەی جوكەیەك بكات. هەر باڵدارێك ئەهات، چۆلەكەكە وەك مەقەست دەنووكی ئەدا بەیەكدا و ئەیجریوان، نەگوێی لە كەس ئەگرت تا قسەیەك فێربێت نەخۆشی دەنووكی لێكدەنا تا نەختێك ئیسراحەت بكا. فیسقەگولەیەك بە بێدەنگ چووە تەنیشتییەوە و وتی: ئەوە قوڕگت نەنوسا؟! دەنووكت شلنەبوو؟! دە حەپولكی ئێمەش بدە هەر جوكەیەكی بۆ ئەكەین و ئەڕۆین، لەم دنیایەدا هەر تۆ هەیت؟! بە دەیان باڵدار و بولبول هەن، دەنگیان لە تۆ زۆرخۆشترە!!

چۆلەكە، گوێی نەدا بە قسەی فیڕنەگولە، دەستی كردەوە بە جریوە جریوو چەنەبازیی خۆی، منداڵەكە لە كردەوەی چۆلەكەكە زۆر پەستبوو، چۆلەكەكە جێی بە ئەمیش چۆڵكرد، چونكە لە پەستیدا هەستاو ڕۆیشت.

لەو ڕۆژەوە ئەو منداڵە نەحەز لە چەنەبازی دەكات و نەمنداڵی چەنەبازی خۆشدەوێت.

# بارانی ڕەنگاو ڕەنگ

## (کۆی بەرهەمەکانی مامۆستا فەرەیدوون عەلی ئەمین)

ساغکردنەوەو نووسینەوەو ئامادەکردنی

**کاوە ئەحمەد میرزا**

**سەلام مستەفا**

سلێمانی ٢٠٠٦

# پاڵەوانی دوا ڕۆژ

بەهاوبەشی لەگەڵ مامۆستا(عومەر عەبدولرەحیم)دا لە چاپخانەی (شەفیق) ساڵی ١٩٥٨ لەچاپدراوە:

# پێشەکی

ئێمە لەو بڕوایەداین کە پەروەردەکردن و گۆشکردنی قوتابیان بە شێوەیەکی پوخت و ڕاست ئەکەوێتە پێش فێرکردنی زانیاریەوە بە تایبەتی لە پلەی یەکەمی خوێندنا پەروەردەکردن و ئامۆژگاری قوتابیانیش(بە تایبەتی هی منالە بچکۆلەکانی پۆلی یەکەم و دووەم) وەستاییەکی زۆر و ئاگاداربوونێکی تەواوی ئەوێ چونکە منالّ وەکو گەورە نیە هەرچیەکت پێووت دەم و دەست هەمووی وەرگرێت و هیچی بیرنەچێتەوە و هەمووشتێکی زوو بەگوێدا بچێت بەڵکو زۆرجار لێرە ئامۆژگاریی منالێك ئەکەیت لەوێ لەبیری ئەچێتەوە، ئەمڕۆ چەوتیەکی بۆ ڕاست ئەکەیتەوە سبەینێ هەر هەمان چەوتی دووبارە ئەکاتەوە، لەبەرئەوە پێویستە پەروەردەکردن و ئامۆژگاری ئەو منالانە بە شێوەیەکی ئەوتۆبێت کە لەگەڵ ژیانی پڕ ئاهەنگ خۆشی و بەزم و ڕەزمی منالّیا بگونجێ و لە شێوەیەکی وادا پێی بوترێت کە بەو پەڕی هەوەسەوە وەریگرێت و لە خۆشیانا هەر بیلێت و بیلێتەوە تا لە مێشکیا دەق ئەگرێت و لەگەڵ هۆشو بیرئەچەسپێ دەهەر لەسەر ئەم بڕوایەبوو کە ئێمە هاتین ئەو ئامۆژگاریانەمان لە قالبی ئەم شیعرانە داڕشت و هەوڵماندا بە قەدەر توانا لە شیعرەکانماندا گیانی نەتەوایەتی و نیشتمان پەروەرێتی و یەکێتی و خۆشەویستی و دڵپاکی بڵاوکەینەوە جا ئەگەر توانیبێتمان بەم کردەوەیەمان کەمێ خزمەتی منالانی کوردی خۆشەویستمان کردبێ ئەوا زۆر خۆمان بە بەختیار ئەزانین. سوپاسی مامۆستا کەریم سەعید زانستیش ئەکەین کە ئەرکی سەرپەرشتیکردنی لە چاپدانی ئەم نامیلکەیەی گرتە ئەستۆی خۆی.

**عومەر و فەریدون**

**سلێمانی١٥/١١/١٩٥٨**

# کوڕە کوردم

کوڕە کوردم حەوت ساڵم

ووردیلە و ڕوومەت ئاڵم

بۆ تامی خوێندن هاتووم

مامۆستا دەست بە باڵم

من هەنگوینی ناو شانەم

یان بێچوولەی هێلانەم

خوێڕی ناسوڕێمەوە

مەکتەبە ماڵ و لانەم

...

# پەپوولە

ئەی پەپوولەی باڵ نەخشین
شاخ و باخ و کێو نشین
تۆ پۆستەچیی گوڵانی
نامەبەری دڵانی
فریشتەی ڕەنگاوڕەنگی
چاکەکەری بێ دەنگی
بۆیە خۆشەویستمانی
نموونەی مەبەستمانی
...

# سوورە ماسی

سوورەماسیی بەر گەردن زەرد
ئەشلەقێنێ ئاوی بێگەرد
سێ پشەش جوانن بەلەکن
خەریکی فێڵ و کەلەکن
خۆت نوقمکە ماسیە سوورە
پشە چاو برسی و جەسوورە
جوانن خرپنن تووك نەرمن
بەڵام دڵرەق و بێ شەرمن
پشە نەوسن بیت و سەرچڵ
دایم ئەتبوغزێنم بە دڵ

(تێبینی: بەسەر وێنەیەکی رەنگاورەنگدا هەڵدراوە کە بریتییە لە: سێ پشیلەی خرپن خرپن کە بەدیار کاسەیەکی شووشەی پڕئاوەوە هەڵتووتاون و مرخیان لەو سوورەماسیە خۆشکردوە کە لە کاسەکەدا بێترس دێتوئەچێ و لە خۆشیانا ئاوەکە ئەشلەقێنێ.)

- - -

# دیاری

دیاری دەست و دڵمان گوڵە
دەرونمان گەرم و بەکوڵە
دەست و پێمان وەك بلوورە
داوێن پاکین، روومان سوورە
بۆنی گوڵاوی یەك گرتن
ئەمانخاتە بەستە ووتن
بە بەستە خەڵك هوشیارئەکەین
پڕ بە دنیا هاوارئەکەین:
کەسمان ڕوو پەست و مۆن ناوێ
هەرگیز گوڵمان بێبۆن ناوێ
...

# بەستە

بەستەیەکم لەسەر دەمە
پڕ لە ئاهەنگ و زەمزەمە
هەڵقوڵاوی ناخی دڵە
لەرەی ئاونگی ناو گوڵە
ئاوازی شمشاڵی شوانە
خوڕەی قەڵبەزەی کوێستانە
گوێم لێبگرە وابۆت ئەڵێم:
"کوردم، بۆ کورد سەر دائەنێم"
...

# پاڵەوانی دواڕۆژ

ئێوە هەموو برامن
بۆ دواڕۆژم چرامن
ئێوەم گەر لێ دیار نەبێ
ژینم تەنگ و تار ئەبێ
بەڵێ ئێستا منالم
لە بیرو هۆشا کاڵم
دوا ڕۆژ ئەمبینی کاکە:
بۆ(کورد) ڕۆستەمی زاڵم

- - -

# ژووری خوێندن

ژووری خوێندن ڕازاوەیە
دوور لە شەڕو ئاژاوەیە
سەیری ڕوومانکەن، بە جارێ
پێکەنینی لێ ئەبارێ
زیت وووریاو خاوەن هەستین
بە بۆنی زانستی مەستین
جوان و پاك و ژیر و ڕووخۆش
نە شەڕکەرین نە شەڕفرۆش
- - -

# سەیوانی هاروهاج

(سەیوان)* لە مەکتەب بێزار بوو
چەقاوەسوو بوو، زۆر هاربوو
هەر پاش نیوەڕۆی لێئەهات
بە کۆڵانانا هەڵ ئەهات
دارلاستیکێ بە دەستەوە
ڕێی لە ڕێبوار ئەبەستەوە
ڕۆژێ بۆ کۆلارە هەڵدان
خۆی گەیاندبووە سەر سەربان
کەوتە خوارێ بە پشتاو مرد
سەیری دنیای خۆشی نەکرد

*(تێبینی: سەیوان ناوی کوڕێکە، ئەم بەسەرهاتە بەڕاستی یەك دووساڵێك لە مەوبەر ڕوویداوە.)

# بەهار*

ئەوا ئیتر بەهارە
خۆشیی دێهات و شارە
خۆشی لە بولبول و مەل
خۆشی لە شوانی بەرغەل
خۆشی لە گوڵی قەدپاڵ
خۆشی لە منی منداڵ
خۆشی لەم کوردستانە
کە وەك نووری چاومانە
...

---

*(تێبینی: لە سەرەتای بەهاردا بە قوتابیان ئەوترێت.)

# قوتابیی پۆلی یەکەم

لە پۆلی یەکەمینم
گوڵی گەشاوەی ژینم
دوژمنی بوغزو قینم
خەملیوی پێکەنینم
ئەزانی بۆ ڕووخۆشم؟!
بەرگی ڕەوشت ئەپۆشم
ئاوی زانست ئەنۆشم
بۆ کوردان تێئەکۆشم
- - -

## نەوی کاوە

نەوی کاوەی کوردستانم
چقڵی چاوی دوژمنانم
زۆر لە کۆتر دڵپاکترم
لە پاڵەوان بێباکترم
دوانزە سوارەی مەریوانم
بۆتە شانازیی ژیانم
(شاهۆ) و (ئاکۆ) و (ئەزمەڕ)* ی من
تانەن لە سەر چاوی دوژمن
سەرم بەرزە بە نەورۆزم
جەژنی ڕزگاربوونی هۆزم

---

*(تێبینی: "شاهۆ" و "ئاکۆ" و "ئەزمەڕ" ناوی سێ شاخن)

## سەرەتا:

ساڵی ١٩٥٩ لەگەڵ مامۆستا(عومەر عەبدول ڕەحیم)دا کۆمەڵە شیعرێکمان پێکەوە بەناوی(پاڵەوانی دوارۆژ)ەوە بڵاوکردەوە.

ئەم جارەش نیازم هەبوو هەر لەگەڵ کاك عومەر دا بە دووقوڵی بەرهەمێکی تر پێشکەش بە جگەر گۆشە خۆشەویستەکانمان بکەین، بەلام داخی گرانم ئەو بە کۆستی کۆچی(ئازاد)ی جوانەمەرگی کوڕیدا کەوت و منیش دڵم نەیهێنا ڕووی کاری وای لێ بنێم، بەناچاری خۆم تەنیا باڵ ئەم کۆمەڵە شیعرەم وەك دیارییەکی بچکۆلانە پێشکەش مناڵە جوانکیلەکانی نەتەوەکەمان کرد، چوار پێنجێکی ئەم شیعرانە لەجاری پێشووشدا بڵاوکراونەتەوە، بەڵام ئەوانی تریان بۆ یەکەم جارە دەچنە ژێر چاپەوە.

مەبەستیشم لە بڵاوکردنەوەیان هەر ئەوەیە کە لە سەرەتای(پاڵەوانی دوارۆژ)دا ووتراوە.

ئەگەر ئەم شیعرانە شایانی ئەوە بن مناڵی کورد لە بەریان بکات و ئاشنایەتییان لەگەڵدا پەیدا بکات، ئەوە من خۆم زۆر بە بەختیار دەزانم.

# سمۆرە

سمۆرە کلکی زەردە
چاوی جوان و بێگەردە
گوێی قووتە پشتی بۆرە
وورریایە، فێڵی زۆرە
بەدانی تیژ گاز ئەگرێ
ئەتوانێ ئێسقان ببڕێ
ئەی سمۆرەی دارەوان
گوێز زۆر خۆشە بۆ زستان
هی زل زل بشارەوە
بیخە کونی دارەوە

# کارژۆڵە

کارژۆڵەکەم خرپنە
سرك و جوان و جرپنە
زەنگۆڵەی لە گەردنە
زۆر خۆشەویستی منە
فێری قەپاڵ و گازە
تا خوا حەز کا فێڵ بازە
تینووی بوو ئاوی ئەدەم
برسی بوو گیای بۆ ئەکەم
ئەیبەم بۆ لەوەڕی خۆش
پووشی بۆ دێنم بەکۆش
کارژۆڵەی بەهاری ساڵ
دڵی پاکە وەك مناڵ

# میوان

ـ تەق، تەق، تەق، تەق
بۆ بێدەنگی ئەی دەرگای رەق
ـ تەق، تەق، تەق، تەق

ـ کێیە ئەوە؟ دانەخراوە
گەر میوانە لەسەر چاوە
ئەوەی ئێمەین و میوانین
هاورێی سیروان و سۆرانین
دەرسیان گەر نووسیوەتەوە
ئەڕۆین بۆ یاری پێکەوە
ـ ئەی بەخێربێن میوانەکان
ماڵتان پڕ کرد لە گوڵی جوان

دەرس و دەور تەواو بووە
کاتی یاری خۆش هاتووە

خوێندن و ئیش کردن
برای قوتابیی دێهات
من حەز ئەکەم بێم بۆ لات
بزانم چۆن دوای خوێندن
دەست ئەکەی بە ئیش کردن
ئازاو وریاو گورج و گۆڵ
مەڕ ئەبەی بۆ چیاو چۆڵ
ئاو ئەدەی، شەتڵ نێژی
دار دێنی، ئارەق ڕێژی
بەخوێندن و ئیشکردن
چاوی دوژمن کوێرئەبن

# دوکانی قوتابخانە

لەناو مەکتەبا دوکانمانە هەیە
شتی خاوێن و هەرزانمان هەیە
ئێمەی قوتابی، ئەییان فرۆشین
سەری شتەکان باش دائەپۆشین
تا مێش و پیسی نەنیشێ لێیان
ئەگینا ئەوسا سکمان دێتەژان
شتی دوکانی مەکتەب هەرزانە
قازانجەکەشی هەر بۆ خۆمانە
ئێمەی قوتابی ئەبێ مەرج بکەین
کە رۆژانەمان لەوێ خەرج بکەین

# نەوسن

نەوزاد تۆ ئێستا نانت خوارد

لەگەڵ من و هیواو ئازاد

کەچی دیسان نانت ئەوێ

ئاخر ئەمە چۆن وا ئەوێ؟!

ئنجا نۆرەی ئەوەمانە

بڵێن نەوزاد هیچ نەزانە!!

هەر خەریکی نان خواردنە

زۆر چاوچنۆك و نەوسنە

برام واز لەم خووە بێنە

قسەی کاکی خۆت مەشکێنە

# کوێستان

هاوین دەچم بۆ سەیران
دەچمە هەواری کوێستان
کوێستان شوێنێکی بەرزە
ئاوی ساردە وەك تەرزە
لەژێر کەپرو ناو رەشماڵ
بەسەردەبەین ووچانی ساڵ
تا گەرما دەڕوا لە دەشت
من لە کوێستان ئەکەم گەشت
لە دەشتایی و لە کوێستان
وەك بەهەشتە کوردستان

# کتێبی چەند سەرنجێك لە پیرەمێردی شاعیر

لە چاپخانەی (ئیرشاد) لە بەغدا، چاپکراوە، ژمارەی سپاردنی (١٩٢)ی ساڵی ١٩٧١ دراوەتێ، کۆمەڵی ڕۆشنبیری کوردی یارمەتی لە چاپدانی داوە.

# پێشەکی

سەرەتا

بیرکردنەوە لەم نووسینە، ئەگەڕێتەوە بۆ چەند ڕۆژێك پێش بیرەوەرییە بیست ساڵەکەی پیرەمێرد، لە ١٩ی حوزەیرانی ساڵی١٩٧٠دا لە سلێمانی.

ئەو ڕۆژانە بێئەوەی داوام لێبکرێت، هەر لە خۆمەوە حەزمئەکرد کەمنیش لەو بیرەوەرییەدا شتێك بنووسم و بخوێنمەوە، ئەو ئارەزووە ڕایکێشام بۆ ئەوەی شتەبنەڕەتییەکانی ئەم چەند سەرنجە بەشێوەیەکی زۆر کەمتر و کورتتر لە مێشکمدا گەڵاڵە بکەم.

بەڵام لە دوواییدا وەکو لێکمدایەوە، سەیرمکرد لە کۆبونەوەیەکی وەهادا، کە بیرەوەری بیستو سێ ساڵەی لە سێدارەدانی چوار ئەفسەرەکەشی تێکەڵبوو بوو، ئەوانەی ئامادەئەبن، کەمەکێکیان نەبێت ئیتر ئەوانی تر هەموویان، حەز بە ووتار و نووسینێك ئەکەن کە زۆرتر عاتیفەیان بجولێنێ و حەماسەتیان هەڵبسێنێ، نووسینێکی وەکو ئەمە لەوانەیە بێتاقەتیان بکات و پێی وەڕس ببنو لەدوواییدا وەکو پێویست گوێی بۆ شانەکەن، لەبەرئەوە وازم لێ هێناو نەم نووسی.

بەڵام وادیاربوو ئەم چەند سەرنجەم بەرامبەر بە پیرەمێردی شاعیر، بێخی لەوە قایمتربوو کە ئەویش بەتەواویوونی ئەو بیرەوەرییە، تەواوبێت و نەمێنێت بۆیە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زۆرتر و درێژترئەبوون تا توانیان خۆیان بەسەرمدا بسەپێنن و لەم شێوەیەدا بکەونە بەرچاو کە ئێستا لێرەدا ئەیانبینین.

جا ئەگەر توانیبێتم بەمە خوێندەواران نەختێك بە پیرەمێردی شاعیر ئاشناتربکەم و زمان و ئەدەبەکەشمان بەئاستەم خزمەتێك بکەم، ئەوا خۆم زۆر بە بەختیار ئەزانم.

**فەرەیدوون**

١٩٧١/٣/١

# چەند سەرنجێك لە پیرەمێردی شاعیر

پیرەمێردی ئەدیب، شاعیر و نووسەر و رۆژنامەچی بوو زۆرتر بە شاعیر ناسراوە و بەرهەمی شیعریشی زۆرترە، لەبەرئەوە وایبەباشتر ئەزانم کە من لێرەدا لە کلاورۆژنەی شیعرەکانیەوە چەند سەرنجێکی لێبدەم.

## پیرەمێرد هەر پیاوی کوردبووە و کەسی تر

پیرەمێرد پیاوێکی خوێندەوار و دنیادیدەبووە، گەورەپیاوانی(١) زۆردیوە و ئاگاداری رادەی پێشکەوتنی میللەتانبووە. هەمیشە لە سەودای ئەوەدابووە کە کوردیش بگاتە رێزەی ئەو میللەتانەو سەرێکبێ لە ناو سەرانا، لەبەرئەوە هەرشۆرشێك بۆ ئەم ئامانجە لە ناو کوردا بەرپابووبێ و تروسکەیەکی تێدابەدیکردبێت، پێیدا هەڵداوە و دەیەها خۆزگەو هیوای لەسەر بنیات ناوە، هەر شۆرشێکیش سەری نەگرتبێ بە جۆرێك فرمێسکی بۆ رشتوە کە خەلکی پەندی لێوەربگرن و خۆیان کۆبکەنەوە بۆ جارێکیتر. هەر جەژنێك یان یادێکی نەتەوەی بووبێ بوژاندویێتیەوە و شتێکی بۆ وتووە.

سەرنجمداوە هەندێ کەس کە لە پیرەمێرد ئەدوێن ئەوەئەکەن بەژێر لێوەوە کە سەردەمێك بەندوباوێکی دواخرابوو کە گوایە پیاوی ئینگلیزبووە وائەزانم ئەوانە بەشێکیان هەر لە رووی دڵسۆزی و خۆشەویستیێوە بۆ پیرەمێرد لێی بێدەنگئەبن و بەشەکەی تریشیان رەنگە ئێستا پەشیمان بووبنەوە لەو تاوان خستنەپاڵە، دووریش نییە هەندێك هەبن ئێستاش هەر رایان وابێت و بەلام پێیان وابێت کە پێویست ناکات کای کۆن بەبابکەن.

بەلای منەوە ئەم باسە هیچ نەنگییەکی تێدا نیە بۆ پیرەمێرد و هیچ لە شوێن و ناو و ناوبانگیشی کەمناکاتەوە، هەر لەبەرئەوە بوو کە نەك هەر بە پێویستمزانی لێی بدوێم، بەلکو کردمە گوڵدەستەی نووسینەکەشم وەکو پێناسینێك بە لایەنێکی هەتا ئێستا هەر بەدەمی باسکراو لە ژیانی پیرەمێرد.

وەکو لە پێشەوە باسکرا من لە کلاوڕۆژنەی شیعرەکانی پیرەمێردەوە سەرنج ئەدەم و لە ناوەڕۆکی شیعرەکانیدا بەلگە بۆ هەموو سەرنجێکم هەلئەهێنجم.

پێم وایە ئەو سەردەمەی پیرەمێرد کوردایەتیی تێدائەکرد، زۆرکەس هەبوون، بڕوایان وابوو، کە ئەبێ کورد پێشەکی پشت بە دەولەتێکی دەستەلاتدار ببەستێت، ئینجا ئەبێت بەشت(٢)، باپیرەمێردیش یەکێك بووبێت لەوانەی بەوجۆرە بیریانکردۆتەوە، ئەمەناکاتە ئەوەی کە پیاوی ئینگلیز و داشیدامەی دەستیان بووبێت و بۆ مەرامی خۆیان هەلیانسوڕاندبێت.

پیرەمێرد نەك هەر ئینگلیز، بەلکو هەموو ئەو دەولەتانەی کە لە جەنگی جیهانیی دووەما، چوون بەگژ ئەلمانیای نازی و ئیتالیای فاشی و یابانی هیرۆهیتۆدا، بۆیەکە خۆشی ئەویستن کە لە سەرکەوتنیانا فریای کوردیش بکەون و بە ئاشکرا ئەیووت: من لەبەرخۆم خۆشم ناوێنو بۆ دەستکەوتی خۆم ناگەڕێم، مالی دنیام لەلاهیچەو نان و کەبابێك سەروزیادمەو هەمووی پێنج و دوو ڕۆژێکم لە دنیای ڕۆشندا ماوە، بەلکو بۆ ئەوە خۆشمئەوێن، کە لە سایەی سەرکەوتنیانا، کوردیش ببێت بەشتێك(٣)، بۆ ڕاستیی قسەکەشی، ئەوەبوو دووای بڕانەوەی ئەو جەنگە کە کۆماری مەهاباد بە ئاگاداری یەکێتیی سۆڤێت دروستبوو پیرەمێرد وەکو کوردێکی دلسۆز چووە بە پیرێوەو شیعری بۆ وتووە.

سەرنجێکی بە ویژدانانە لەو دوو شیعرەی بۆ دامەزراندن و ڕووخاندنی کۆماری مەهابادیووتووە، ئەمانگەێنێتە ئەو بڕوایەی کە بلێین: پیرەمێرد هەر پیاوی کوردبووە و کەسیتر، چونکە ئاشکرایە کە دامەزراندنی کۆماری مەهاباد، بەئاگاداری یەکێتیی سۆڤێتبوو، کەچی پیرەمێرد شیعرێکی وای بۆ وتووەو وای بۆ هۆنیوەتەوە، ئەلێی خۆی بە خوێنی جگەر هێناوێتە بەرهەم(٤). ئەگەر یەکێك بە خراپ لەو کۆمارەدوابێت، ئەم لێی ڕاپەڕیوە و دەمکوتیکردوە(٥).

ئینجا باشە یەکێك پیاوی ئینگلیز بێت، چۆن بە کۆمارێکدا ئاوها هەلئەدات کە بەئاگاداری یەکێتیی سۆڤێت دامەزرابێ؟!! یان چۆن لە پەلاماردانیا ئاوها لەسەری هەلئەداتێ و بەرپەرچی ئەوانە ئەداتەوە کە پەلاماریانداوە؟!!

دیسان لە ڕووخاندنی ئەو کۆمارەدا، ئەو شیوەنەی ئەو بۆ ئەویکردووە، هیچ کەسێك بۆ هیچ جگەر گۆشەیەکی خۆیناکات(٦)، وەکو شێتی لێهاتبوو، ئەیکێشا بە خۆیداو هەر"ئەی نائومێدی.. و هەی ڕەنجەڕۆیی" ئەوتەوە، کەسی لە خۆی بە بەدبەختتر نەئەزانی و"دەردی مەجنونی لێهاتبووە دی". کە ئەگەر ئەو تاوانەی خستبوویانە پاڵی ڕاستبوایە، ئەشیا لە خۆشیا گەشکە بیگرتایەو زەماوەندی بگێڕایە، وەکو هەموو پیاوانی ئیمپریالزمی ئینگلیزی و جیهانیی ئەو سەردەمە، کە لە ڕووخاندنی ئەو کۆمارەدا، لە"هەرسێلاوە!" شاییان بوو بە ڕیزە.

کە ئەو کۆمارەش ڕووخاو بارزانییەکان مارشە بەناوبانگەکەیان دەستپێکرد و بە زەبری لوولەی تفەنگ، بەناو دوژمنا خۆیان قوتارکرد بۆ یەکێتیی سۆڤێت، پیرەمێرد هاواری لێهەستاو(٧) بە دڵ حەزیئەکرد هەنگاو بە هەنگاو لە گەڵیانا بووایە ئەگەر پیری ڕێگەیبدایە، لام وایە ئەگەر یەکێك پیاوی ئینگلیزبێ، هەرچی چۆنێکبێ، دڵودەروونی ئاوها ناخرۆشێ و شیعری وایبۆنایەت، یان هەر هیچنەبێ، ئاواتەخوازی ئەوە نابێ کە لە ئاوی(ئاراس) بپەڕێتەوەو بچێتە خاکی سۆڤێتەوە!!

# پیرەمێرد مامۆستایەکی پەروەردە و فێرکردن بوو

ئەوانەی شارەزاییان لە پەرەوەردەو فێرکردنی منالآنا هەیە، ئەوە باشئەزانن کە باشترین ڕێگا بۆ چەسپاندنی مەبەستێك لە مێشکی منالآنا، چەند بارەکردنەوەی ئەو مەبەستەیە لە چەند شێوە و شوێنێکا، تا لە مێشکیانا دەفئەگرێت، دیسان هەر ئەو شارەزایانە ئەوەشئەزانن کە وەنەبێت ئەم شێوەی فێرکردنە، هەر بۆ منالآن دەستبدات، بەڵکو بۆ گەورەش ئەشێت بە تایبەتی ئەگەر بمانەوێت مەبەستێکی تایبەتی، یان بیروڕایەکی دەستنیشانکراویان بدەینێ.

ئەتوانین لەم ڕووەوە(پیرەمێرد)یش بە مامۆستایەکی شارەزای پەروەردە و فێرکردن دابنێین، چونکە ئەوەی باشزانیوە کە ئەبێ ئەو بیروباوەڕەی مەبەستێتی لە ناو میللەتە دوواکەوتۆکەیا بلاویبکاتەوە، چەند جارێك و لەچەند قالبێکا وەکو خۆراك بیکات بە دەمیانەوە، ئنجا بۆیان قووت ئەچێت و لە مێشکیانا ئەمەیێت، ئەوەشمان نابێ لەبیربچێت، کە دەربڕینی تەنیا مەبەستێك بە چەند جارو لە چەند شێوەیەکا بە(شیعر)، بەهرەیەکی زلو وەستاییەکی تەواویئەوێت، مەگەر هەر بە بلیمەتێکی وەکو پیرەمێردبکرێت.

وەکو لە شوێنێکی تردا باسمانکرد، پیرەمێرد مەبەستیبوو بە جۆرێك لە شورشە سەرنەگرتووەکانی کوردبدوێت، کە خەڵکی پەندی لێوەربگرن و گوڕببەستنەوە بۆ گوژمێکی تر، پیرەمێرد بە سەلیقەی مامۆستایەکی پەروەردە و فێرکردن، ئەوەی زانیوە کە بە تەنیا جارێك باسکردنی ئەم مەبەستە لە تەنیا شیعرێکا، هیچ دادێك نادات، لەبەرئەوە هاتووە چەند جارێك و لە چەند شێوەیەکا مەبەستەکەی دووبارەکردۆتەوە، تا دڵنیابووە لەوەی کە میللەت تێی گەیشتووە، ئەوەتا ویستویێتی شۆڕشەکەی شێخ سەعیدی پیران کە لە ساڵی١٩٢٥دا بەرپابوو بیرنەچێتەوە، هەموو ساڵێك بیری میللەتی خستۆتەوە(٨)، سەرەتای شیعرێکی ئەڵێ:

**ئەم ئاسمانە شینە کەوا بەرگی ماتەمە**

**تەحلیلی واکراوە کە قوببەی غەم و تەمە**

**سەرەتای شیعری ساڵێکی تری ئەڵێ:**

**هاتن شەهیدەکان بە جلی سووری خوێنەوە**

**دایکی وەتەن دە هەڵسە سڵاویان بسێنەوە**

**دیسان جارێکی تر هەر بۆ ئەو شۆڕشە ئەڵێ:**

**گوڵاڵە بە ڕەنگ سوور ئەکاتەوە**

**وەك من داغدارە لە بنیاتەوە**

**لە جورعەی شەونم خوێن ئەخواتەوە**

**شەهیدەکانم بیرئەخاتەوە**

**لەساڵێکی تردا دیسان هەر بۆ ئەو مەبەستە ئەڵێ:**

**ئەو جەژنەی میللەت تێداکەساسە**

**من سەرم شینەو بەرگم پەلاسە**

جگەلەمە نموونەی تریش هەیە بۆ ئەوەی بیسەلمێنن کە پیرەمێرد ویستوێتی مەبەستی خۆی بە چەندجار لێدوانی ئەو مەبەستە لە دلۆدەرونی میللەتا دەق پێبگرێت.

پیرەمێرد مەبەستی بوو کە(نەورۆز)ی جەژنی نەتەوەیی کورد، ببوژێتەوەو شانازی پێوەبکرێت و کوردەوارییەکە بە جەژنێکی گرنگی خۆیانی بزانن. لەبەرئەوە هاتووە لە نەورۆزدا ئاهەنگی گێڕاوە و شیعری بۆ وتووەو لەسەری نووسیوە، کە لەم ڕێگەیەوە توانی تا رادەیەکی زۆرئەو مەبەستەی بهێنێتەدی و کاربکاتە سەر میللەت، ئەوەتا ئێستاش ئەوانەی لەو سەردەمەدا لەگەڵ ئەودا ژیاون، لە هەموو ناوهێنانێکی پیرەمێردا نەورۆز و لە هەموو نەورۆزێکدا پیرەمێردیان دێتەوە یاد، نەك هەرئەوە، ئەتوانم بڵێم کە ئەو شیعرانەی ئەو بۆ نەورۆزی وتوون، کەرەسەیەکی باشن بۆ دلۆدەروون پێئاودانی لاوانی ئێستاو نەوەی داهاتووش.

ساڵێکیان لە نەورۆزدا وتوویەتی:

**مژدە بێت ساڵ گەڕایەوە**

**ئاگری نەورۆز کرایەوە**

**بەفری زستان توایەوە**

**گیاو گوڵ و دڵ ژیایەوە**

**لە نەورۆزی ساڵێکی تردا ئەڵێ:**

**ڕۆژی تازەی ساڵی تازەی ئێمەهات**

**ڕۆژهەڵات، ڕۆژی هەڵات، سەرما هەڵات**

**بەسروودیش بۆ قوتابییانی وتووە:**

**جەژن و بەهار گوڵ و گوڵزار**

**زۆر بە نەشئەدار**

**بولبول لەسەر گوڵ دەخوێنێ**

**دنیا زیندەگی ئەنوێنێ**

دووا شیعری بۆ نەورۆز، ئەوەی نەورۆزی ساڵی(١٩٤٨)ە کە لە هەموویان بەناوبانگترەو ئەڵێ:

**ئەم ڕۆژی ساڵی تازەیە نەورۆزە هاتەوە(٩)**

**جەژنێکی کۆنی کوردە بەخۆشی و بەهاتەوە**

پیرەمێرد بڕوای وابوو کە چاپەمەنی، بە تایبەتی ڕۆژنامەو گۆڤار، دەورێکی گرنگ ئەگێڕن لە خڕکردنەوەی میللەت و ئاڕاستەکردنیان بەرەو ڕزگاری و پێشکەوتن، هات خۆی بە ڕۆژنامەگەرێتییەوە خەریککردو(ژیان) و ئینجا(ژین)ی دەرکرد، هەر بەوە وازی نەهێنا لە هەر لایەکی تریشەوە ڕۆژنامەیەك یان گۆڤارێك دەربچوایە، ئەم وەکو گوڵ لە خۆشیدا ئەگەشایەوە، هانیئەدا و پشتیئەگرت، لەسەری ئەنووسی و شیعری

پێدا هەڵئەدا بۆ ئەوەی لە میللەتی بگەیەنێت، کە چاپەمەنی کارێکی گرنگە و بوونی گەلێك پێویستە بۆ ڕاپەڕین و هۆشیارکردنەوەی نەتەوە.

لەم ڕووەوە ئێمە لەو نووسینانەی نادوێین کە جاروبار بەم نیازە ئەینووسی، چونکە وەکو وتمان ئێمە لێرەدا تەنیا لە پیرەمێردی شاعیر ئەدوێین بۆیە بۆ نموونە تەنیا دوو وێنەی ئەو شیعرانە ئەهێنینەوە، کە هەموو ساڵێك لەگەڵ دەرچوونی ژمارەیەکی ساڵێکی نوێی گۆڤاری گەلاوێژدا، لە وتارێکا کە تێهەڵکێشبوو لە نووسین و شیعر، ئەکرا بە وتاری یەکەم و ژمارەیەکی ئەو ساڵەی پێئەڕازێنرایەوە، کەلەم ڕێگەیەوە پیرەمێرد بە سەلیقەی مامۆستایەکی هونەرمەندی پەروەردە و فێرکردن، ئەیوویست بە چەند بارەکردنەوەی ئەو باسە بیروڕای خۆی بەرامبەر بە سوودی چاپەمەنی و پێویستیی بوونی بلاّوبکاتەوە. کە گۆڤاری گەلاوێژ پێی خستە ساڵی پێنجەوە، پیرەمێرد ئەم شیعرانەی لە نووسینێکا بۆ تێهەڵکێش کردبوو:

**گەلاوێژ پێنج ساڵانە**
**(چرا)ی شای (عەودالاّن)ە**
**ڕووناکی (ڕەشماڵان)ە**
**(بیبیلە)ی چاو کاڵانە**
**تاڵانە، هەی تاڵانە.**

**گەلاوێژەکەی سەر چیای سوورکێو**
**خوا بتپارێزێ لە عفریت و دێو**
**(ژین) و (ژیان)ت دوو شەهابی نوور**
**(تیرئەنداز)ی تۆن لە نزیك و دوور**
**گیانی، پیرەمێرد نگهبانت بێ**
**(ژین) و (ژیان)ی بە قوربانت بێ**

کە گەلاوێژ پێی خستە ساڵی نۆوە پیرەمێرد وتی:

گەلاوێژ ساڵی نۆیە
پایەی لە گەلوی نوێیە
چەرخی تەرازووی(کۆ)یە
ڕووناکیی سەر ئاسۆیە
وەك کورد دڵپاکە بۆیە
وەك گوڵ بەرەنگ و بۆیە
تامی (حەڵواگەزۆ)یە
بۆ مندالآن (نۆنۆ) یە
داسی دروێنەی سوێیە
بەردی موچەی مەڵویە
خوایە پەنای بە تۆیە

# پیرەمێرد هونەرمەندبوو لە وەرگێڕانا

وتراوە کە وەرگێڕان هونەرە، ئەمە ڕاستە، چونکە هەر زمانە خاسیەتێکی تایبەتیی خۆی هەیەو بۆ دەربڕین جۆرە وشەو ڕستەیەکی هەیە، کە لە زمانێکی تردا ئەبێ بگەڕێیت بۆ وشەو ڕستەی ئەوتۆ کە بەرامبەری پڕ بە پڕ بوەستێتەوە، کە ئەمەش کارێکی یەکجار ورد و ئەرکێکی یەکجار گرانە، سەلیقەیەکی ناسك و بەهرەیەکی زل و وەستاییەکی تەواو و شارەزاییەکی زۆری ئەوێ، وەکوو هەموو هونەرێکی تر.

وەرگێڕانی سەرکەوتوو بەوە ئەڵێن کە تام و چێژ و مانای نووسینە یەکەمەکەی تا ڕادەیەکی زۆر بزرنەکردبێت، ئەمەش هەروا بەدەم خۆشە، چونکە تەنانەت هەندێك لەوانەش کە خۆیان نووسین وەرئەگێڕن، هاواریان لە دەست ئەوەیە ئەڵێن: نووسینی وەرگێڕاو ڕۆحیشی بکەیت بە بەردا ناگاتە نووسینە یەکەمەکە.

ئەگەر لەم گۆشەیەوە سەیری ئەو شیعرانە(١٠) بکەین کە پیرەمێرد وەریگێڕاونەتە سەر شێوەی نووسینی ئێستا، بۆمان دەرئەکەوێت کە لەم مەیدانەشا گرەوی هونەری بردۆتەوە.

پیرەمێرد کە شیعرەکانی مەولەویی وەرگێڕاوە، ئەوەندە چۆتە ناویانەوەو لەگەڵیاندا تواوەتەوە، وەرگێڕاوەکانی خۆی ناوناوە(ڕۆح)، بەامبەر بە(ئەسڵ)ەکانی مەولەوی، لەمەشدا هیچ لەخۆباییبوونێکی پیرەمێردی تێدا نییە، چونکە من خۆم ماوەیەك لەو(هەورامان)ەدا ژیاوم و هەر بە خولیای ئەدەب و شیعرەوە، ئەو پرسیارەم لە خوێندەوارەکانیان کردووە، کە ئایا وەریگێڕاوەکانی پیرەمێرد تا چ ڕادەیەك لە شیعرەکانی مەولەوییەوە نزیکن واناوی لێناون(ڕۆح)؟!. لە وەڵامدا وتوویانە:

ناهەقی نییە وای ناو لێنابن، چونکە ئەوی ڕاستی بێت هەر چەندە ناتوانین بڵێین هەموو وەرگێڕاوەکانی پیرەمێرد ئەگەنە(ئەسڵ)ەکەی مەولەوی، بەڵام لە زۆر شوێندا خۆیان لەوانەی ئەو ئەدەن، تەنانەت هەندێکیان، ئەوەندە پێی لێهەڵئەبڕن ئەڵێن: لە

شیعری(گلەیی بەختی ڕەشی خۆم ئەکرد)دا، هینەکەی پیرەمێرد بە هێزترە لەوەکەی مەولەوی(١١).

بۆ ئەوەی نموونەیەکی وەرگێڕانی پیرەمێرد لە(هەورامی)یەوە پیشانبدەین، جارێ سەیرێکی ئەم شیعرەی(مەولەوی)بکەن کە ئەڵێ:

**دووریت دیارەن چەند ساحێب نێشەن**

**تۆی دەروون وەخار نێشێوتر ڕێشەن**

**هەرچی بوینوون شێوەی تۆ پێشەن**

**دڵ وەهەتیتەی حەسرەتدا کێشەن**

**هەر ماهێ ئەوبوو حاڵەم پەشێوەن**

**چون هیلال شێوەی ئەبرۆی تۆش پێوەن**

ئینجا سەیری وەرگێڕانەکەی پیرەمێردبکەن:

**دووریت دیارە چەند ساحێب ئێیشە**

**بە دەردێکیتر تۆی دڵەم ڕێشە**

**هەرچی ئەبینم تۆی تیا دەنوینێ**

**سەرلەنوێ دڵەم دادەخورپێنێ**

**کە مانگی نوێم دی(گەشکە)مە تەواو**

**هیلال برۆی تۆم دێنێتە بەرچاو**

ئەمە چەند دێڕێکی مەولانا خالدە بە فارسی، کە لە دووروڵاتیدا بە یادی نیشتمانەوە وتوویە:

**خون شد دلم نسیم صبا غمگسار شو(١٢)**

**بر دشت شهرزور دمی رهگذار شو**

**برفت انکه ما بعیش در آن بوم بگذریم**

**زنهار تو وکیل من دلفگار شو**

**غم بر دلم نشست چو گدرون ز داغ هجر**

**ای جشمسار چشم تو هم سرچنار شو**

وا ئەزانم لەوەرگێرانیدا، پیرەمێرد هیچ تام و سۆزێکی لێکەم نەکردۆتەوە ئەگەر لێی زیاد نەکردبێت، ئەوەش نابێت لە یادبکەین، کە گۆڕینی شیعر بۆ شیعر، زۆر گرانترە لە گۆڕینی شیعر بۆ نووسین.

با بزانین چۆنی وەرگێڕاوە:

**دڵبوو بە خوێن شەماڵ وەرە تۆ بۆم بخۆمشوور(١٣)**

**توخوا لە باتی من بگەرە دەشتی شارەزوور**

**جێیە نەما کە ئێمە بە خۆشی تێدا بژین**

**تۆ پەیکی گیانی من بەلەوێدا بە جێنشین**

**دڵبوو بە کێوی پیرەمەگروون بەئاهی زار**

**چاو چاوگەیەکە بۆم بۆتە ئاوی سەرچنار**

شیعرێکی فارسی هەیە ئەڵێ:

**رنج گل بلبل کشیدو عطر گلرا باد برد(١٤)**

**بیستون را عشق کندو شهرتش فرهاد برد**

پیرەمێرد بەشی دووەمی ئەم دێڕەی وەرگێڕاوە و کردوێتی بە دێڕێك، ئنجا هەر لە پاڵ ئەودا بەبۆنەی ناوهێنانی(فەرهاد)ەوە دێڕێکی تری خۆی خستۆتەسەر(١٥)، بەمانایەك تر، کە ئەیخوێنیتەوە هەست بەوەناکەیت کە لە باسەکەی چۆتە دەرەوە و شیعرەکەت ئەوەندەی تر جوانتر و بە سۆزتر دێتەبەرچاو و گوێی دڵ. ئەمەش وەرگێڕاوەکەی بەشی دووەمی دێڕە فارسییەکەو دێڕەکەی خۆیەتی:

بێستوون(١٦) بە عەشق لە بن کەنراوە

**شۆرەتی شۆری بۆ فەرهاد ماوە**

**ئەڵێن(فەرهاد)یش کوردە، بەجێیە**

**ڕەنجەڕۆی وەك ئەو کوردنەبێ، کێیە؟!**

دیسانەوە سەیرێکی ئەم دێڕە(فارسی)یە بکەن

**عشقم چنان گداخت کە موران تربتم(١٧)**

**عضوی نیافتند کە ناخن بر او کنند**

ئینجا بزانن پیرەمێرد هەر بە شیعر چۆنی وەرگێڕاوە و چ ڕۆحێکی کردووە بە بەردا، لام وایە ئەگەر خاوەنی شیعرەکە خۆی بە کوردی بیووتایە، لەمە جوانتری نەئەووت:

**عەشق وای توانوومەوە بەشی مێروولەکانی گۆڕ**

**ئێسکێ نەمابوو کە چنگێکی لێگیربکەن بە زۆر**

# پیرەمێرد و پەندی پێشینان

پەندی پێشینان سامانێکی نەتەوایەتیی ئەوتۆیە، کە لە مۆزەخانەی میللیدا ئەبێت ئەوەندە لە شوێنێکی باش و قایمدا دابنرێت، کە دووربێت لە هەموو دەستکاری و یاریپێکردنێکەوە.

پەندی پێشینان، میراتێکە لە باو و باپیرانەوە ماوەتەوە بۆ ئێستاو داهاتوو، زۆرجار یەکێك کەویستی باری سەرنجێك دەرببڕێت و بەڵگەیەکی بەهێز بۆ ئەو باری سەرنجەی بهێنێتەوە، بۆ ئەوەی بەرامبەرەکەی پێ دەمکوت بکات، پەنا ئەباتە بەر پەندێکی پێشینان و وەکو تاقیکردنەوەیەك کە چەند و چوونی لەسەر نەبێت، یان وەکو تیورێك پەندەکەی ئەدا بە بندەستا، بەرامبەرەکەشی ناتوانێت پەندەکە بە تەواوی بخاتە پشتگوێ و بایەخینەداتێ.

جا کە پەندی پێشینان ئەمەبێت و ئەمەندە بە چاوی ڕێزەوە سەیربکرێت، خەڵکی ناهەقیان نییە کە لە گلێنەی چاویان خۆشتربوویێت و نەیەڵن یاری پێبکرێت و دەستی بۆببرێت، کەچی کاتێك کە پیرەمێرد دەستی بۆ بردووە و وەکو هەویرێك هەڵیشێلاوە، کەس ئەو دەست بۆ بردنەی پێ ناخۆشنەبووە، چونکە ئەم نەهاتووە ئەو پەندانە بشێوێنێ و ناشرینیان بکات، بەڵکو هاتووە لە بەرگێکی رازاوەی(شیعر)دا جارێکی تر زۆر بە ئەسپایی و لەسەرخۆ، لەبەردەمی میللەتا دایناوەتەوە، بە شێوەیەك کە بریقەدارتر و شیرینتر بووە لەبەر چاویان، هەر لەبەرئەمەش بووە شاعیران و نووسەران نەك ڕەخنە لە پیرەمێردبگرن لەسەر ئەو دەستکارییەی، بەڵکو ئافەرینیانکردووە و هەر کەسێکیش بەدوور بەنزیك باسی پیرەمێردی کردبێت، ئەموستێکی بۆ ئەم کارە گرنگەی ڕاکێشاوە(١٧)، هەندێکیشیان لەوەزیاتر ڕۆیشتوون و بڕوایان وابووە کە پیرەمێرد بەوکارەی گیانێکی نەمریکردووە بەبەر باو و باپیراندا(١٨).

ئەوەندە شانازی بۆ پیرەمێرد بەسە کە توانیویتی دەست بۆ گەنجینەیەکی ئەوەندە بە نرخ ببات، بینەخشێنێ و بیڕازێنێتەوە، کە ڕەنگە ئەگەر یەکێکی تر ئەو دەستەی بۆ بردایە تێکیبدایەو بیژاکانایە.

وا بۆ نموونە چەند پەندێکی پێشینان ئەهێنینەوە، ئینجا لە تەنیشتییەوە ئەو پەندە ئەنووسین، کە پیرەمێرد کردویتی بە شیعر.

"هەموو شت لە باریکی ئەپچڕێت، مێرد لە قایمی"

هەرچی کە تەنگ بێ دیارە زوو ئەدڕێ

ئینسان ئەستوور بێ ئەوسا ئەپچڕێ

"خوا ڕاستەو ڕاستی لێ خۆش دێ"

چونکە خوا ڕاستەو ڕاستی خۆشئەوێ

داری ڕاست بە لای چەوتا نانەوێ

"کوێر تا ئەمرێت بە تەمای چاوە"

کوێر تاکو دەمرێ بە هیوای چاوە

لیستەی یانسیب زۆری نەماوە

"بەڕە لە لای تەنکییەوە ئەدڕێ"

بیستوومە وردە مەئمور دەرئەکرێ

بەڕە هەر لەلای تەنکی ئەدڕێ

"شوێن کڵاوی بابردوو کەوتووە"

منیش کە عومرم ڕۆیی و بەسەرچووم

وا شوێن کڵاوی بابردوو کەوتووم

# یاریکردن بە وشەی کوردی لای پیرەمێرد

کە شیعرەکانی(نالی)م ئەخوێندەوە و دوو وشەم ئەبینی کە بە(شێوە) لە یەك نزیكو بە(مانا(١٨) لە یەك دوورن، با یەکێکیان کوردی بێت و ئەوی تریان کوردیش نەبێت(١٩))، هەر بە وردەکاری و وەستاییم ئەزانی، چونکە ئەو یاری بە وشەکردنە خەیاڵێکی ناسکو لێکدانەوەیەکی قوڵی ئەوێ.

نالی وشەی(منورە)ی عەرەبی و دوو وشەی(منە، وەرە)ی کوردیی بەم جۆرە تەك یەك خستوون لە قافیەدا:

**ئەی ساکنی ریاضی مەدینەی(منورە)**

**لوتفی بکە بفەرموو مەدینەی منە وەرە**

دیسانەوە هەر(نالی) وشەی(لبیب)ەی عەرەبی و دوو وشەی(لەبی، بە)ی کوردی ئەئاوها لە دێرێکا خستوونە پاڵ یەك:

**نالی لەبی حەبیبە هەم طیبە هەم طبیبە**

**خۆلاسەو (لبیب)ە، فەرمانبەری (لەبی، بە)**

ویستم لە شیعرەکانی پیرەمێردا بۆ ئەم بابەتە بگەڕێم، سەیرئەکەم نەك هەر لە شوێنێك و دووان، بەڵکو لە زۆر شوێنا ئەم یاریکردن و هێنان و بردنەی بەو وشانە هەیە کە بە شێوە لەیەك نزیك و بەمانا دوورن.

ئەگەر ئەوە بزانین کە ئەم جۆرە وشانە مل بۆ هەموو کەس نادەن و هەروا بە ئاسانی پاڵیەك ناخرێن لە رستەدا یان ریزناکرێن لە قافیەدا، ئەوسا هونەری پیرەمێردمان بۆ دەرئەکەوت، کە چۆن توانیویێتی ئەو وشە سەرکێشانە رام بکات و چۆن سەری پێدانەواندوون، بە شێوەیەك تەك یەکی خستوون، کە لە خوێندنەوەدا وائەزانیت کە بە پێی خۆیان هاتوونەتە ئەو شوێنانەوەو هەر ئەبێت لەوێشدابن.

نابێت ئەوەشمان لە بیر بچێت کە پیرەمێرد ئەو وشە بەشێوە لە یەك نزیك و بەمانا دوورانەی هەر لە زمانی کوردیدا دۆزیوەتەوە، کە ئەمە شارەزایی لە زمانەکەدا

دەرئەخات. بۆ نموونە چەند وشەیەك لەو بابەتە ئەخەینە بەرچاو، بزانن پیرەمێرد چۆن یارییەکی پێکردوون و چۆن وەکو ئەمووستیلە کردوونیە پەنجەی خۆیەوە(١٩).

**(هاتەوە) و(بەهاتەوە)**
**ئەم ڕۆژی ساڵی تازمیە نەورۆزە هاتەوە**
**جەژنێکی کۆنی کوردە بە خۆشی و بەهاتەوە**
**(کە، با، بێ) و(کەبابێ)**
**مایەی ژیانی ئێمە کە، با، بێ**
**بۆنەی گۆڕمەوە من بە(کەبابێ)**
**(پەڵ) و (پەل)**
**لقی شۆڕی درەخت میوەی ئەخۆن بێئەرکی بەردودار**
**پەڵی بەرد بۆ پەلی بەرزە، لەقەیشە بۆ لقی بەردار**
**(بابی، با) و (با، بیبا)**
**چرا ڕووناکی بۆ ژێر نییە ڕەحمەت لە بابی، با**
**ئەوی ڕووناکی کەچ بینایە گۆڕە ڕمنجی با، بیبا**
**(هی من) و (هێمن)**
**بابە: توخوا با ئەم بەرخە هی من بێ**
**وای لێ ئەکەم قۆچ لێ نەداو هێمن بێ**

# پیرەمێرد و قافیەی شیعر

قافیەی چاك، ئەوەیە كە لەگەڵ وشەو ڕستەكانی شیعرەكەدا سفت و چەسپاو و گونجاوبێ لەلایەك و لە لایەكی تریشەوە، لەگەڵ ئەو وشەیەدا كە ئەم بە قافیە بۆی هاتۆتەوە، هەتا زۆرتر حەرفیان لەیەك بچێت، شیعرەكە مۆسیقادارتر و ئاهەنگدارترئەكات بەواتە هونەری قافیەی بەجێهێنابێ.

ئەگەر شاعیر بتوانێ بۆ(قافیە) وشەیەك بهێنێتەوە، كە گوێگر بە دەلیلی ئەو وشەیەدا كە ئەم بە قافیە بۆی هاتۆتەوە، زوو خەیاڵی بۆی نەچێت، واتە قافیەیەكی چاوەڕواننەكراوبێ، خێراتر و قوڵتر كارئەكاتە گوێگرو جلوە و جوڵەو گەرم و گوڕییەكی سەیری ئەداتێ، بەڵام ئەگەر لەو وشانەبێ كە ئەم پێشەكی خەیاڵی بۆی بچێت و چاوەڕوانی بكات وەكو بایەك بەلای گوێیدا دێتو ئەڕوات، نە ئەیبزوێنێ و نەئەیهەژێنێ، ئینجا كە شیعرواى لێهات، لە شیعر ئەچێتە دەرەوە و ئەبێت بەقسەی ئاسایی.

لەبەر ڕۆشنایی ئەم قسانەدا، بانەختێ لە قافیەی شیعری پیرەمێرد وورد بینەوە و بۆ ئەوەی زووتر قافیە سوارەكانی پیرەمێردمان بۆ دەركەوێ، باشتروایە، كەجارێ لەپێشدا یەكدوو شیعری قافیە لاوازی یەكدوو شاعیری تر پیشانبدەم، چونكە ئەزانم كە جوانێك باشتر جوانییەكەی دەرئەكەوێت، ئەگەر لای ناشیرینێكەوە ڕابگیرێت.

شاعیرێك لە باسی بۆیاخچییەكدا ئەڵێ:

**بەزبانی عەرەب پێی وتم(تصبغ)**

**پێم وت بەخەندە: (ای والله یصبغ)**

**دیسانەوە هەر ئەوشاعیرە لە شیعرێكی تردا ئەڵێ:**

**(غصبا علیكم) خۆراكم ئەوێ!**

**جلوبەرگ و زێڕ نیشانم ئەوێ**

شاعرێكی تر ئەڵێ:

**شا فەرمووی بۆچی تۆ برات هەیە**

**وتی خاوەنم دوو برام هەیە**

**کاتێك پیچراوەی کردو شاهەنشا**

**خشتی ئاڵتونی بینی سەرسام!!**

**منیش وا شوکری یەزدانم بۆ بوو**

**لە سامانی شا هیچم بۆ نەبوو(٢٠)**

شیعر و هەموو بەشەکانی تری ئەدەب، کە بێهێز و بێپێزبوون، خراپییەکەیان هەر ئەوە نییە کە هەستێکی ساردوسڕئەدەن بە خەڵکی و لەشیان پێداهێزرێت، بەڵکو مەترسییەکە لەوەدایە کە خەڵکەکە بە خوێندنەوەی ئەو جۆرە ئەدەبە، وردە وردە زمانەکەیان لە بەرچاوئەکەوێت و سووك دێتە بەرچاویان کە کاریش گەیشتە ئەوە مەترسیەکی گەورەتر چاوەڕوانی نەتەوەکە ئەکات، چونکە یەکێك لە کۆڵەکە هەرە ئەستوورەکانی کە نەتەوەیەك ڕائەگرێت، زمانە.

بە پێچەوانەوە ئەدەبی بەپێز و بەلەزەت، زمان لای کەسانی میللەت خۆشەویست ئەکات و ڕۆژ بە ڕۆژ هۆگری ئەبنو شانازیی پێوەئەکەن، من زۆرجار گوێم لێبووە کە یەکێك گوێی لە شیعرێکی باشی(گۆران) یان(پیرەمێرد) یان(هەردی) یان(هێمنی موکریانی) بووە، بە قوربانی ئەو زمانەشبووە کە ئەو شیعرەی پێووتراوە، دیارە ئەم بە قوربانبوون و شانازییە، ئۆتۆماتیکی ئەبێتە بەقوربانبوون و شانازی بە میللەتەکەوە، کە ئەمە یەکێکەلەو هۆیانەی کە ئەوترێت شاعیر و ئەدیب، لە ڕێگەی خزمەتی زمانەوە خزمەتی گەورەی نەتەوەئەکەن.

دوای ئەوەی چەند نموونەیەکی قافیەی شیعرتان لای یەکدوو شاعیردی، چاکوایە ئنجا چەند نموونەیەکی قافیەی شیعری پیرەمێردتان پیشانبدەم، هەر بە نیازی ئەوە کە بزانن چ دەستێکی باڵایبووە لەم مەیدانەدا لەلایەك و لەلایەکی تریشەوە بۆ ئەوەی ئەو چەند دێڕەی لە سەرەتای ئەم باسەوە لەسەر قافیەی چاك وترا، باشتر ڕوونبێتەوە.

لە(بانگی بەیان)دا ئەڵێ:

**تەختی تەخت بووبوو، بابا ئەردەڵان**

**کەلاوەی کاول، پەیکولْ، بەردەلاْن**

لە(بەهاری کەنارشار)دا ئەلْیْ:

**ئەو ئاوەجوانە، لەو دەشتەویْلە**

**چاوی قرژانگی لە چاوا لیْلە**

لە(ناورەزان)دا ئەلْیْ:

**هیْشووی مرواری گەردنی بەرزی**

**بە بای غروری شۆخی ئەلەرزی**

ئەوەشمان نابیْ لەبیربچیْ، کە سەرکەوتنی پیرەمیْرد لە هیْنانەوەی ئەو جۆرە قافیە بەهیْز و باشانەدا، بۆ شیعرەکانی نیشانەی ئەوەیە کە شاعیریْکی کوردیزان بووە.

# پیرەمێرد شاعیرێکی کوردی زان بوو

وەکو چۆن هەموو عەرەبێك عەرەبیزان و هەموو فەرەنسییەك فەرەنسیزان نییە، هەروەها هەموو کوردێکیش کوردیزان نییە، با زمانی کوردی وەکو ئەوانە خزمەتیش نەکرابێت، ڕەنگە هەر لەبەرئەو خزمەتنەکردنەش بێت، کە زۆرکەس هەتا ئێستاش وەکو پێویست بایەخ نادەن بە کوردیزانین، بەڵام بێگومان ڕۆژێك دێت کە کوردی زان لەلای کوردێك، وەکو فەرەنسی زان لەلای فەرەنسییەك و ئینگلیزی زان لای ئینگلیزێك سەیربکرێت. لەمەوبەر لە دووسێ شوێنا ئیشارەتێکی بچوکمان بۆ کوردیزانینی پیرەمێردکرد، یەکەم لە باسی وشەی(پار)دا لە شیعری نەورۆزی ساڵی١٩٤٨و دووەم لە باسی یاریکردنی بەو وشانەی کە بەشێوە لەیەك نزیك و بەمانا دوورن و سێیەم لەسەرکەوتنیا لە هێنانەوەی قافیەی چاك و سواردابوو.

بەڵام ئایا هەر ئەو دوو سێ نیشانەیە هەیە بۆ کوردی زانینی پیرەمێرد!؟ بێگومان نەء، چونکە ئەگەر شیعرەکانی هونەری شیعری لێبکەینە دەرەوە و تەنیا لە ڕووی زمانەوە سەیربکەین، ئەبینین کە بەرامبەر نیمچە فەرهەنگێکی زمانی کوردی وەستاوین، ئەو وشە دانیسقەو ناوازانەی لای ئەو ئەیبینین، زۆر بەدیاری، شارەزایی لە زمانەکەمانا دەرئەخات.

لە شیعری(بەیتی ترێ)دا ناوی(سیو چوار) جۆرە ترێو لە(ناو گوڵان)دا ناوی(چل و نۆ) جۆرە گوڵ و لە(بەهاری کەنار شار)دا ناوی(سی و نۆ) جۆرە گوڵەکێوی و گیا کێویلەو سەوزەی بردووە، کە ئەمە ئەگەر لە ڕووی دەوڵەمەندی زمانەوە لە وشەد سەیری بکەین سامانێکی بەنرخە.

من خۆم زۆرجار لەگەڵ ئەوانەدا کە باخەترێیان هەیە، یان لەگەڵ ئەوانەدا کە بەهاران بە پێدەشت و کێوەکانەوە گیائەکەن، یان هاوینان بە کوێستانەکانەوە وێڵی لەوەرگای ماڵاتیاتن، دانیشتووم ناوی ترێ یا گوڵە کێویلەو گیا کێویلەم لێپرسیون، ئەوەندەی زانیویانە وتوویانە، لەدووایدا ئەو شیعرانەی پیرەمێردم بۆ خوێندونەتەوە،

کە ئەو ناوانەی تێدایە سەرێکیان بەسەر سورماوییەوە باداوە و وتویانە: ئێمە ئەوەندەی ئەوی لێنازانین!!

پیرەمێرد سەرنجی وردی داوەتە وشەی کوردی و زۆر وردیکردۆتەوە، هەندێجار سەیری وشەیەکی کردووە، زانیویێتی هەر تەنیا ئەو وشەیە بە چەند مانایەکدێت، کە ویستوویەتی بە کاریبهێنێت لە شیعردا ئەوەندە شارەزایانە بە کاریهێناوە بۆ ئەو مانا جیاوازانە، کە لە خوێندنەوەدا زۆر بە ئاسانی مانا جیاوازەکەی هەست پێبکرێت، بۆ وێنە لە وشەی(وێنە) وردببنەوە لەم دوو دێڕەدا.

**ئەنالّم ئەلّێم تۆ وەك ئاوێنەی**

**بۆ شوێن دەستکردی کردگار (وێنە)ی**

**بۆچ پێم نانوێنی (وێنە)ی فۆتۆغراف**

**(وێنە)ی شیرینی نازدارانی جاف**

ئەو شیعرانەی پیرەمێرد بۆ ئێلی(جاف)ی وتوون، ئەوەندە کوردییەکەی خۆماڵییە، کە ئەیان خوێنیتەوە یەکسەر ئەتخەنە ناو کۆچ و باری جافەوە و بە گوێ ئاوی(سیروان)دا ئەتهێنن تا ئەتبەنە(دووئاوان) و(زەڵم) و ئینجا سەرەو ژوورت ئەکەنەوە بۆ(نەکەرۆز) و کوێستانەکانی تریان، کە ئەگەر پیرەمێرد نەناسیت، هەزار سوێند ئەخوێت  کە هەر جافێکی پەتیبووە، یان هەر هیچ نەبێ هەموو تەمەنی لە ناویانا بردۆتە سەرو خێڵوخوار و خێڵوژووری لە تەکداکردوون.

لەو شیعری(بەیتی ترێ)یەدا، جگە لە جۆری(ترێ) کە لە شوێنێکی تردا باسمانکرد، باسی سوودەکەشی کردووە و وشەی وای بەکارهێناوە، وا ئەزانی بە درێژایی ژیانی لە ناو(ڕەز ومێو)دا بووە.

لە شیعری(بابە سەیری ئەم بەرخە کە چەند جوانە)دا، کە لە بەروبووم و سوودی مەڕئەدوێت، وا ئەزانی دەوڵەتەکەی(٢١) لە یەکدوو هەزار سەرمەڕ کەمترنەبووە، چونکە ئەو  ناوانەی ئەو هەتی ئەدات بۆ بەروبووم و سوودی مەڕ، مەگەر هەر ئەوانە بیزانن کە مەڕدارن.

لەبەر ئەوەی پیرەمێرد خوێندەوارێکی شارەزاو دڵسۆزی زمانی کوردی بووە، زمانەکەی خۆشویستووەو لەلای نەنگبووە کە زۆربەی خەڵکی لە ڕووی نەخوێندەواری و کزی هەستی نەتەوایەتییانەوە، کەوتبنە ژێر باری پروپاگەندەی ناحەزانەوە و زمانی کوردییان بە هیچ و پووچ و بێتاموبۆ زانیبێ، لەبەرئەوە هەر دوابەدوای گەڕانەوەی لە تورکیاوە بۆ کوردستان(٢٢)، دەستیکرد بە کۆشش بۆ لابردنی ئەو پەردەیە لەسەرچاوی خەڵکی و ئەیویست تێیانبگەیەنێت کە زمانی کوردی، زمانێکی خۆش و تەڕ و پاراوە، نەك هەر ئەوەندە بەڵکو(بێ هاوتا)شە(٢٣)، ئەگەر خزمەتبکرێت و گەشەی پێبدرێ، حەزی ئەکرد مامۆستایانی قوتابخانەش ئەوە لە قوتابییەکانیان بگەیەنن، بۆیە بەو مەبەستە سروودی بۆ ئەووتن.

وەکو وتمان ئەگەر لە ڕووی زمانەوە لە شیعرەکانی(٢٤) پیرەمێرد وردبینەوە، نیمچە فەرهەنگێکە بۆ خۆی و هەتا تێی بڕوانین پێویستی بە شیکردنەوە و لێدوانە، لەبەرئەوە لەم نووسینەدا کە تەنیا(چەند سەرنجێکە لە پیرەمێردی شاعیر)، هەر ئەوەندە ئەلوێت، لەم کوردیزانە زرنگە بدوێین.

## شیعری بە ڕواڵەت ئاسان(٢٥) لە شیعرەکانی پیرەمێردا

ئەم جۆرە شیعرانە، ئەوانەن کە ئاسان و ڕەوان و بێگرێ و گۆڵ دیارن، سۆزی گەرم و تەزوی خۆش و موچڕك بەلەشدائەهێنن، دیارە کە ئەم شیعرانە وابن با بە ڕواڵەتیش ئاسانبن، بەڵام نایەنە بەرقامکی هەموو کەسێك و لەگەڵ ئاسانییانا بە ئاسانی دەستیان لێگیرنابێ و خۆیان بە زوویی نادەن بەدەستەوە.

ئەم جۆرە شیعرە قەریحەیەکی تەڕو پاراو و سەلیقەیەکی تایبەتیی ئەوێت، لەبەرئەوە ئەبینین ئەو شاعیرەی لە بنەڕەتا ئەو دوو بەهرە سروشتىیەی هەیە کە ئەو جۆرە شیعرە ئەڵێ، زۆر بەئاسانی دێت بەدەستىیەوە و وەکو کانیاوێك لە سەرچاوەی دڵییەوە ڕوون و لەسەرخۆ هەڵئەقوڵێ، کەچی لای شاعیرێکی تر کە ئەو دوو بەهرە سروشتیەی لەبنەڕەتا پێنەبێ، مانئەگرێ و خۆینادا بەدەستەوە، ئەگەر ئەو شاعیرە هەر زۆری لە خۆیکردو شیعرێکی وت، شیعرەکەی وەکو کانیاوێك دەستی تێداگێڕابێ لیخن و لێڵئەنوێنێ، شیعرێك دەرئەچێ بێدەنگ و سەنگ و ئەبینێ هەر وشەیەکی لە عاستی خۆی ملیناوە بە لاوەو مرداربۆتەوە.

ئەم جۆرە شیعرە لە زمانی عەرەبیشدا وێنەی زۆرە، وەکو وتمان پێی ئەڵێن: (سەهلی مومتەنع)، مەبەستیشیان هەر ئەوەیە کە ئێمەلەم بارەیەوە لێکماندایەوە، شاعیری زۆریشیان هەیە کە بەم جۆرە شیعرە بەناوبانگن، بۆ وێنە وەکوو(مسلم بن الولید) و(العباس ابن الاحنف) و (ایلیا ابو ماضی) و (نزار قەبانی) و هەندێك لە شیعرەکانی(ئەحمەد شەوقی).

شیعرەکانی پیرەمێرد(تاکە تاکە)(٢٦) یان نەبێ، ئیتر ئەوانی تریان زۆری بابەتی ئەو شیعرە بە ڕواڵەت ئاسانانەن و خۆشی حەزیکردووە لەم بابەتە بڵێ و ڕای وابووە کە ئەم جۆرە شیعرانە بە کۆت و قەیدی شیعری یەك قافیەوە ڕەخنەدار ئەبێ(٢٧).

پیرەمێرد ئەیتوانی شیعرەکانی وابڵێ کە زۆر بیرکردنەوەو هەڵسەنگاندنی بوێ، تا بە پێوانەی زۆر لە شیعردۆستانی ئەو سەردەمە، بە گرنگ و بایەخدار بێتە بەرچاو، بەڵام وەکو لە شوێنێکی تردا وتمان ئەم خاوەنی بیروباوەڕێ بوو کە ئەیویست بگاتە

میللەتی کورد، بە شێوەیەکیش ئەیویست ئەو بیروباوەڕەیان لەناوا بڵاوبکاتەوە کە بە ئاسانی تێی بگەن، لەبەر ئەوە وازی لە شیعری یەك قافیە هێنا(٢٨)، چونکە ئەیزانی لە شیعری یەك قافیەدا، نە ئەوەی ئەو مەبەستێتی هەمووی ئەوترێت و نە خەڵکەکەش بە ئاسانی تێی ئەگەن، لەم ڕووەوە(گۆران)ی شاعیری گەورە و بە ناوبانگ، لە وتارێکدا بۆ چلەی پیرەمێرد، ڕوویدەمی تێئەکاو پێی ئەڵێ: (بە(٢٩) پێچەوانەی ئەو هەستی حورمەتەوە بەرامبەر(نالی) لە دڵتابوو، دەستت بۆ قەڵەمی ئەو نەبرد، چونکە ئەو وەستایەکی بەهرەداربوو، بەڵام لەسەر تانوپۆی ئەدەب و عروزی بێگانە نەخشی ئەچنی، تەنیا چینی بەرزی خوێندەواری سەردەمی دەرەبەگێتی ئەیتوانی تێی بگات، هەرچی تۆ بوویت ئەگەڕایت کاڵایەك دابنێیت بە تەواوی خۆماڵی بێت و بەرز و نزمی کوردزبان بتوانن تێی بگەن).

وترا کە زۆربەی شیعرەکانی پیرەمێرد بابەتی ئەم شیعرە بە ڕواڵەت ئاسانانەن، لەگەڵ ئەوەشدا ڕاستتر وایە کە چەند وێنەیەکیان پیشان بدەین، بۆ ئەوەی بزانین ئەو قسانەی لەم بارەیەوەکران تا چ ڕادەیەك شیعرەکانی پیرەمێردیان لەتەکداجووت ئەبێ:

لە(ئای نائومێدی)دا ئەڵێ:

**ئەم ساڵ بەهارمان کە بێبارانە**

**گوڵاڵەی سوورمان جەرگی یارانە**

لە(وەفدی کوردستان)دا ئەڵێ:

**کورد نابڕێتەوە، خەیاڵی خاوە**

**بەراتی نەجات بە خوێن نووسراوە**

**من ڕەنگی سوورم بۆیە خۆش ئەوێ**

**مژدەی شەفەقی لێدەرئەکەوێ**

لە(دووئاوانەکە)دا ئەڵێ:

**دوو ئاوانەکەی شوێن ماڵە گەورە**

**سەرەوخوار ئەڕۆی بە پێچودەورە**

**تۆ بە ڕووناکی وێنەی بلوری**

**ئاوی زیندەگی گشت شارەزووری**

هەتا ئەڵێ:

**توخوا ئاوەکەی بۆن گوڵاوەکە**

**بۆ سەرچاوەکە، کەمێ لاوەکە**

**بڕوانم ئاخۆ جامی فۆتۆغراف**

**پیشانم نادات شێوەی ئێلی جاف؟!**

# پیرەمێرد لە شیعری(وەسف)یشدا لە کۆمەڵایەتی و کوردایەتی ئەدوێ

پیرەمێرد بۆ ناتەواوی کۆمەڵایەتی یان بۆ کوردایەتی شیعری زۆری وتووە، ئەوانە بەجێی خۆیان من لێرەدا نامەوێ لەوانە بدوێم، بەڵکو ئەمەوێ سەرنج لەوە بدەم کە پیرەمێرد ئەوەندە هونەرمەندبووە، کە هەندێجار لە شیعرێکی(وەسف)دا، لە کاتێکدا کە خۆی مەستی(وەسف)ەکەی بووەو ئێمەشی لەگەڵ خۆیا مەستکردووە، لە پڕێکا بازێك ئەدا بۆ دەرخستنی ناتەواوییەکی کۆمەڵایەتی و تێهەڵکێشی ئەکا لەگەڵ شیعرەکەدا و یەکسەر ئەگەڕێتەوە بۆ سەرباسەکەی خۆی، بێ ئەوەی بهێڵێ زنجیرەی خەیاڵی خۆی و ئێمە تێکبچێت، ئەمەش مەگەر هەر لە دەست خۆیبێ، چونکە ئەوی ڕاستیبێ، بازی وەها بەو خێراییەوە گەڕانەوە لە چاوتروکانێکا بۆ شوێن پێی یەکەم بێئەوەی تاوێکی باریکی خەیاڵی بپسێ کارێکە وێنەی کەمە.

بۆ ئەوەی مەبەستی سەرەوەم باشتر بخەمە بەرچاو، نموونەیەك لەم بابەتە شیعرەی پیرەمێرد ئەهێنمەوە:

ڕەنگە زۆرمان وەسفە بەناوبانگەکەی(بەفربارینی سلێمانی)ی پیرەمێردمان خوێندبێتەوە، ڕەنگە هەندێکیشمان ئەگەر هەموویمان لەبەرنەبێ، چەند بەیتێکیمان هەر لەبەربێ.

جارێ با لە سەرەتاوە ئەو خەیاڵە خۆشەی ئەو وەسفە ناسکە لە پیرەمێرد تێکنەدەین و گوێی لێبگرین کە ئەڵێ:

**سبەینێ بوو لە خەو هەستام کە ڕوانیم بەفرە باریوە**

**سلێمانی ئەڵێی بەڵقیسە تارای زیوی پۆشیوە**

**دەمێ بوو چاوەڕێی بەفرێکی وابووم مژدەبێ باری**

**سەرم بەفرە، کەچی هێشتا شەڕە تۆپەڵمە بۆ یاری**

**لە بیرمە شێرە بەفرینەم ئەکرد سواری ئەبووم بێ زین**

**نسێبوو جێگەکەی، ئەیبەست، ئەما تاکو دەمی هاوین**

**بە بەرگی سپییەوە چەند شۆخە شاخی گۆیژە بیبینە**

**لە ڕەنگی ئاسمان دولبەرترە، ئەو سپییە، ئەم شینە**

ئایا بە خەیاڵدێ لە ناوەڕاستی ئەم(وەسف)ە تەلیسماوییەوە، یەکسەر پیرەمێرد بازبدا بۆ باسکردنی ناتەواوی کۆمەڵایەتی و گلەیی لەوەبکات چۆن لە ڕووی خۆشبڕوایی و سوودوەرنەگرتن لە تاقیکردنەوەکانمانەوە، زۆرجار تەفرە ئەخۆین و لە خشتە ئەبرێین:

**ئەڵێن بەرگی فریشتەی ئاسمانیش سپییە وەك بەفرە**

**فریشتەی ئێمە بالایە"بەلام ئاخ بۆچ ئەخۆین تەفرە"؟!**

یان وەکو لەگەڵ هەموو پێچە کلووی بەفرێکا فریشتەیەك هاتۆتە ناومانەوە، کە نیشانەی ئاشتی و دۆستایەتییە، ئەشیا وەکو برا وابووینایە و موو بە بەینمانا نەچوایە، کەچی بەداخەوە خەریکی ئاشووب و هەڵڵاین و دوژمن بە یەکترین:

**هەموو پێچە کلووی بەفرێك فریشتەی خوای لەگەڵڵایە(٣٠)**

**فریشتە کەوتە ناومان بۆیە وائاشووب و هەڵڵایە**

ئنجا بێئەوەی خەیاڵی خۆی و ئێمە پەرتببێ لەپڕ ئەگەڕێتەوە سەر وەسفەکەی خۆی و لەسەر باڵی خەیاڵ لە(گۆیژە)وە ئەچێت بۆ(گڵەزەردە)و تیشکی هەتاوی بەسەر بەفری ئەوێدا وەکو(ئەڵماسی خواکرد)دێتە بەرچاو:

**ئەوا سامالی کرد، ڕۆژ کەوتە سەر شاخی گڵەزەردە**

**بەسەر ئەو بەفرەدا تیشکی هەتاو ئەڵماسی خواکردە.**

لەشیعری(پیرەمێرد لە ناو گوڵان)دا، بە پەنجەی خەیاڵ ئەو گوڵانە ئەگرێت و سەیریان ئەکات، تا تێرتێر بۆنیان ئەکاو بەو بۆنە مەست ئەبێ، وائەزانی ئیتر هیچی بیرنەماوە و هیچی لە خەیالا نییە گوڵی جوان و باخی ڕازاوەنەبێ، بۆ هەر گوڵە وەسفێك ئەدۆزێتەوە کە وەك کالایەك وابێ بە بالای:

**(گوڵە بەڕۆژە) عاشقی تەواوە**

**ئەسووڕێتەوە ڕووی لە هەتاوە**

**(وەنەوشە)ی سەرشین لە شوێن هەواران**

**گەردن کەچی خەم دووری نزاران**

**(لاولاو) عاشقی نەوبەر نەمامان**

**تێوە دەئاڵێ سەرتا بەدامان**

تۆ کە ئەم وەسفانە ئەخوێنیتەوە، وائەزانی مەستی گوڵانەو هیچی تر، کەچی دواکەوتنی قەومەکەی وەك شوولێکی تەڕ بەر ئەو خەیاڵە خۆشەی ئەکەوێو هەنیسکی حەسرەت بەربینی ئەگرێ و ئەڵێ:

**ئەمانە ئەڕوێن لە خاکەکەمان(٣١)**

**کەچی قەومەکەم لە پایەی کەمان**

پیرەمێرد ئامانجی بووە کە جوانی پێشکەوتنی کورد و کوردستان لە هەموو سەرێکەوە شانبدا لە جوانی و ڕازەوەیی سروشت لە کوردستانا، نەوەك سروشت جوان بێت و قەومیش دواکەوتوو، چونکە هەقە سروشتێکی جوان و دڵڕفێن میللەتێکی پێشکەوتوو و خۆش گوزەرانی لە ناوا بژی و هەر کاتێك جوانی سروشت و جوانی شارستانێتی لە کوردستانا لە یەکیدا ئەوکاتە هەنیسکی پیرەمێرد ئەبێتە زەردەخەنە(٣٢).

لە شیعرێکی یەك قافیەدا وەسفی خۆشەویستیی خۆی ئەکا بەرامبەر دولبەر و ئەڵێ:

**بەڕووپۆشینی تۆ، ڕۆژم شەوەزەنگێکە تیروتار**

**وەکو تاوس کە هەوری دی، ئەناڵێنێ بەگریەوزار**

دوای ئەوە حەوت دێڕیتر ئەڵێ، لە هەر دێڕیانا وا ئەزانی بە ئاگری عەشق سووتاوە، وات لێئەکا بەزەییت پێدابێتەوە، کەچی لەپڕ لە دێڕی هەشتەما دێڕێك ئەڵێ، کە هەموو ئەو خەیاڵەی پێشووی هەڵئەتەکێنێ و ئەڵێ شیعر و نەشیدمان هەر بۆ وەتەنبێ باشە چونکە دیارە یەکێکەلەو هۆیانەی کە پاڵ بە میللەتەوەئەنێن بەرەو خۆکۆکردنەوە و ڕزگاری.

**ئەمانە شیعری مۆدەی کۆنە وەك من پیربووە ئێستا**

**نەشیدت دۆ وەتەن بێ باشە، بەڵکو پێی ببێ ڕزگار**

# ئەفسانەی میللی لە شیعری پیرەمێردا

پیرەمێرد ئەوەی زانیوە کە ئەفسانەی کوردی وەکو هەموو ئەفسانەی میللەتانی تر نرخێکی تایبەتیی خۆی هەیە و ئەبێ بایەخی پێبدرێ لە ئەدەبا، بە داخەوە- لە ڕووی نەزانینەوە — هەتا ئێستاش هەندێ هەن بە چاوی بایەخ سەیری ئەفسانە میللییەکانمان ناکەن و نازانن کە میللەتێکی وەکو(یۆنان) کە خاوەنی مێژوویەکی زیندووە و زۆر بە چاوی ڕێزەوە لەلایەن خۆیان و میللەتانی تریشەوە سەیری ڕابوردووی کۆنیان ئەکرێ و ئافەرین لە ئەدەب و پێشکەوتنی ئەو ڕۆژانەیان ئەکرێ، یەکێك لە شانازییەکانی کە ئێستاش خۆیانی پێوە بائەدەن لە ئەدەبا، ئەفسانەکانیانە.

پیرەمێرد ئەوەندەی پێی کرابێ، ویستوویەتی لە چوارچێوەی شیعرەکانیدا، ئەو ئەفسانە میللییانە بپارێزێ و ئێمە کە ئەیان خوێنینەوە هەست بەوەئەکەین کە بۆن و بەرامێکی تایبەتییان کردووە بەسەر شیعرەکانیداو خۆماڵی تری کردوون.

پیرەمێرد ئەڵێ:

**بەدەست پیرییەوە کۆکە کۆکمە**

**خوازبێنی بەفر و هەڵەکۆکمە**

دیسان ئەڵێ

**هاتووە خۆی پیشان هەڵەکۆك ئەدا**

**جاڕی ریسوایی کۆکەکۆك ئەدا**

ئەمە ئەو ئەفسانە میللیەیە کە ئەڵێ:

گوایا لەوپەڕی ڕۆژانی سەختی زستانا کە بەفر ئەیبەستێ و بە سەختی و سارد و سۆڵەییدا وەکو لاوێکی بە دەماخ خۆی ئەنوێنێ کە لە هەرەتی هێز و گوڕیابێ، لەم کاتەدا ئەنێرێ بۆ خوازبێنی(هەڵەکوك)، ئەمیش ئەڵێ: من ئێستا یاڵ و پۆپم پێوەنییەو شووناکەم.

زستان لە تەواوبوونا ئەبێ هەڵەکۆك پاڵوپۆپ پەیدائەکاو وەکو پرچی کیژۆڵە بە شانەکانیا دێتەخوارەوە، جوان ئەبێ و هەڵئەدا، ئینجا ئەم ئەنێرێتەوە بۆ لای بەفر، ئەڵێ ئەگەر ئێستا بنێرێ بۆ خوازبێنیم شووی پێئەکەم.

بەفریش ئەو هێزو گوڕەی جارانی نەماوە، مناڵێکی پچکۆلانە پێیەکی بەسەردابنێ ئەتوێتەوە و ئەبێ بە ئاو، لەبەرئەوە بەم جۆرە وەڵامی ئەداتەوە و ئەڵێ: هەڵەکۆکە پرچنێ، چیمە لە ماڵ و ژنێ، ئەوسا لە سەران دیاری بووم، کێلانەو خەنجەر مرواری بووم، ئێستا چوڕچوڕم کەوتە بنێ، چیمە لە ماڵ و ژنێ.

پیرەمێرد ئەڵێ:

**وەك دەروێشەکەی گۆلی زرێبار**

**کەوڵ و پۆستی خۆم کێشابووە کەنار**

ئەم بەیتە ئەموست ڕاکێشانە بۆ ئەفسانەی(دەروێشەکەی گۆلی زرێبار) کە بەم جۆرەیە(٣٣):

گوایا جێگای زرێباری ئێستا شارێکی گەورەبووە، ئەم شارە فەرمانڕەوایەکی زۆر بەدو زۆرداری بووە، بەردەستەکانی سزای ماڵ و ژنی ئەم دەروێشەیان داوە بە جۆرێکی وا کە بەریخستووە، مام دەروێش چووە بۆ لای فەرمانڕەوا بۆ سکالاً، ئەویش بە دەروێشی وتووە: مام دەروێش بڕۆ ڕائەسپێرم کە سکی ژنەکەت پڕبکەنەوە، تەنانەت کەرەکەشت ئاووس بکەن ئیتر مردووت مرێ چیت ئەوێ؟!! دەروێشیش بەدڵێشکاو ئەگەڕێتەوە و بەسوجدەدائەکەوێ و دەست ئەکا بەنزا لە فەرمانڕەوا، خوای گەورەش دەریای ڤینی دێتە جۆش و ئەو شارە نغرۆئەکاو بە فەرمانڕەواو بەردەستەکانییەوە ئەبا بە ناخی زەویا و ئەبێ بەم زرێبارە، ئینجا دەروێش سەر بەرزئەکاتەوە و دەست ئەهێنێ بە ڕیشیاو سوپاسی خوائەکاو داوای ئەوەئەکا کە هەر لەوێدا خوا گیانی لێوەربگرێتەوە، ئێستا لە گوێ زرێبارا دار و شەخسێ هەیە، گوایا ئەوە ئارامگای مام دەروێشە.

پیرەمێرد ئەڵێ:

**کە پیرێژن سەروپۆیلەی بە شینی چلە تێک ئالاّ**

**بەهار یەت، داری پیر ئەژێتەوە، دێتە قەد و بالاّ**

لێرەدا شاعیر مەبەستی ئەفسانەکەی(چلە و پیرێژن) کە ئەمەیە:

گوایا پیرێژن خوشك یان دایکی چلەی زستانە، کە چلە بڕایەوە، دوای ئەوە سەرمای پیرێژن پەیدائەبێ، لەم سەرمایەدا وارێك ئەکەوێ بەفر و تەرزەلوکەو باران پێکەوە دێنە خوارەوە، ئینجا لەم کاتەدا ئەڵێن وا پیرێژن لە شیوەنی چلەدا سەر و پۆیلانەکەی خۆی پچڕییەوە و لە خۆی ئەدا.

# چیرۆکی ئاینی لە شیعری پیرەمێردا

پیرەمێرد هەندێ چیرۆکی کوردی بە شیعر وتووە بە شێوەیەکی خۆش و ڕەوان، من لێرەدا مەبەستم ئەوانە نییە.

دیسانەوە هەندێ شیعری ئاینیشی وتووە کە بریتییە لە خوا پاڕانەوە و نزاکردن، مەبەستم ئەوانیش نییە.

ئەوەی من مەبەستمە لێی بدوێم، ئیشارەتکردنی پیرەمێردە بۆ هەندێ چیرۆکی قورئانی پیرۆز لە شیعرەکانیدا.

پیرەمێرد خۆی خوێندەوارییەکی ئاینی تەواوی هەبوو(٣٤)، لەبەرئەوە شتێکی ئاسایی‌یە کە ئەم جۆرە خوێندەوارییە لای ئەو ببێ بە کەرەسە بۆ هەندێك شیعری، هەروەها خوێندەواران و شیعردۆستانی ئەو سەردەمەش زۆربەی زۆریان هەر ئەو خوێندەوارییە ئاینی‌یەیان هەبووە، لەبەرئەوە بە ئاسانی تێی گەیشتوون و زیاتر لە خوێندەوارانی ئێستا کاری تێکردوون وپتر چێژیان لێوەرگرتووە.

بەلام لەبەرئەوەی زۆری خوێندەوارانی ئێستا گران لەم جۆرە شیعرانەئەگەن، لە هێنانەوەیانا بە نموونە پێویست بە گێڕانەوەی چیرۆکەکان و شیکردنەوەیان ئەکات.

ئەمەوێ ئەوەش بلێم کە وەنەبێ ئەم جۆرە چیرۆکە ئاینییانە لە شیعرەکانی پیرەمێردا، خۆی لە خۆیا هونەرێکی تایبەتی بێ، یان لایەنێکی تایبەتیی تێدابێ کە پێویستی بە لێکۆڵینەوە و سەرنجدانبێ، بەلام لەبەر ئەو هۆیەی لە سەرەوە باسکرا، لاموابێ گێڕانەوەی چیرۆکەکان و شیکردنەوەی چەند نموونەیەکی شیعری ئەم بابەتە بێسوودنەبێ و ڕەنگە بتوانم بەمە کارێك بکەم کە خوێندەوارانی ئەم سەردەمەش، تاڕادەیەك بتوانن چێژلەم جۆرە شیعرانەشی وەربگرن.

پیرەمێرد ئەلێ:

**(یونس)ت لە ناو سکی ماسیدا(٣٥)**

**ژیان و چرای لقای خۆت پێدا**

ئەمە ئەو چیرۆکەیە کە ئەڵێ:

خوای(٣٦) مەزن حەزرەتی یونسی کردە پێغەمبەر و هات لە ناو خەڵکەکەدا بانگی خواپەرستیدا، بەڵام بە گوێیان نەکرد، یونس هەڕەشەی بە تۆڵە لێسەندنی خوا لێکردن، سوودی نەبوو، خۆی زۆر پێوە خەریك نەکردن، سەری خۆی هەلگرت و لێیدا ڕۆی.

دوای ئەم دنیابووە تەم و مژ و خەریکبوو ژێرەوزەبەربێ، خەڵکەکە زارەترك بوون، ترسان و لەخواپاڕانەوە، خوا بەخشینی و بڕوایان هێنا.

لەولاوە(یونس) ملی ڕێگای گرتووە و ئەڕوا، هەر ڕویشت هەر ڕۆیشت تا گەیشتە نزیکی دەریا، کۆمەڵێکی دی سواری کەشتیبوون، لەگەڵ خۆیانا سواریانکرد، ئەوەندەی پێنەچوو هەوا گۆڕاو گەرداو هەڵیکرد، ناچاربوون باری کەشتێکە سووك بکەن تا نوقم نەبێ، (های بەخت) یان(٣٦) لەسەرئەوە کرد کەکێ خۆی فڕێ بداتە ئاوەکەوە تا کەشتێکە سووك ببێ، چەند جارێك لەسەریەك هەر(یونس) بەرئەکەوت، ئەمیش زانی کە ئەمە ئیرادەی خوایەو لەبەرئەوەیە کە زۆر خۆی بە خەڵکەکەوە خەریك نەکرد هەتا بیانهێنێتە سەر ڕێی ڕاست، لە بەر ئەوە هیچ لێی نەوەستاو خۆی هەڵدایە ئاوەکەوە، خوا فەرمانیدا بە نەهەنگ(٣٧) کە هەرقووتیبدا بەڵام ئازاری نەداو نەی خوات، یونس لە سکی نەهەنگەکەدا دەستیکرد بە لەخواپاڕانەوە(٣٨)، خوای گەورە بەزەیی پێداهاتەوە فەرمانیدا بە نەهەنگ کە بهێنێتە کەناری دەریاو بە ئەسپایی دایبنێ، ئنجا ڕووەکێکی(یقطین)ی(٣٩) بۆ ڕەخسان: کەلێی بخوات تاپێی بژی ئنجا فەرمانی بە یونس کرد کە بگەڕێتەوە ناو قەومەکەی، کە گەڕایەوە سەیریکرد هەموو بڕوایان هێناوە(٤٠).

پیرەمێرد ئەڵێ:

**موسا (ارنی)ی وت کەوتە تکا(٤١)**

**بە (لن ترانی) ئابڕووی تکا**

مەبەستی چیرۆکەکەی حەزرەتی موسایە کە ئەمەیە:

بۆ ئەوەی(٤٢) خوای گەورە بەرنامەیەك بدا بە موسا كە لەسەری بڕوات، داوای لێكرد كە خۆی پاك بكاتەوەو بەڕۆژووببێ و بێتە كێوی(توور). كەچووە ئەوێ خوا قسەی لەگەڵداكرد و بەقسەزۆر دڵی دایەوە و لاوانیەوە، بەمە موسا بە خۆیا ڕاپەڕموو كە بە خوا بڵێ خۆتم پیشانبدە، ئەویش فەرمووی كەنامبینیت، بەڵام سەیری ئەو چیایەی بەرامبەرت بكە هەر كاتێك وەستا ئەوسا ئەمبینی. موسا كە ڕوانییە چیاكە سەیریكرد هەر هەڵبەز و دابەزئەكاو جێبەخۆی ناگرێ، موسا بەمە ترساو بێهۆشكەوت، خوابەزەیی پێداهاتەوە، كە هاتەوە سەرخۆی دەستیكرد بە پاڕانەوە(٤٢).

پیرەمێرد ئەڵێ:

**مەڵێن تۆ نەوسنی، باوكم بە نانێ جەننەتی دۆڕان(٤٣)**

**من ئەو نانە كەبابیشی لەگەڵبوو، دڵمی هەڵسوران**

مەبەستی چیرۆكەكەی(ئادەم)ە كە بە كورتی ئەمەیە:

خوای گەورە ئادەمی دروستكرد و فەرمانی بە فریشتەكاندا كرنووشی بۆ ببەن، هەموویان بۆیان برد شەیتان نەبێت. خوا ئادەم و ژنەكەی(٤٤) خستە بەهەشتەوە و ئامۆژگاریكردن كە شەیتان لە خشتەیان نەبا، درەختێكی پیشاندان و فەرمووی هەر ئەو درەختە نزیكمەبنەوە و لێی مەخۆن ئیتر بۆ خۆتان چیئەكەن بیكەن.

شەیتان ئەمەی زۆر پیناخۆشبوو، چووە بن كلێشەیانەوە و وای لێكردن كە لە درەختەكە نزیكبنەوە، بەوەشەوە نەوەستان لێشیانخوارد.

خوا لەمە زۆر لێیان پەستبوو، ئیتر تۆبەیان كرد و زۆر كروزانەوە لە خوا كە بیانبەخشێ، خوای مەزن بەخشینی و ناردنی بۆ سەر زەوی بۆ ئەوەی تا ماوەیەك لەناویا بخۆن و بژین(٤٥).

## دووا وشە(٤٦)

تا ئێرە دووایی بەم نووسینەم لەسەر پیرەمێردی شاعیر ئەهێنم، لەو ڕووەوە کە ئەم نووسینەم بە(چەند سەرنجێك لە پیرەمێردی شاعیر) داناوە خۆم بە ڕاست ئەزانم، چونکە لێکۆڵینەوە لە پیرەمێردی شاعیر و وردکردنەوەی لە هەموو ڕوویەکەوە، پێویستی بە شیکردنەوەیەکی باش و سۆراخێکی زۆر هەیە. ئەوەندە هەیە ئەگەر ئەم نووسینەی من هەر نەختێکیش ڕێگا خۆشکەربێ بۆ تێگەیشتن لە پیرەمێردی شاعیر و خوێندەوارانی نزیکتر کردبێتەوە لێی، لەوانەیە بۆم هەبێ نەختێ خۆم بە سەرکەوتوو بزانم لە نووسینیا.

ئەوەندە سەربەرزی بۆ پیرەمێرد بەسە کە ئەگەر خوێندەواران و ئەدیبان و ئەدەب دۆستانی کورد لەم ڕۆژەدا، لە هیچ شتێکا هەموویان یەکڕایان نەبێ و وەکو یەکنەلێن، لەوەدا وەکو یەکئەلێن و یەکیتییان دەرئەکەوێ کە پیرەمێرد شاعیرێکی زۆر گەورەی کوردە و ئەبێ شوێنێکی تایبەتی و دیاری لە مێژووی ئەدەبی کوردیا بۆ تەرخان بکرێ.

ویستم بە یەك دوو دێڕ ئافەرینێ لە پیرەمێردبکەم ئەم نووسینەی پێ دووایی بێنم، سەیرمکرد هەرچییەك بڵێم، هەر بە تۆزی پێی ئەو ئافەرینەداناگات کە(گۆران) کردوێتی و ئەڵێ:"گردی یارە(٤٦) بۆ شانازی نەکا؟ ئێستا بووە بە مەیدانی پەیکەری دوو ڕەمزی پاڵەوانی نەتەوەکەمان(٤٧)".

## ناوی کتێب و سەرچاوەکان

أ- كوردی:

١- ڕۆژنامەی(ژیان) و(ژین).

٢- موحەمەد ڕەسوڵ هاوار، پیرەمێردی نەمر، بەغدا، ١٩٧٠.

٣- کاکەی فەللاح، مەولەوی، وەرگێڕانی پیرەمێرد، بەغدا،١٩٦٨.

٤- مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس دیوانی مەولەوی بەغدا،١٩٦١.

٥- کاکەی فەلاح، لە پەندەکانی پیرەمێرد، بەغدا، ١٩٦٩.

٦- عەلائەدین سجادی، یادی پیرەمێرد، بەغدا،١٩٥١.

٧- م - ب - رودنکو- مەم و زینی ئەحمەدی خانی، مۆسکۆ، ١٩٦٢.

٨- گۆڤاری گەلاوێژ.

٩- دەفتەری کوردەواری.

١٠- ڕۆژنامەی هاوکاری.

١١- پیرەمێرد، کەمانچە ژەن، بەرگی یەکەم، سلێمانی، ١٩٤١.

١٢- پیرەمێرد، کەمانچەژەن، بەرگی دووەم، سلێمانی، ١٩٤٧.

١٣- دوکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ، ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی، بەغدا١٩٧٠.

١٤- دیوانە کوردییە چاپکراوەکان.

١٥- پیرەمێرد، مەم و زین، چاپی دووەم، سلێمانی، ١٩٦٨.

١٦- پیرەمێرد، دوانزە سوارەی مەریوان، سلێمانی، ١٩٣٥.

ب - عەرەبی:

١- محمد جميل سلطان، صريع الغواني دراسة اخباره واشعاره، دمشق، ١٩٣٢م -١٣٥١ه.

٢- عاتكة الخزرجي، ديوان العباس بن الاحنف، القاهرة، ١٣٧٣ه -١٩٥٤م.

٣- الفرد خوري، ايليا أبو ماضي شاعر الجمال و التفاؤل و التساؤل، بيروت، ١٩٦٨.

٤- ايليا أبو ماضي، الجداول، نيويورك، ١٩٢٧.

٥ـ ايليا أبو ماضي، الخمائل، مصر.

٦ـ نازك سابايارد، أحمد شوقي لحن المجتمع و الوطن، بيروت، ١٩٦٨.

٧ـ أحمد شوقي، الشوقيات، ٤ أجزاء، مصر، ١٩٣٠.

٨ـ دواوين نزار قباني و كراساته الشعرية.

٩ـ محمد أحمد جاد المولى و محمد أبو الفضل و علي محمد البجاوي والسيد شحاتة قصص من القرآن، الطبعة الخامسة. القاهرة.

١٠ـ الدكتور عزالدين مصطفى رسول، الواقعية في الادب الكردي، بيروت، ١٩٦٧.

١١ـ لويس معلوف، المتجد في اللغة، الطبعة الثامنة عشرة، بيروت، ١٩٦٥.

ج ـ فارسى:

١ـ دكتور محمد معين، برهان قاطع، ٥ جلد، چاپ دوم، تهران، ١٣٤٢ خورشيدى- ١٩٦٣ زاينى.

٢ـ دكتر خليل خطيب رهبر گلستان ٣ بخش.

٣ـ محمد قزوينى و دكتور قاسم غنى، ديوان خواجه شمس الدين محمد حافظ شيرازي تهران ١٣٢٠ه . شمسي.

٤ـ مؤسسة مطبوعاتى امير كبير ديوان حافظ تهران، ١٣٣٤ خورشيدي.

د ـ ئینگلیزی:

١. Toufiq Wahby and G.J. Edmondis - Kurdish - English Dictionary - London. ١٩٦٠.

## پەراوێزەکان:

١ـ موحەمەد رەسوڵ هاوار، پیرەمێردی نەمر، بەغدا،١٩٧٠. ل٢٠.

٢ـ دیارە لەبەر ڕووناکیی بیروباوەڕی کوردایەتیی ئێستادا ئەمە وانییە بەڵکو ڕاستێکەی ئەوەیە کە هەموو میللەتێك پێش هەموو شتێك ئەبێت پشت بە خۆی ببەستێت و تواناو بوونی خۆی بە هەموو جیهان بسەلمێنێت.

**٣ـ من سوێندخوارانم بۆیە خۆش ئەوێ**

**ئەمجارە فریای ئێمەش ئەکەوێ**

**ئەگینا من خۆم لەگێ دادمە**

**نان و کەبابێك سەر و زیادمە**

**٤ـ پیر و ئیفتادەو ڕەنجورو خەمبار**

**بێ هیوای ژین و ژیان ناڵەکار**

**لەبەربێ دادی شای تەقیانووسی**

**تەئریخی مەرگی خۆمم ئەنووسی**

٥ـ لە وەڵامی ڕۆژنامەیەکدا کە لە کەرکوك دەرئەچوو کە دژی مەهاباد دوابوو ئەڵێ:

**غەزەتەی کەرکوك لە ئێران ئەدوێ**

**ئەڵێ دیموکرات پەت لە مل ئەسوێ**

**هەمزەو هەباس و تەوردا سییە**

**خەرباری ماسیی کونەماسییە**

**٦ـ هەی نائومێدی، هەی نائومێدی**

**هەی ڕەنجەڕۆیی و دڵ نائومێدی**

**بەدبەختی وەك من ساتوخواکێ دی**

**دەردی مەجنونم لێ هاتۆتەدی**

**٧ـ عەشرەت هاوارە، عەشرەت هاوارە**

**کەوتوومە (ئاراس) ئاو بێ بوارە**

**رێم نییە منیش شوێن ئەوان کەوم**

**پیرم هەنگاوێك بنێم ئەکەوم**

٨- پیرەمێرد بۆ بیرخستنەوەی ئەو شورشە ئەڵێ:

**من هەموو ساڵێك بیری ئەخەمەوە**

**هەم بە فەخرەوە هەم بە خەمەوە**

دەفتەری کوردەواری، بەرگی سێیەم، بەغدا، مایس تا ئاغستوسی١٩٧٠، ل١٣١.

٩- سەرنجێکم هەیە لەسەر دوو رای کاك دکتۆر عیزەدین موستەفا ڕەسوڵی هاوڕێم، لەسەر دوو دێڕی ئەم شیعرە لە بەشی زۆری نامەی دکتۆراکەیا، (الواقعية في الادب الكردي، بيروت،١٩٦٧ ل. ٩٥).

رای یەکەمی کاك دکتۆر ئەوەیە، کە دوای(ڕاپەڕینەکەی کانونی دووەمی ساڵی١٩٤٨)، پیرەمێرد ئەو ڕاستییە تێگەیشت کە شەهیدانی وەتەن پێویستییان بە گریان نییە، چونکە ئەوانە نەمرن و لە دڵی میللەتا ئەژین و ئەڵێ کە دووای ئەو(ڕاپەڕینە)، ئیتر وازی لە گریان هێناو دەستەئەژنۆ دانەنیشت بە دیار گۆڕی دەستەی تازەی شەهیدانەوە فرمێسك هەڵڕێژێت، لە کاتێکا کە پێش ئەوە ئەگریاو فرمێسکی بۆ ئەڕشتن، بەڵگەشی بۆ ئەم قسەیەی ئەم دێڕەی ئەو شیعرەیەتی کە بۆ نەورۆزی ساڵی ١٩٤٨ی وتووە:

**پێی ناوێ بۆ شەهیدی وەتەن شیوەن و گرین**

**نامرن ئەوانە، وا لە دڵی میللەتا ئەژین**

من ئەڵێم: پیرەمێرد پێش(ڕاپەڕینی کانون)یش شیعری هەیە بەو مانایە کە کاك دکتۆر ئەڵێ، چونکە ئەو ڕۆژەی کە دوو تەرمەکەی موستەفا خۆشناو و قودسییان هێنایەوە بۆ سلێمانی، دووای لە سێدارەدانیان لە بەغدا لە ١٩ی حوزەیرانی ١٩٤٧دا، پیرەمێرد شیعرێکی بۆ وتن کە دووا دێڕی ئەڵێ:

**هیچ پێیان ناوێ کفن و دفن و شین**

**شەهیدن لە ناو دڵمانا ئەژین**

ئایا ئەم بەیتە لەگەڵ ئەو بەیتەدا کە کاکە دکتۆر بە بەڵگەی قسەکەی هێناویتیەوە کتومت لە یەکتر ناچن؟!! ئیتر بۆچی ئەبێ پیرەمێرد پێش(ڕاپەڕینی کانون) لەم بابەتەی نەوتبێت؟!، بە پێچەوانەوە ئەگەر باش سەرنجی ئەو شیعرەبدەین کە پیرەمێرد لە هێنانەوەی ئەو دوو تەرمەدا وتوویەتی، ئەگەینە ئەو بڕوایەی کە ئەمیان زۆر لە بارترە بۆ سەلماندنی قسەکانی کاکە دکتۆر وەك لەوەکەی خۆی بە نموونە هێناویتیەوە:

سەیر بکەن بزانن پیرەمێرد لەو ڕۆژەدا چی وتووە:

**ئەم دوو دارتەرمە دوو نەڕەشێرە**

**زنجیریان پچڕان گەینەوە ئێرە**

**لە ڕێی ئێمەدا گیانیان فیدا کرد**

**ناوی بڵندیان وابۆ خۆیان برد**

**ئەو پەتەی لە ملی ئەمانە خرا**

**ئەوانی خنکاند بەڵام پەت پچڕا**

**پڵنگی ئەنگێوراو بە هەڵمەت ترە**

**گۆم هەتا قووڵبێ مەلەی خۆشترە**

**وا پێمان ئەڵێن دەم بە پێکەنین**

**گیانمان فیداکرد ئێوەی پێبژین**

ڕای دووەمی کاك دکتۆر عیزەدین لەسەر دێڕێکی تری هەر ئەو شیعرەیە کە بۆ نەورۆزی١٩٤٨ وتراوەو ئەڵێ:

**چەند ساڵ گوڵی هیوای ئێمە پێ پەستبوو تاکو(پار)**

**هەر خوێنی لاوەکان بوو گوڵی ئاڵی نەوبەهار**

دکتۆر ئەڵێ کە ئەم دێڕە بۆ(تەمجید)ی ڕاپەڕینەکەی کانوونی دووەمی١٩٤٨ وتراوە، بەڵام من ئەو وشەی(پار)ە وام لێئەکات کە بڵێم:

ئەم دێڕە ئیشارەتە بۆ لە سێدارەدانی(خۆشناو و قودسی و خێرواللەو عیزەت)، لە١٩ی ٦ی١٩٤٧دا، چونکە ئاشکرایە کە شیعرەکە بۆ نەورۆزی١٩٤٨وتراوە کە ڕێکەوتی(٢١ی

٣ی١٩٤٨)ەو ڕاپەڕینەکەی کانوونیش(٢٧ی ١ی١٩٤٨)ە کە ئەم ماوەیە بە هەمووی ناکاتە دوو مانگ، لەبەرئەوەی کە لە زمانی کوردیا، بۆ ئیشارەتکردن بۆ رابوردوویەك کە نەکاتە دوو مانگ، وشەی(پار) بەکار ناهێنرێت لەبەرئەوە ئەو دێرە ڕاپەڕینەکەی کانوون ناگرێتەوە چونکە نابێت بە(پار) بۆ نەورۆزی٩٤٨، بەڵکو ڕاستیەکەی ئەوەیە کە بڵێین ڕۆژی لەسێدارەدانی ئەفسەرەکان ئەبێت بە(پار) بۆ مێژووی وتنی ئەو شیعرە، خۆ ئەگەر ئەوەش بزانین کە پیرەمێرد کوردی زانێکی ئەوتۆبوو وەکو لە لاپەڕەکانی داهاتوودا لە کوردی زانینی ئەدوێین کە ئەیزانی وشەی(پار) لە کوردیدا بۆ کەی بەکارئەهێنرێت و ئەوەشی بخەینەسەر کە مامۆستا موحەمەد ڕەسوڵ هاوار لە(لاپەڕە(٥٠)ی پیرەمێردی نەمر)دا باسی ئەکات، کە پیرەمێرد بە لەسێدارەدانی ئەفسەرەکان یەکجار دلگیربووە و چاوی بەرایی نەداوە کە ئاهەنگی نەورۆز بگێڕێت و نەورۆزی ئەو ساڵەی بە(نۆجەژن)ی ئەو ئەفسەرانە داناوەو فتوای داوە تا تەمی ماتەم نەڕەوێتەوە ئاهەنگی نەورۆز نەبێت و ئەم فتوایەشی بە(کارت) بڵاوکردۆتەوە، ئەڵێم ئەگەر ئەم سەرنجەش ڕەچاوبکەین، ئیتر گومانی تێدانامێنێ کە پیرەمێرد ئەبێ لە شیعری نەورۆزی ساڵی١٩٤٨دا ئیشارەتێکی دابێت بەو ساڵی(پار)ەی ئەوانەی تێدا شەهیدکران. ئەمە تەنها مەبەستم ئەو بەیتەیە لەو شیعرەدا، ئەگینا ئەگەر لە دێڕەکانی تردا ئیشارەتێك هەبێت بۆ(ڕاپەڕینەکەی کانوون) من هیچ لاریم لەوە نییە چونکە شیعرەکە باسی تەنیا یەك ڕووداوناکات. لێرەدا مەبەستم تەنیا دەربڕینی ڕایەکە لە مەیدانی لێکۆڵینەوەی ئەدەبیداو ئەمڕایە هیچ پەیوەندییەکی بەڕاپەڕینەکە خۆیەوە نییەو هیچ مەبەستم ئەوە نییە کە بە چاوێکی کەمەوە سەیری بکەم، بەڵکو هەمیشە بەڕێزەوە ئەڕوانمە ڕاپەڕینی کانون و هەموو ڕاپەڕینێکی میللەتان لە پێناوی ئازادی و ڕزگاریدا.

١٠- پیرەمێرد نووسینی وەرگێڕاویشی هەیە، بەڵام ئێمە باسەکەمان هەر لە سەر شیعرەکانێتی.

**١١- گلەیی بەختی ڕەشی خۆم ئەکرد**

**ئەم ووت بۆچ منی وابەم دەردە برد**

کاکەی فەلاح، (مەولەوی، وەرگێڕانی پیرەمێرد، چاپی دووەم، بەغدا١٩٦٨ ل ١٦٦.

١٢- **ڕوێ فکر بەخت سیای وێم مەکەرد**

**پەی چێش هەر پەستی پەرێ من ئاوەرد**

مەلا عەبدولکەریمی مودەریس، دیوانی مەولەوی، بەغدا، ١٩٦١ل٢٥٦.

١٣- شیعرەکە زۆرە، چەند دێڕێکی کوردییەکەیم لەلابوو، ناردم بۆ مامۆستا شێخ موحەمەد خاڵ، فارسییەکەی بۆ ناردم.

١٤- ئەم چەند دێڕەم کاتی خۆی، لە مامۆستا نەجمەدین مەلای خوالێخۆشبوو وەرگرتووە.

١٥- زۆرم هەوڵداو زۆر گەڕام بۆ ئەوەی بزانم ئەم دێڕە کێ وتوویەتی بەڵام بەداخەوە نەگەیشتمە ئەنجام، زۆر جێگای سوپاسە ئەگەر ئەوی ئەیزانێت ئاگادارم بکات.

ئەم دێڕە باسی ئەفسانەیەکە کە ئەڵێ گوایا خونچەیەك بەڵێنی بە بولبولێك داوە کە ئەگەر تا دەمی بەیان بۆی بخوێنێت بەیانی کە گەشایەوە و بوو بە گوڵ دڵۆپە ئاوە قەتیسماوەکانی ناوی ئەداتێ بیخواتەوە.

شەو کردی و بولبول کردی تا بەیانی چڵەی چاویداو خوێندی، لە بەیانیدا بەشەونوخنی و ڕەنجی ئەم، خونچە گەشایەوەو بوو بە گوڵ، بولبولی شەیدا هەر کەدڵۆپە ئاوەکانی چاوکرد وەکو هەقێکی خۆی، دەنوکە پچوکەکەی بۆ برد تا گەرووی ووشکبووی خوێندن و هیلاکی شەوی پێ تەڕبکات، کەچی بای بەیان لەولاوە هاتو وەرانی و نەیهێشت هەر دەنوکیشی پێتەڕبکا، چ جای گەرووی!!. ئینجا شاعیر ئەڵێ: وەکو چۆن بولبول ڕەنجی گوڵی کێشاو کەچی لە ئەنجامدا بای بەیان ڕەنج بەخەساری کردو ئاوەکەی برد، هەروەها هێزو توانای عەشقیش بوو کە(بێستوون)ی بنکەندکرد، کەچی(فەرهاد) ناوبانگەکەی برد بۆ خۆی و ناوی پێدەرکرد!!

شاعیرانی کوردیش لەم ئەفسانەیە دواون، نالی ئەڵێ:

**گوڵ بە دەم بادی سەباوە پێکەنی بولبول فڕی**

**یەعنی عاشق لازمە دووربێ لە یاری بێوەفا**

ئەحمەد بەگی ساحێبقران ئەڵێ:

**لەسەر شاخی گوڵێ ئەم مەسرەعەی تەکرار ئەخۆێند بولبول**

**بەخەندەی خونچە قەت نابێ بکەم باوەڕ لەسەر پارا**

١٦. ئەم گواستنەوەیە لە مەبەستێکەوە بۆ مەبەستێکی تر، بێئەوەی هەست بە نالەباری و تێکچوونێکی شیعرەکە بکرێت، لە هەندێك شیعری پیرەمێردا بەرچاوئەکەوێت، لە لاپەڕەکانی داهاتوودا باسێکی تایبەتیمان بۆ تەرخانکردووە.

١٧. بێستوون:

أ. کێوێکی بەناوبانگە کە فەرهاد لەسەر فەرموودەی شیرین هەڵیکەندوە.

ب ـ لەباتی(ئاسمان)یش هەندێك جار بەکار ئەهێنرێت.

أ. (بغ + ستان ـ ئامرازی شوێن) واتە شوێنی خوا لە پارسی باستاندا(Baghistana)، لە(مفاتيح العلوم)دا ناوی پارسییەکەی(بغستان) و لە(معجم البلدان)دا (بهستان) و هەندێك دانیشمندانی عەرەب(بهستون)یان ناو بردووە، لەبەرئەوەی ئێرانییەکان لوتکەی شاخەکانیان بە شوێنێکی باشترداناوە بۆ لە خوا پاڕانەوە، ئەم شاخە بەرزەیان بە ناوی(جێگای نزاو پاڕانەوە)ی خواوە ناو ناوە.

ب ـ نیشانەیە بۆ وەستاندنی ئاسمان بەبێ کۆڵەکە(ستون) (عمود): الله الذي رفع السماوات بغير عمد سورەی ١٣(الرعد) ئایەتی ٢.

محمد حسين بن خلف تبريزی متخلص ببرهان، باهتمام دكتر محمد معين. برهان قاطع، جلد اول چاپ دوم. تهران. ١٩٦٣.

١٨. دیسانەوە زۆرم پشکنی نەمتوانی ساغی بکەمەوە بزانم ئەم دێڕە کێووتوویە.

١٩. أ. کۆکردنەوەی عەلائەدین سجادی، یادی پیرەمێرد، بەغدا، ١٩٥١. ئەو وتار و شیعرانەن کە بۆ چلەی کۆچی دووایی نوسراون.

ب ـ ئەو وتارو شیعرانەی کە لە بیرەوەری بیست ساڵەیدا لە ١٩ی حوزیرانی١٩٧٠دا لە سلێمانی خوێنرانەوە.

٢٠. ئەوبوو کە پەندی پێشینانی کرد بە هۆنراوە

**گیانی نەمری کرد بەبەر تەرمی باوو باپیرا**

**دەریای ئەو پەندەی بەنووکی خامەی ئەو شڵەقاوە**

**تا چاوی خەیاڵ بڕئەکا شەپۆل ئەدا لە بیرا**

کاکەی فەلاح، ڕۆژنامەی(هاوکاری)، ژمارە٢٥ ل٥.

٢١ـ مانا= مەعنا

٢٢ـ بەپێی لێکدانەوەی ئەو سەردەمەی ئەدەبی کوردی کە(نالی)ی تێدا ژیاوە وا(باو)بوو کە وشەی بێگانە بەکاربهێنرێت، ئەگینا ئەگەر ئەم ڕۆژە بوایەو نالی بیویستایە لە وردەکارییەکی وەهادا وشەی کوردی بەکاربهێنێ گومانم نییە کە بەلایەوە کارێکی ئاسان ئەبوو.

٢٣ـ لەناو شاعیرە لاوەکانی ئەمڕۆدا ئەم جۆرە یارییکردنەم بەو جۆرە وشانە لە شیعرەکانی جەمال شارباژێڕیا زۆرجار بەرچاو ئەکەوێت وەکو:

**بۆ دڵسۆزێ کە تا (پێری)**

**تا مەرگ هات بەرەو (پیری)**

**ئەزانم ڕێت (کە، لە، بەرە)**

**تەنراوە و بێ (کەلەبەر)ە**

**بەڕێکەر و دوعاخواز لە کۆڵان و (دالانا)**

**شوفێر پێی بە بەنزین و پێی بە ناخی (دڵا، نا)**

٢٤ـ یەکێك لە هەرە دیارترین شارەزاییەکانی شیعروتن، ئەوەیە کە ئەگەر شیعرێك(پاش قافیە)ی بوو، ئەبێ پارێزگاریی قافیەی خۆی هەر بکات. چونکە(پاش قافیە) بە قافیە ناژمێرێ، لەو دێڕەی خوارەوەدا، وشەی(شەو) پاش قافیەیە، لەبەرئەوە ئەبێ وشەکانی پێش ئەم(پاش قافیە)یە کە(ماوە) و(داوە)ن ببنە قافیە بۆ یەکتر.

هەروەها نموونەکانی تریش بەم پێوانەیە ئەپێورێن:

**فریشتەی خەم سەری سورماوە ئەمشەو**

**ئەوەندەی خەم بەم و بەو داوە ئەمشەو**

ع. ح. ب

**سازی دڵ کل بزیرو بم بیت**

**سازندەو عشق زین و مم بیت**

م. ب. رودنکو، مم و زین احمد خانی، موسکو١٩٦٢. ل٤١

**کەی من بە تۆم وت دەمت وا کوڵ بێ**

**وێنەی دار مێخەك پەروەردەی گوڵ بێ**

فۆلکلوری کوردی

٢٥- دەوڵەت= رانەمەڕ و(دەولەتمەند)یش لە ناو جافدا بەو کەسە ئەڵێن کە خاوەن ڕانەمەڕبێ.

٢٦- پیرەمێرد ساڵی١٩٢٥ لە تورکیاوە گەڕایەوە بۆ کوردستان.

**٢٧- ئێمە کە کوردین لە لامان وایە**

**زمانی کوردی زۆر بێ هاوتایە**

٢٨- لە نووسین و نووسینە وەرگێڕاوەکانیدا، باشتر کوردی زانینی پیرەمێرد دەرئەکەوێت بەڵام لێرەدا ماوەی لێدوانیان نییە.

٢٩- مەبەست ئەو شیعرانەیە کە لە عەرەبیدا پێیان ئەڵێن:

(سەهلی مومتەنع)، جارێ بە ناچاری ئەم ناوەمان لێنا، تا(کۆی زانیاری و زمان) ناوێکی بۆ ئەدۆزێتەوە.

٣٠- وەکو شیعری(ئەبێ بەخشندە مل کەچکا) و(ورێنە) و(ناخۆشە لای).

٣١- پیرەمێرد ئەڵێ:

**من وەزن و قافیەم نەدەویست، سەهلی مومتەنع**

**روانیم بە قەیدی قافیەوە ڕەخنەدار ئەبێ**

٣٢- لەگەڵ ئەوەشدا ناچاربووە کە جاروبار شیعری یەك قافیە بڵێ، بۆ دەمکوتکردنی ئەو شاعیر و شیعردۆستانەی، کە پێیان وابووە ئەگەر شیعر یەك قافیە نەبوو کەم عەیار و ناتەواوئەبێ.

**هاتم بە قافیەو بە قسەی قۆرو لەنگ ودرێژ**

**نووسیم نەوەك بڵێن کە تەلا کەم عەیار ئەبێ**

وەکو پیرەمێرد خۆی ئەڵێ، دیارە هەر لەبەرئەوە ناوبەناو شیعرێکی یەك قافیەی وتوەکە(نەوەك بڵێن!!)، ئەگینا خۆی حەزی پێنەکردوە.

بەڵام بۆیە هەر ناچاریش بووە چەند شیعرێکی یەك قافیە بڵێ، وتویەتی ئەگەر هەر لەم بابەتە نەڵێم، ڕەنگە شیعری یەك قافیە خوازان لایان وابێ کە لەو بابەتەم پێ ناوترێ.

ئەم(نەوەك بڵێن!) و(نەوەك نەڵێن!)ە زۆرجار شیعرێکی بە شاعیرێك وتوە کە ڕەنگە لە پێشدا بیری هەر لێنەکردبێتەوە، شاعیری هەڵکەوتوو مامۆستا ئەحمەد هەردی، هەر لەبەرئەوە تەخمیسی شیعرەکەی(شێخ نوریی شێخ ساڵح)ی کرد، کە پێیان وتبوو ئەم شاعیرانەی ئێستا نازانن تەخمیس بکەن.

**قەت نەدەی ئازاری گیانی مەست و بێدارانی شەو**

**خۆت نەخەیتە بەر شەپۆلی ئەشکی بێ پایانی شەو**

**ئەی کچی خواوەندی جوانی، وەی چرای دیوانی شەو**

**خۆت بپارێزە لە ئاهی دڵ بریندارانی شەو**

**نەك خوا ناکەردە گیرابێ دوعای ناڵانی شەو**

ئەحمەد هەردی، ڕازی تەنیایی بەغدا١٩٥٧. ل٢٥

٣٣ـ کۆکردنەوەی(عەلائەدین سجادی)، یادی پیرەمێرد، بەغدا١٩٥١. ل٧٥.

٣٤ـ لەناو کوردەواریا وابڵاوە کە لەکاتی بەفر بارینا، هەموو پێچەکلووی بەفرێك کە دێتەخوارەوە فریشتەیەکی لە ناودایە کە نیشانەی پیت و بەرەکەت و ئاشتییە.

٣٥ـ دوای ئەم دێڕە، بەدوو دێڕیتر کۆتایی بە شیعرەکە هێناوەو ئیتر نەگەڕاوەتەوە سەر وەسفی گوڵان، لێرەدا مەبەستمان هەر دەرخستنی ئەو بازەیە لە وەسفی گوڵانەوە بۆ دواکەوتنی قەومەکەی، بێئەوەی جوانی شیعرەکە تێکبچێ.

٣٦ـ (گۆران)یش زۆر بە دیاری بیرێکی وایکردۆتەوە، ئاواتەخوازی ئەوەبووە، ڕۆژی لەو ڕۆژان جوانی سروشت و جوانی شارستانێتی لە کوردستانا لەیەکبدەن، ئەوسا(هەڵپەڕکێ لە گۆران ئەبوو و بەستە لە ژیان).

**کوردستان جێگامی، جێی هەزار ساڵەم**

**پەروەردەی ئەم دۆڵ و سەرلوتکەو یاڵەم**

٣٧. ئەم ئەفسانەیەو ئەوەی دوای ئەم دێ، زۆر بە شوێنیانا گەڕام و پشکنیم، چەند کەسێ بەدەم بۆیان باسکردم چوار پێنجێکیش لە وەڵامی نامەی منا بە نووسین بۆیان نووسیبووم، کە یەکێکیان لەوانە مامۆستا مەلا موحەممەدی کوردی بوو، دوای خوێندنەوەو وردکردنەوەی نامەکان و تاوتوێکردنیان لەگەڵ ئەو وەڵامانەدا کە بەدەمی بۆیان باسکردبووم، وەڵامەکەی مامۆستا مەلا موحەممەدم بەلاوە لە هەموویان پێگونجاوتربوو، لە ڕووی ئەمانەتی ئەدەبییەوە وام بەڕاست زانی کە مامۆستا چۆنی بۆ نووسیوم وەکو خۆی بیخەمە پێش چاو.

٣٨. هاوار. پیرەمێردی نەمر. ل١٣.

٣٩. ئایەتی١٤٠ (وان یونس لمن المرسلین) هەتا ئایەتی١٤٩ (وأرسلناه الي مائة الف أو یزیدون فامنوا فمتعناهم الي حین) سورتی(الصافات) قورئانی پیرۆز.

٤٠. محمد احمد جادالمولی ومحمد ابو الفضل و علی محمد البجاوی و السید شحاته، قصص من القران، الطبعة الخامسة، القاهرة ل٢٦٦.

٤١. های بەخت = یانصیب.

٤٢. بە جۆرێکی تریش ئەمە ئەگێڕنەوە، گوایە کە یونسیان سواری کەشتێکە کرد ماسییەکی گەورە ڕێی پێگرتن، کەشتیوانەکە وتی: گوناهکارێکمان لە ناودایە تا ئەو گوناهکارەنەدەین بەم ماسییە رزگارمان نابێ، یونس وتی گوناهکارەکە منم، هەرچەند پێیان وت وانیە تۆنیت، سوودی نەبوو وخۆیدا بەدەم ماسییەکەوە.

دکتر خلیل خطیب رهبر، گلستان، بخش یکم، ص٥٩.

٤٣. پیرەمێرد جۆری نزاکەی هەر لەو شیعرەداوتووە:

**ئەو (لا اله الا انت)ەی وت**

**بەزمییت پیاهات، رەحمت بۆی بزووت**

مەبەستی ئایەتی(لا اله انت سبحانك انی کنت من الظالمین)ە.

٤٤. (يقطين) ڕووەكێكی بێ لقە وەكو خەيار، زۆرتر لە كولەكە خڕەكان ئەچێ لويس معلوف، المنجد فی اللغة، الطبعة الثامنة عشرة بيروت، ١٩٦٥ ل٩٢٦.

٤٥. شاعيرانی تريش ئيشارەتيان بۆ ئەم چيرۆكە كردووە زۆر گەڕام لە ناو شاعيرانی كوردا ئەم وێنەيەم بەرچاونەكەوت، سەعدی شيرازی ئەڵێ:

**قرص خورشيد در سياهی شد**

**يونس اندر دهان ماهی شد**

خطيب رهبر، گلستان، بخش يكم ص٥٩.

**وقتيست خوش ئ‌كنرا كه بود ژكر تو مؤنس**

**ورخود بود اندرشكم حوت چو يونس**

سەرچاوەی پێشوو، بخش سوم ص٥٩٢.

حەللاج ئەڵێ:

**من خاض بحر الهوى من غير معرفة**

**يبلعه الحوت يبقى يونس الثاني**

لويس ماسنيون، ديوانی حەللاج، پاريس، ١٩٥٥. ل١٤٢ (بەرگی ديوانەكە بە فەرەنسی نووسراوە).

٤٦. ئايەتی١٤٣ (ولما جاء موسى لميقاتنا و كلمة ربة، قال رب أرني انظر اليك قال لن تراني... هتد) سورەتی(الاعراف) قورئانی پيرۆز.

٤٧. قصص من القرآن. جاد المولي ورفاقه، ل١٤٧-١٤٨.

٤٨. شاعيرانی تريش ئەموستيان بۆ ئەم چيرۆكە ڕاكێشاوە، مەحوی ئەڵێ:

كەليم(أرنی) كە فەرمووی، جەوابی هەر(لن ترانی) بوو موشەڕەف بوو موحەمەد، بێ تەڵەب بەومەرتەبەو شانە.

٤٩. (وقلنا يا آدم اسكن انت وزوجك الجنة...) تا ئايەتی(فتلقى آدم من ربه كلمات فتاب عليه انه هو التواب الرحيم) سورەتی(البقرة) قورئانی پيرۆز.

٥٠. قصص من القران جاد المولی ورفاقه ل١-٧.

٥١ـ شاعیرانی تریش لەم چیرۆکە دواون، لە ناو شاعیرانی کوردا زۆرگەڕام نەمتوانی یەکێك بدۆزمەوە لەمە دوابێت، حافزی شیرازی ئەڵێ:

**ثدرم روضهء رضوان بدو طندم بفروخت**

**من ضرا ملك جهانرا بجوی نفروشم**

باهتمام محمد قزوینی و دکتۆر قاسم غنی، دیوان خواجه شمس الدین محمد حافظ شیرازی، تهران١٣٢٠هـ. شمس،١٣٦٠هـ. قمری. ل٢٣٣ لە هەندێك نوسخەدا وانووسراوە:

**پدرم روضهء رضوان بدوگندم بفروخت**

**ناخلف باشم اگر من بجوی نفروشم**

مؤسسة مطبوعاتی امیر کبیر، دیوان حافظ، تهران١٣٣٤. ل٢٢٤.

٥٢ـ وەکو چۆن بۆ دەست پێکردنی ئەم نووسینە وشەی(سەرەتا)م بەکارهێنا ویستم بۆ کۆتایی پێهێنانیشی وشەی(بنەتا) بەکاربهێنم بەڵام چونکە ئەمیان – وەکو من بزانم – تائێستا بۆ ئەو مەبەستە بەکارنەهێنراوە لە نووسیناو لەبەرئەوەی(دوواوشە) هەبوو وازم لە(بنەتا) هێنا، ئەوەندە هەیە وەکو بەبیرا هاتنێك بۆ بەکارهێنانی بۆ ئەو مەبەستە بە پێوستم زانی لێرەدا بیخەمە پێش چاو.

٥٣ـ سجادی یادی پیرەمێرد ل٧٣.

٥٤ـ مەبەستی مامەیارەی پاڵەوانی شێرو پیرەمێردی پاڵەوانی قەڵەمە.

# تافگەی ووشە

میللەت پشتی ساردبۆتەوە..

باوەڕی بە هیچ نەماوە....

خەڵکی ئیتر قوربانی بۆ کەس نادەن

هەمووومان ئەم نەغمانە ئەبیستین... بە تایبەتی لەم بەینەی دواییدا زۆریشی ئەبیستین، زۆر کەسیش پەسندی ئەکەن و سەری بۆ ئەلەقێنن و لەگەڵیا ئەڵێن: ڕاستە بۆ کێی بکەن؟ هەرکەس مشوری ژیانی خۆی بخوات باشترە.

بەڵام ئەمە تەعبیرە لە هەست و موقفی کێ؟ بەلای منەوە ئەمە موقفی تاقمێ خەڵکی بەزیون.

کە سەرنەکەوتنی خەباتەکانی گەل ورەی پێبەرداون.

ڕاستە گەلەکەمان دەمێکە لە خەباتایە، کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان دەمێکە قوربانی ئەدەن و ڕۆڵەکانیان گیانیان بەخت ئەکەن... دەمێکە خەڵکی ئارەق ئەڕێژن و خوێناوی خۆیان ئەڕێژن و ئەیکەن بەتۆوی ئاواتەکانی دوارۆژ، کەچی کە دێنە سەر درەو، لە سەرەنجاما هیچ بەرهەمێك بەدەست ناهێنن. بە کوردی هەر کردەی ئەوانەو بردەی کەسانی تر.

ڕاستە هیچ بەرهەمێك نەهاتەدی بۆ زۆربەی گەل، بۆ کرێکاران و جوتیاران و ڕەنجدەرانی تری گەل، کە باری گرانی خەبات و ئەرکی زۆر هەر بەسەر شانی ئەوانەوەیەو هەر ئەوانیشبوون سوتەمەنی ئاگری هەموو شەڕەسەختەکانی ڕێگەی تێکۆشان.

تائێرە ڕاستە.

بەڵام خەڵکی تاقەتیان نەچووە کە ئەڵێم خەڵکی... دیسان مەبەستم لە کۆمەڵانی تێکۆشەری خەڵکە.. کە ئەوانە هێزێکی لە بنەهاتوون و وزەیەکی بێ سنوریان لە

گیانایە بۆ درێژەدان بە خەبات.. ئەوانە هەر چەندە لە هەموو کەسانی تر باشتر ئەزانن کە هیچ بەرهەمێکیان دەستگیر نەبووە لە ژیانی ڕۆژانەیانا بە قوولی هەستی ئەوەئەکەن، بەڵام هەرگیز ورە بەرنادەن، چونکە تا چەوساندنەوە هەبێت، تا برسێتی و رووتی و نەخۆشی هەبێت، هەر ئەوە خۆی هاندەری کۆمەلانی خەلکە بۆ بەرپاکردنی خەباتێکی سەخت و درێژخایەن، لە ڕێڕەوی ئەم خەباتەشا هەر چەندە زۆرجار ئەشکێن و سەرکەوتن بەدەست ناهێنن، بەلام هەرگیز نا هومێدنابن.. وەکە لە هەر نوچدان و شکانێك هەلئەسنەوە، بەتین تر و بە گوڕێکی تازەوە دێنەوە مەیدان و ڕێگەئەگرنەوە بەر.

ڕەنگە زۆرکەسی خوێندەوار و شۆڕشگێڕی ساختە یان کاسەلێس ئەتەکێنەوە لە کاروان و بەجێ ئەمێنن، بەلام کۆمەلانی تێکۆشەری خەلك ئەزانن کە چارەی دەردەکانیان، دەرس وەرگرتنە لە شکانەکانی رابوردوووە ناسینی دۆست و دوژمن و... ئینجا ڕێگەی خەباتی شۆڕشگێڕانە گرتنەوە بەرە.

وەئەوانە.. بێگومان ڕێگەکە تاسەر ئەبرن... کاروانیش هەر بەرەو پێشەوە ئەڕوات.

هاوکاری ژمارە(٥) ٦ی شوبات ١٩٧١

# نەورۆز

لە دڵمانا غەریبی ئەی شەوی نەورۆز
لە دڵمانا غەریبی ئەی شنەی گەرمی بەهاراوی
لە دڵمانا غەریبی ئەی کچی لادێ..
گوڵاڵەی سەوزەلانی..
بە چاوی گەش: گەزیزەی بەروژانی
تریفەی بەفری بەرتاوی
زرێباری بەیانی تاووساوی
کوڵەنجەی خامەکت: بەڵگی وەنەوشە
کراسی کەرنەکت: لێلوپەری ئاوی
کە هەڵ ئەبڕێ:
گوڵی گەرووی ناسك
خرۆشی خاڵە ڕێبوار
لە شەق بوونی شەوا، قاوی دلێری خاسە کەو
قاوی کەوی هەردە، کەوی کۆسار
کەچی هێشتا:
لە دڵمانا غەریبی ئەی کەو
ئەی کەویار

...

هاوکاری  ژمارە:١٠ ٢٠ی مارت١٩٧١

# گوڵاڵەی سەوزەڵانی!

غەریبی لێ ئەبارێ ئەم بەهارە
غەریبی لێ ئەبارێ شینی گەرمی وورده بارانی
گەزیزەی بەر بەرۆژان!
بە بەرگی ئاڵ و واڵا، جوان و شیرینی
لەبەر چاوم کەچی..
هەی قۆر بە چاووم
بووکە دارینی...
لەبەر چاووم تەجەللی ئینتزاری
کە چاوەڕوانی بارانی بەهاری
بەلام تۆ خەم مەخۆ
گوڵاڵەی بێ بەهارم
... مەچۆ ..
فەقیانەکەت مەدڕە..
لە دری کۆنی شەخست مەیکە ئاڵایی:
برای پێنەو بەرۆبارت..
برای بن کۆڵەدارت، داری شەخست
مەترسە، نیازی لێ بخوازە، دەسدەپشتێنی
بڵێ: "تا چەندە هەڵکێشین
لە سایەی داری بێ ئاخی غەریبی"
نیازی لێ بخوازە بەشکو هیمەتکا:
بەهار بێنێ و نیازبێنێ و
داری ساز و راز بێنێ..

# بۆ هاوڕێیەکی تازە

(١)

وەك فریشتە...

کە بەلاما تێپەڕی

بە بەرگی سپی وەك پەری

بە باڵای ڕێك و بەرزەوە

کراسی ئاخر تەرزەوە

ئەچێنی لە ناخی دەروون

تۆوی ئاواتی نوێ بە(بوون)

وەکو ئاواتی شەوکوێرێ

بە ئاسۆیەکی کەمێك ڕوون

وەك فریشتە..

کە ئەبڕێتە چاوم، چاوت

کە ئەینێیتەوە بۆ دڵی

تێك شکاو

تاڵ تاڵی داوت

کە هەڵ ئەبڕیت گەردنی بەرز

ناسك ناسك.. وەکو ناوت

یا هەستی گەرمت دەرئەبڕیت

بە تێکەڵاوی هەنگاوت

یا بە شەرمی سەر داخستن

یا بە کوڵمی خوێن تێزاوت

لەگەڵ هەموو تەماشایەك

هەموو ئاوڕێك.. نیگایەك

دڵی بێ عارم سەر لە نوێ

هەستی تازەی تیا ئەبزوێ

دەریای قووڵی چاوەکانت

لە دەروونی وەك بیابانا.

دەریایەك هەست ئەجووڵێنێ

بە شەریانەکانی گیانا

تەوژمی خوێنی نوێ دێنێ

وەك فریشتە..

وردە وردە.. بە ئەسپایی

ئەبێت بە هاوڕێی تەنهایی

ئەچێتە ناو دنیای هەستم

ئەبێت بە گرێیەکی نوێ

لە ناو بیرکردنەوەی مەستم

ئەبێت بە نەغمەی بەسۆزی

تەلی پساوی هەڵبەستم

وەك فریشتە..

بە مۆسیقای لەنجەت..

بەناز

وا خەریکیت دڵی سستم

ئەخەیتەوە بەزم و ئاواز

گیانی مردووم بۆ خەمی نوێ

ئەکەیتەوە دۆستی هامڕاز

وەك فریشتە..

خەریکە چەرخی زەمانە
ئەت خاتە ناو ژیانی من
ئەکەویتە بەر گێژاوی
عاتیفە بێ ئامانی من
(٢)
ئەی فریشتە...
نامەوێ تۆی وەك فریشتە
بێیتە ناو دنیای خەیاڵم
بێیتە سەر ڕێی ژینی تاڵم
ئەی فریشتە..
ئەی چاوی گەش..
پاش ئەم باسە
سەیرم مەکە.. من مەناسە
منی هەزاری ئاوارەش
ئەبێ هەتا دوا هەناسە
هەتاکو ئەو کاتەی ئەمرم
ڕێگای ژیانێکی تر بگرم
دوور بێت لە عەشق.. لە دڵداری
لە خەیاڵی هەرزەکاری
ژیانێکی تەرخانی خەبات
پڕ لە جۆرێکی تر ئاوات
ئەی فریشتە..
منی عاشقی(ئەو ڕێیە)
ناتوانم عاشقی تۆ بم
ناتوانم هەرگیز لەگەڵ تۆو

لەگەڵ ئەو ڕێیەش ڕاست

گۆبم

ئەی فریشتە..

باشتر وایە..

قانونی ژیان وەهایە

لە دەفتەری تازەی عەشقا

لاپەڕەی ڕەشی من بدڕی

یادم لە خەیاڵا بسڕی

منی عاشقی ئەو ڕێیە

بۆ تۆ نابم

تۆش قەت نابیت بەو

هاوڕێیە

کە ئەو ڕێیەم لەگەڵ ببڕی

هاوکاری ژمارە٢ ١٩٧١/١/١٦

# تاڤگەی ووشە

لە نەورۆزی ئەمساڵدا لە کوردستان بووم، دەشت و چیا.. هەمووی بەرگی نوێی پۆشیبوو، بەرگی سەوزی زیندووی پۆشیبوو، خەڵکێکی زۆریش.. زۆرتر لە ئاسایی، جەژنیان ئەکرد، ئەوانیش وەك بەهاری تازە، تەڕ پۆش و ڕازاوەبوون، دڵشاد و ڕووبە پێکەنین بوون.

ئەوەی بە ڕێگای سلێمانی دوکاندا بڕۆیشتایە، بە ئاسانی ئەم دیمەنەی بەدی ئەکرد، ئەم جەژنەی تەبیعەت و جەژنی خەڵکی سەیرانکەر.. بەڵام هەر لەم لاولای ڕێگاش، ژنانی ئەو دەشتە، لە جەژنیشا.. هەر خەریکی ئەرز کۆڵین بوون، خەریکی نان پەیداکردن. هەموویان، تێکڕا.. کۆڵ بە کۆڵەوە، پاچە کۆڵەیە بە دەستەوە، بەچاوێکی پڕ سەر سوڕمان و غەریبیەوە سەیری ڕێچکەی کۆتایی نەهاتووی ئۆتۆمبیلی سەیرانکەرەیان ئەکرد، گوێیان لە دەنگی تەپڵ و خرمەی چەپڵە و سەدای نەبڕاوەی گۆرانیەکانیان ئەگرت، و جارێکی تر دەستیان ئەدایەوە پاچە کۆڵەکەی خۆیان و شەڕکردن لەگەڵ تەبیعەتا، لە کاتێکا کەسانی تر.. دەستیان لە ملی تەبیعەتی ڕازاوەدابوو، کەیلی ئاوازی گۆرانی و نەغمەی زەماوەنگی بەجۆشبوون.

مناڵە ڕووتەڵەکانیان، لەسەر جادەکە، بەچەپکە نێرگزەوە دەستیان لە ئۆتۆمبیلەکان ڕائەگرت، جارجار یەکێکیان ڕائەوەستا و هەندێکی لێ ئەکڕین.. نەك هەر ئەوە، بەڵکو ڕەنگە چەند دەفلسیەك زیادیشی ئەدا بە مناڵەکان.. کە لەو نەورۆزە مەزنە.. هەر ئەوەندەیان پێئەبڕا.

ئەمەو.. بە دەیان دیمەنی وەهام لە نەورۆزی ئەمساڵا دی، دەیان دیمەنی جوان و ناشرین، تاڵ و شیرین، وەك ژیان خۆی، نەورۆزی ئەمساڵیش، کەسانێك خەریکی شایی بوون و کەسانی تریش، هێشتا(ڕۆژی نوێ) یان هەڵ نەهاتبوو.. بۆیەکا لە نەورۆزیشا هەر خەریکی چەرمەسەری ژیان و نان پەیداکردن بوون.

دەمێکە دنیا هەر وابووە.. هەر واش ئەبێت تا نەورۆزی ڕاستەقینە..

(هاوکاری ژمارە-١١- ١٩٧١/٣/٢٧)

# بەهرەیەکی باڵا
# لە هونەرمەندێکی کورددا

بیست ساڵی ڕێك لەمەوبەر لەو دەوروبەری ماوەتەبووم، لەگەڵ کۆمەڵە هاوڕێیەکدا کەوتینە سەر هەواو هەوەسی ئەوەی، گەشت و سەیرانێك بۆ ئەو سەرانە سازبکەین، بۆ ڕۆژی دوایی، دەنگ بڵاوبووە کە حەسەن زیرەکی گۆرانی بێژ لەناو ئاوایی دایە، ئەوەندەی پێنەچوو، هەڵکشا بەرەو ژوور و هاتە لامان. کە هات هەرخۆی نەبوو. کۆمەڵێ کوڕوکاڵیشی بەدواوەبوو، بۆ یەکێکی وەکو ئەو پێویستیی بەوە نەبوو خۆی بە کەس بناسێنێ، هەر زۆری پێنەچوو ڕوویان لێنا گۆرانی و بەستەیەك بڵێ. ئێستاش وا ئەزانم دوێنێیە یەکسەر(کیژان دەچنە مێرگوڵان)ی تێچڕاند. دیاربوو لەو گۆرانی بێژانەنەبوو کە نازونووزدەکەن و بیانوودەگرن. کەتێی چڕاند وامزانی دەنگەکە لە لووتکە سەرکەشەکانی چیاکانەوە هاڕەدەکەن و دەدەن بە گوێمدا. دەنگێکی نێر تێکەڵ بەجۆرە گڕییەکی بەسۆز، هەمووانی خستە سەر هەوەس و ئارەزوویەکی تەلیسماوی، هەمووانی هەژان، هەمووانی بزوان. دوای ئەوە دەنگی لێ هەڵبڕی بە چەند گۆرانی و بەستەیەکی تر ئێمەش و خۆشی مەستکرد. من بۆم دەرکەوت ئەم پیاوە وەکو بۆ خۆی بلاوێتەوە، وەکو خۆی ژیرکات، وەکو ئاوپرژێنی دڵی هەڵقرچاوی خۆی بکات، ئاوا حەزی لە گۆرانییە وەکو بڵێ:"خەڵکە منەتی چیتان بەسەردابکەم، من خۆم کەیفم بە گۆرانییەو بۆ خۆمی دەڵێم" زیرەك وەکو بتی گۆرانی و بەستەی کوردی بپەرستێت وابوو، بۆیە بەرامبەر ئەو بتە بەچۆکدا دەهات و بە گۆرانی وێردو سڵاواتی بۆ دەخوێندو نوێژی بۆ دەکرد. ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە بردمی بۆ ئەوەی ڕووبکەمە هاوڕێکانم و بڵێم:"ئێوە سەیرکەن، چۆن ئەم هەلە لە دەست دەدەین، ئەوا سبەی دەڕۆین و کاك زیرەك جێدەهێڵین." کە گوێی لەم قسەیە بوو، ووتی:"کاکینە

ڕاستییەکەی من میوانی ئێوەم و بۆ لای ئێوە هاتووم، زۆر خۆشحاڵمدەکەن، ئەگەر بە هاوڕێی خۆتان قبووڵم بفەرموون.

هەر شەو لەگەڵ ولاخدارێکدا پێکهات کە بەیانی بە سواری بکەوێتە تەکمان گەشتەکەمان سێ شەوی خایاند، نەدەکرا هەر هەموومان تەنیا لە یەك شوێن دابەزین و داکرێین، کە دەمەو ئێوارە گەیشتینە ئاوایییەك، کاری داکردن و دامەزراندنی میوانەکان کەوتە ئەستۆی من و ریش سپیی ئاوایییەکە. کاك حەسەن زیرەك هاتە بندەستمەوە و بەبێ دەنگی پێی وتم:"کاکە ئەمن بۆ خۆم وام پێخۆشە لە هەر ماڵێك دامەزرایت منیشت لەگەڵ بم". نیوە ڕۆژانیش هەر لەتەك مندا لە ماڵێك تیکەیەك نانمان دخواردو لێمان دەداو دەڕۆیشتین. بۆ ئەو ماوە کەمەش کیژان ڕوویاندەکردە ماڵی خانەخوێکەمان، زیرەك بە گۆرانیی خۆشەوە، بە بەستەی بەجۆشەوە، دەیخستنە دنیای عەشقێنی پڕ خرۆشەوە. بە هەر گوندێکدا تێپەڕ دەبووین، کوڕ و کیژی هەرزەکار دەهاتنە پیرمانەوە، بە ڕوویەکی خۆش و ساکارەوە دەیان پرسی: توخودای ڕاستە حەسەن زیرەکتان لەگەڵە، کا... کامەیە؟!!.

تا گەیشتینە دوا مەڵبەندی گەشتەکەمان، چ شەو و چ ڕۆژ، ئەمە هەر گۆرانی و بەستەبوو، شەوانیش گەلێك یەسەرهاتی خۆی و باسی دنیای بۆ دەگێڕامەوە، قسەکانیم بەلاوە زۆر سەیر و سەمەرە بوو.

تا ئێرە تێکڕا هەر باسی گەشت و سەیرانەکە بوو، بەڵام لە ڕاستیدا ئەم بیرەوەرییەم بەو نیازەنووسی کە بەهرەیەکی تایبەتیم لەو هونەرمەندە مەزنە دی کە لە هەموو باسکردنێکیدا دێتەوە یادم. سەرم سوڕدەمێنێ، ڕادەمێنم. ئەوەش سەیرە کە تا ئێستا بەش بە حاڵی خۆم نە بە دەمی نە بە نووسین، نەم بیستووە و نەم دیوە. تەنانەت(میرزا کەریم)یش لە هەردوو بەرگی کتێبەکەیدا لە بارەی(حەسەن زیرەك)ەوە لەوە نەدواوە. بۆیە وا من ناچارم بۆ مێژووی هونەری کوردی ئەم ڕازەبدرکێنم و بیژنم بەسەر ئەم کاغەزەدا.

لەو سێ شەوەدا کە بە یەکەوە بووین دەکەوتینە دەمەتەقێ، بەلام ئاخ لە دەست شەکەتی ڕێگا، نەی دەهێشت تا درەنگانێك دانیشین، وەنەوز ملی دەشکاندین، باوێشك گوێی کپدەکردین.

خەو وەڕسی دەکردین، تەنگی پێهەڵ دەچنین، ناچار خراپ خەومان لێدەکەوت. یەکەم شەو نەمزانی شەو چ وەختە دەنگ و ئاوازێك وردە وردە خەوەکەمی ڕەواندەوە تا خەبەرم بووەوە، ڕاستییەکەی نەختێك سڵەمیمەوە! نەختێکیش شڵەژام! چاوێکم گێڕا، هیچم نەدی! دەنگەش هەر بەردەوامە، بە چاوی خەواڵوەوە هەرچونێکبوو، سەرنجێکمدا، سەیردەکەم، حەسەن زیرەکە بە ئاوازێکی ناسك و نزم و نەرم بە گوێی شەوی کشوماتدا دەچرپێنێ. وامزانی بەخەبەرە و بێدەنگ لەسەر شوێنەکەی خۆی گۆرانی دەڵێت. دوو سێ جار دەنگم لێکرد، دەنگی نەبوو. بەلامەوە زۆر سەیربوو، ناچار بە ئاگام هێنا، وتی ئەوە چییە کاکە؟!، وتم کاکە بڵێم چی وەختبوو شێتبم!، وتی بۆ؟! بەسەرهاتم بۆ گێڕایەوە، پێکەنی و وتی:"کاکە گیان، ئەوە من هەروام، بەدەم خەوەوە گۆرانی دەڵێم، (میدیای زەندی)ی خێزانم کە ئەمەی لە من دی(زەبتل صەوت)ێکی (تۆمارکار)ێکی دانا، ئەم (گۆرانیی بە دەم خەوی شەوانەوەیەی) زەبتدەکرد بۆ بەیانی کە لە خەو هەڵدەستام، بۆی لێ دەدامەوە، سەیردەکەم هەندێك لەوانە شیعر و ئاوازی نوێن، خۆشم بۆ یەکەم جار دەیان بیستم، لەبەر ئەوەچەند جارێکم دەوتنەوە و نەختێك پوختم دەکردن و لە ناو خەڵکدا دەبوونە گۆرانی و بەستەی تازە داهێنراو. ئەمەش وەنەبێ هەموو شەوێکبێ، جاروبارە، واڕێکەوتی ئەم شەویکرد."

گۆڤاری بەیان

# یەك دوو وشەو پێنج خشتەکیەکی بڵاونەکراوەی ئەحمەد هەردی

ئەحمەد بەگی حەسەن بەگ یەکێکە لەو شاعیرە کوردە هەڵکەوتوانەی کە لە ڕێگای شیعرەوە زمانەکەمانیان لا خۆشەویست کردین. تا وامان لێهات ئەو میللەتەشمان خۆشبوێ کە بەوزمانە قسەئەکەن و ئەو خاکەشمان لا ئازیزبێ کە ئەو میللەتەی لەسەر ئەژی.

(ئەحمەد هەردی) یەکەم کەس بوو کە شیعری(گۆران) بەتایبەتی و(بلەو شێخ نوری)ی بەگشتی لای من خۆشەویستکرد، وای لێکردم کە حەیرانی شیعری(گۆران)ببم. کەسانی تریش زۆرن چ هاوتەمەنی خۆی و چ نەوەی دوای ئەوان، بەدەیان، لەودانیشتن و کۆڕانەی(ئەحمەد هەردی)دا بوون و ئێستاش ئەو قسانە لەگوێیاندا ئەزرنگێنەوە، وەکو لە نزیکیشەوە ئاگادارم ئێستاش(ئەحمەد هەردی) زۆربەی زۆری شیعرەکانی(گۆران)ی هەر بەسەر دەمەوەیە.

(ئەحمەد هەردی) کە لە ساڵی١٩٢٢دا لە دایکبووە، لە سییەکاندا شیعری وتوە. پێش ئەوەی سییەکان تەواوببن، واتە لە(٣٨ و٣٩)وە، شیعری گەیوو وشەی هەڵبژاردە و ناسك و پڕ ئاواز و مۆسیقاو پڕ ئاهەنگ و پڕ خرۆشی بەکارهێناوە(گوێچکەی دڵ) لەرەی ئەو زمانەی پێ خۆشە کە(هەردی) شیعری پێوتوە، بۆیە شیعرەکانی سوارن. بە شیعر وێنەی ڕەنگاو ڕەنگی گرتووە. وێنە شیعرییەکانی(پڕ تەلیسمی جوانین) وەك دوو چاوی مەستی(ست فاتمە). پڕ خەیاڵی گەرم و گوڕن، ھەناسەی خەیاڵی وێنە شیعرییەکانی ئەڵێی(هەناسەی پڕ گوڵاوی دولبەران)ن. شەپۆلی ووشەکان و سەرجەمە چەسپاوەکانیان هەر ئەڵێی(دەنکە گەنم)ەکەی شیعرەکەی(گۆران)ەو (بە شنەی با شەپۆل ئەدا).

داهێنانی مانای نوێ بە وشەی نوێ و نەسواو، لەسی، چل تا پەنجا ساڵێك لەمەو بەرەوە بە شداربوونێکی گەورەیە لە مەیدانی نوێکاریی ئەدەبی کوردیدا، تەعبیرێکی وەك(بووکی ڕازاوەی خەیاڵ) کە هەر لە شیعرێکی(ئەحمەد هەردی)دا بیسترا، یەکسەر تەشەنەیکرد و کەوتە سەر زمانی خەڵك و تەنانەت هەندێك لە نووسەرانی ئەو سەردەمەش. چونکە لە قاڵبێکی جوان و نوێدا داڕێژرابوو، کە ئەم جۆرە داڕشتنە نوێیانە لە زماندا نیشانەیەکی پێشکەوتن و شارستانییەتی زمانی میللەتێکن. سەیری ئەم داهێنانە ناسکانە بکەن:"پەپوولەی ئارەزوو)(شەیتانی ڕاڕایی)(شۆڕشی نائومێدی)(گوڵی بێ بۆنی جوانی) (بزەی سەرلێوی ژهراوی)(سوورایی خۆرنشین)... هتد، دوای سەیرکردن ئینجا سەرنجێکی ئەوەبدەن کە کەی و لە چ ساڵێکدا ئەمانە وتراون. ئەوسا لام وابێ بە باشی سوارچاکیی(ئەحمەد هەردی)تان لە مەیدانی نوێکاری و داهێنان و خزمەتی زماندا بۆ دەرئەکەوێ.

ئەوەی تائێستا وترا یەك دوو ووشەکەبوو، بۆ مەسەلەی پێنج خشتەکییەکە، ئەحمەد هەردی گێڕایەوە وتی: ساڵی خوێندنی١٩٣٨-١٩٣٩ لە پایزێکی درەنگدا کورتە پشوویەکی قوتابخانە هەبوو، منیش وەك قوتابییەك، بە هەلم زانی، بە سەردان چووم بۆ هەولێر بۆ ماڵی کاك یونس، واتە(یونس ئەفەنیی قادر ئەفەنی) کە ئەوسا لەوێ موچەخۆری میری بوو.

لەوێ کاك(مەحموودی مەجید بەگی حاجی ڕەسوڵ بەگ)م دی. زۆر دڵمان بە یەکتر گەشایەوە، وتی: وەرەبڕۆین بۆلای(ئەوڕەحمانی وێنەگر) کە وتم کێیە؟ وتی ئای.. چۆن نایناسی؟!، لاوە کوردە ڕۆشنبیرەکان زۆربەیان لەوێ کۆئەبنەوە، جگە لەوەش برای(حسین حوزنی موکریانی.. حسین حوزنی خۆشی لەوێ دەبینی، کەوای وت زۆرم پێخۆشبوو، چونکە بەڕاستی زۆر دەمێکبوو حەزم ئەکرد مامۆستا حوزنی ببینم. نووسنەکەیم خوێندبووە، کە چوینە ئەوێ کاك مەحموود منی بە کاك ئەوڕەحمان ناساند و ئنجا وتی:"ئەمە شاعیریشە، منیش وتم شاعیر نیم، وتی نا.... نا بە چاوتا دیارە شاعیری، ئینجا پرسی: تۆ تەخمیس ئەزانی؟ وتم: بەڵێ وتی دەباشە ئەم دوو بەیتە شیعرەم بۆ تەخمیس بکە:

**بە خۆشی ڕابوێری یا بە ناخۆش**

**شەرابی مەرگی ناچاری دەکەی نۆش**

**...**

**وەتەن هەر خزمەتێکت لێ ببینێ**

**لە دوا ڕۆژ هەر ئەوەندەت پێ دەمێنێ"**

وتم ئەم دوو بەیتە شیعری کێیە؟ وتی شیعری(گیو)ە کە وتم(گیو) کێیە؟ زانی کە نایناسم، وتی شاعیرێکی کۆنە بەڵام هەر ئێوارەی ئەو ڕۆژە زانیم کە خۆیەتی و یەکترمان باشتر ناسی.

من لام وابوو ئەیویست تاقیم بکاتەوە پێش ئەوەی بڕۆین وتی: کەی تەواوی دەکەیت؟ وتم ئەم ئێوارێیە بۆت ئەهێنمەوە، ئێوارە کە بۆم بردەوە وام تەخمیس کردبوو:

**بەیانی بوو. زەمین گشت مات و خامۆش**

**شەماڵ هات و لقوچڵ کردی کڕنۆش**

**بە گوێیا دام وتی: گوێ بگرە بێ هۆش**

**بە خۆشی ڕابوێری یا بەناخۆش**

**شەرابی مەرگی ناچاری دەکەی نۆش**

**...**

**هەموو تاجی هەموو تەخت و نگینێ**

**هەموو ئێشێ، هەموو زام و برینێ**

**بە چاولێك نانێ نامێنێ لە ژینێ**

**وەتەن هەر خزمەتێکت لێ ببینێ**

**لە دواڕۆژ هەر ئەوەندەت پێ دەمێنێ**

بەیانی ژ١٢٧/ك٢ ١٩٨٧

پەخشان

# ڕۆژگار

## ١ـ دڵدارییەکی گڕگرتوو ئەنجامێکی دامرکاو

دووسێ ساڵێك بوو قۆناغی هەرزەکاریم بەرێکردبوو، دڵم بە کچێکی ژیکەڵەوەبوو. ماوەیەکی پێچوو سەیرم کرد ئەویش منی بەدڵە. یەك دوو مانگێکی پێچوو کەوتینە قسەکردن. هەرچییەکم بۆ باس ئەکرد، وام ئەزانی هیچم نەوتووە، ئەم ڕوانییە چاووبرۆی، زوڵف و ڕووی، دەستوپەنجەی، گۆنای، بریقەی چاوی، ڕەشیی برژانگی، لووتی قوت و گەردنی بێگەردی، وام ئەزانی جوانێکی بێوێنەیەو خوا بە تایبەتی ناردۆێتییە خوارەوە و منی بە شایانی زانیوە، ئای کە دڵم پێی خۆشبوو، وام ئەزانی کلووری دنیا هی منە. زۆر کۆڵمان بە قسەوباسی یەکترەوە هەڵگرتبوو، کە سەری ڕازێکی دابمەزرانایە، هەموو لەشم ئەکردە چاوو چاویشم ئەبڕییە ئەو، سەرنجم ئەدایە هەموو ئیشارەتێکی دەست و پەنجە و چاووبرۆی هەموو لەشم کردبووە گوێ، گوێشم بۆ مۆسیقای ووشەکانی و ئاوازی هەموو سرپەو چرپەو چپەو هەناسەیەکی شلکردبوو.

زەمان هات و زەمان چوو، ساڵانێکی زۆرهاتن و تێ پەڕین، ڕۆژێك لە شوێنێك چاومان بەیەك کەوتەوە، ماوەیەك دانیشتین، هەر چەندمانکرد و کۆشا، سەری ڕازێکمان پێ دانەمەزرا، ماوەیەکی تریش دانیشتین. هەر چەندمانکرد هیچ باسێکمان نەبوو بۆ یەکتری بگێڕینەوە!!

## ٢ـ هەر ئەقڵە لە خەسارێ:

من و هاوڕێیەکم لەسەر ئەوە پێك هاتبووین کە کاسپی و(ئامانج)ێك هەیە ئەگەر هەوڵ و تەقەلایەکی چاك و پاکی بۆ بدەین قازانجەکەی بۆ هەردووکمان و بۆ خەڵکیشە، کە باسمان ئەهاتە سەر ئەوەی ئەم کارە چۆن ئەنجام بدەین. چ جۆرە شوێنێك و چ جۆرە کەسێك و چ جۆرە بیرکردنەوە و، بۆچوون و دوکان و دامودەزگایەکی گەرەکەو لە سەرەتاوە چۆن دەست پێ بکەین و چۆن بازاڕی بۆ بدۆزینەوە، کێ کڕیارە و ئەیقۆزێتەوە، کێ لێی لووتەلایەو ڕووی لێ وەرئەگێڕێ و پارەی پێنادا. هەرچییەك من ئەموت لای ئەو پەسەندنەبوو!! هەرچییەکیش ئەو ئەیوت، هەرچەندم ئەکرد و ئەکۆشا بەئەقڵمدا نەدەچوو بە دڵم نەبوو. دوای ماوەیەکی کەم ڕۆژێ پێم وت: دەی کاکی برا، خۆ نەچووەبچێ، وا دیارە نەسیب نییە من و تۆ ئەم کاسپییە بەیەکەوە بکەین، بەڵام هەر هاوڕێیەکەی جارانین، با هیچ نەبێ ئەمیان سەری تیادانەچێ. ئەوی ڕاستیبێ هاوڕێیەتیەکەمان ڕۆژ بەڕۆژ کزئەبوو ئەیدایە باریکی و بنێسی... جاروبار ئەم بیستەوە کە قسەکانی منی ئاوەژووئەکرد و لە شێوەیەکی ناڕەوادا بە ئارەزووی خۆی ئەیکردە بنێشتەخۆشەی ژێرددانی و لە هەر شوێنێك دانیشتایە خەریکی لیخنکردنی قسەکانم بوو، ڕۆژێك بە ڕێکەوت دیم، ویستی خۆیم لێ گێل بکا گوایە نەیدیوم، بانگم کردو. لەچەقی حەوزەکەی ناو بازاڕی سلێمانیدا وەستانم پێم وت: منیش ئەتوانم لەم لاوئەولا دانیشم و باستبکەم بەڵام ئەوە کاریکردە نییە، هەرچییەکیشت وتوە، هەموویان بۆ گێڕاومەتەوە، ئەو قسانەی تۆ کردوتن، فریان بەو قسانەی منەوە نییە کە لای تۆکردوومن. بە هەرحاڵ کاکی خۆم: کاسپی و پێکەوەکارکردن بە زۆرەملێ نییە، خۆ من هیچ ڕێیەکم لە تۆنەگرتووە و ڕزق و ڕۆژیش بە دەست خوایە. هەرچییەکیش بەرامبەر من ئەیکەیت ئاسنی ساردکوتانە و قسەی ڕاستیش هەر ڕوونە وەك چاوی قرژاڵ و بەتۆ لێڵ نابێ. ئەوا ئێستا تۆ بۆ خۆت جەمسەری کارێکت لەگەڵ چەند شەریکێکتا بە دەستەوەگرتووە، ئەمەی تۆ ئەیکەیت بۆ خۆشت و بۆ ئەوانیش خراپە و ئەنجامەکەی قازانج سەرمایە ئەخوا. نەك هەر ئەوەندە، ئەمەی تۆ ئەیکەیت وەزنی بۆ منیش هەیە، چونکە بە چاووڕاوو هاشەو

هوشەی دەم و درۆ و دەلەسە بۆڕی ژەنی و دەهۆڵ لێدان و کەڵەك بازییەوە نایەڵی بە پێی بۆچوونی خۆم، ئەقڵم بخەمە کار و دەستم لە کاسپییەك گیربێ، سا بەڵکو خوایە پارووپەك نانی حەڵاڵی بۆ خۆم و سوودێکی بۆ ئەو میللەتە تیادابێ.

زەمان هات و زەمان چوو. ڕۆژێك لە بەغدا یەکترمان دییەوە. دەستێکی خستە ناو دەستمەوە و دەستەکەی تری خستە سەرشانم و وتی: ئای فلانەکەس، قسەکانی تۆ گەلێکی ڕاست دەرچوون، خۆزگە بەقسەی تۆم ئەکرد و پێکەوە دەستمان ئەدایە کاسپییەك، ئێستا دنیا لە جێیەکی تر ئەبوو!!

## ٣ـ بەهەشت:

لە پۆلی چوارەمی سەرەتایی بووم، حەزم ئەکرد هەموو ڕۆژێك دەرسی(دین)مان هەبێ، مامۆستایەکی ڕووخۆش و دەم و کاوێژ خۆشمان هەبوو باسی بە هەشت و جەهەنەمی بۆ ئەکردین. کە باسی نێڵەنێڵی ئاگری جەهەنەمی بۆ ئەکردین کە چۆن ئەگەر یەکێك نوێژنەکات و ڕۆژوونەگرێت و سەر بە فەرزی خوادا نەدا ئەوا ئەچێتە ئەو ئاگرەوە و پیرەئاگریش هەر لە دوورەوە شالاوی بۆ ئەهێنێ و وەك دووپشك ئەچزێ بە لەشیداو وەك رۆنی داخکراو ئەو لەشەی قرچ و هوڕی دێ. کەوای ئەوت تووکی سەرم هەڵ ئەساو سام ئەیگرتم بەڵام بەرەکەتدا ئەم ترس و سامە ئەوەندەی نەئەخایاند چونکە زوو لە باسی جەهەنەم لای ئەداو ئەچووە سەرباسی(بەهەشت). وای خۆشئەکرد و واخۆش باسی ئەکرد، قورئان بە هەقت، وات ئەزانی خۆت لەوێیت و هەمووشتێك وابەبەرچاوتەوە. کەباسی میوەخۆش خۆشەکانی بەهەشتی دەکرد لە خۆمەوە دەمم گەزێك دائەپچڕی، کە ئەهاتە سەرباسی ناسکە هەرمێ دەمم ئاوی تێئەزا. ئای لەو خوتوکەو تەزوەخۆشانەی بە لەشمدائەهاتن و ئەچوون، کاتێك کە ئەیوت: لە بەهەشت حەز لە چی بکەیت، حەز لە چ خواردنێك بکەیت، دەمودەست بەرێکوپێکی و خاوێنی والەبەردەمتا، من لەسەر کورسییەکەی خۆمەوە خواردنە خۆشەکان ئەهاتنە بەرچاوم کە ئەهاتە سەرباسی باخ و باخات و خوڕەی ئاو و لارولەنجەی دار و درەختی بەهەشت، کە باسی(هاوار و هاژەی کەف چوڕێنی چەم)ی

ئەکرد وام ئەزانی لە سەیرانم و پێم ناوەتە ناو جۆگەو ڕووبارێکی بچووك و خۆشەوە. باسی باڵندەجوان و ڕەنگاو ڕەنگەکانی بەهەشت و(جریوە و جوکەی باخ)ی بۆ ئەکردین لە جیاتی دڵێ سەت دڵ حەیرانی ئەبوو.

لە دڵی خۆما ئەم ووت: ڕاوەستە با گەورەبم مەرجبێ ئەبێ هەمیشە نوێژبکەم و ڕۆژ و بگرم. بۆچی بۆ خۆم نەچمە ئەو بەهەشتە خۆشەوە و بە ئاگری جەهەنەم بسووتێم؟! نوێژ و ڕۆژو و ئەوەندە کارێکی گران نین.

کەچی کە گەورەبووم، نە نوێژم کرد و نە ڕۆژووم گرت!!

بەیان ژ١٣١ مایسی ١٩٨٧

# منالّ و مەمك و بنێشتەتالّ

زانایانی سایكۆلۆجی كۆمەلآیەتی و پسپۆرانی گەشەكردنی نەفسی منالّ ئەلّێن: كەمنالّ خووی بە نەرێتێكەوە گرت و ئەوخووە بووە مایەی جێبەجێكردنی پێویستییە بایۆلۆجییەكانی"یا بلّێین وەكو منالّی شیرەخۆرە" ئێمە نابێ بێین سواری سەری ئەو منالّە ببین و داوای لێبكەین لەچاو تروكاندنێكدا ئەوخووە تەرك بكات، چونكە ئەگەر وامانكرد منالّەكە تووشی پیش خواردنەوەیەكی توندوتیژ دەبێت كە دەبێتە مایەی رۆچوون و لادانی نەفسی لە دوارۆژدا و ئەم لادانەشی بە شێوەیەك دەبێت كە هەستی پێ ناكات چونكە لە رۆژانێكدا تووشی توندوتیژەكە بووە كە هێشتا فێری قسەكردن نەبووە كە قسەكردنیشی نەزانیبێت نەی توانیوە بیربكاتەوە. لەبەرئەوە ئەو زاناو پسپۆرانە ئامۆژگاری دایك ئەكەن و ئەلّێن ئەبێ منالّ بەشێنەیی لە شیر ببڕێتەوە بەشێوەیەك كە بتوانێت وردە وردە و لەسەرخۆ خووە پێشینەكەی بگۆڕێت نەك بێن بە بنێشتەتالّ و تالآوی تر مەمكییان بهەنوون و بیانەوێ یەكسەر منالّەكانی لە شیر ببڕنەوە.

لە بیركردنەوەیەكی ئاوادا لە منالّێكی شیرەخۆرە لە پێش لە شیربڕینەوە و لە دوای لە شیربڕینەوە بە زۆر و بە بنێشتەتالّ، ئەم پەخشانەی خوارەوە هاتە بەرهەم.

منالّە خڕوخەپانەكە جارێكی تریش لەكۆشی گەرم و گوڕی دایكیدا خۆی گرمۆلّەكردو دەستیكرد بەگڕوگالّ و دەستوپێ هاویشتن و خەنینەوە، چەند جارێك هەلّپەی بۆ سنگ و بەرۆكی دایكی برد و چاوی گێڕا، هێشتا ئەو بە تەواوی مەمكی بۆ دەرنەهێنابوو، ئەم لێرەوە دەمی بۆ كردەوە، ئەتووت خوا ئەو دەم و مەمكەی هەر بۆ ئەوە دروستكردووە كە ئاوا لەگەلّیەكدا بچەسپێن. هەنگی لێو نیشتەسەر گولّی گۆی

مەمك و بینی پێوەناو بەمژێك و دووان وازی نەهێنا. منداڵ بەدەم شیرخواردنەوە سەرخەوێکی شکاند و کۆتری چاوی وردە وردە لە هێلانەی پێڵودا هەڵنیشت.

جاروبار بەدەم شیرخواردنەوە بزەیەك لالێوی ئەگرت و(بەدەم مەلایکەتەوە پێئەکەنی)... بۆ پێنەکەنێت؟!! "سەری ناوەتە سەر دڵێکی نەرم و بەخەوی سەرباوەشێکی گەرم هیلاکی لەشی دەرئەکات".

بۆ بزە لالێوی نەگرێت؟!! گوایە کێ لەو خواپێداوترە؟! لە کۆشێکی پیرۆزەوە بەلێشاو موچڕك و تەزوو هەڵئەقوڵێن و بەلەشی ئەمدا ئەگەڕێن و ئەپرژێن.

لە مەمکێکی خواکردەوە تنۆك تنۆك شیری پاك بە گەرووی لە لاسکی نێرگز ناسکتردا ئەچۆڕێتە خوارەوە تا(عافێتی گیانی بێو بە بازۆڵەی شانی بێ).

بۆ نەخەملێت؟! باوەشێوا بە چیای سەفینەوە... بەڵێ چیای سەفین و بگرە قایمتریش! بۆ منداڵ کۆشی دایکی خۆی لە قایمی و ئەمینیدا ئەگۆڕێتەوە بەچیای سەفین؟!!

بۆ فریشتەکان باڵەفڕێ نەکەن و نەبنە خەرمانەو دەوری گلۆپی کوڵمی نەدەن و لەدەوری نەگەڕێن؟! بە شیرێك گۆشەئەکرێت لە گەزۆو مازو حەڵاڵتر، لە گوڵاو بۆن و بەرام خۆشتر.

چەند مانگێکی پێچوو....

منداڵە خڕوخەپانەکە جارێکی تریش زۆر بە ئاسایی و دڵنیایی چووە وە کۆشی گەرم و گوڕی دایکی....

دایکی جارێکی تریش سەری بەسەردا شۆڕکردەوە و مەمکی بۆ دەرهێنا تا بینێت بەدەمییەوە.

منداڵەکە دەمی بردە پێشەوە و زبانی پێش لێوی تەکانی دایەخۆی تا زووتر بگاتە مەبەست لەپڕ وەك دووپشکێك بەسەری زمانیدا بچزێت دەمی بردە دواوە و زریکەی لێهەستا، گریانەکەی نیشتەوە، چاویکردە نیشانەیەکی پرسیار و بڕییە دایکی... سەرسامی دەمی داپچڕی.. خورپەی دڵ جۆلانەی لەشی ئەهێناو ئەبرد...

چۆن هەروا بە ئاسانی واز لە سەرچاوەی خۆراك و پێ بژیوی بێنێت؟! ئاخر چۆن..؟! بۆیە لێوی هەر لە خۆیەوە لە هەواری جارانی نزیکبووەوە و ئەمجارەش بەرمەمکی دایکی کەوتەوە. بنێشتەتاڵ وەك زەردەواڵە بەلێوە ئاڵەکانیدا چزا... هەنیسکێك بەربینیگرت و وەك ژیوکەوان هاتەوەیەك، وەك هەنگێکی هێلانە لێ وروژاو لە دەوروپشتی دایکی هەرهات و هەرچوو... پیشی خواردەوە و گینگڵیدا بەڵام بەهیچ چوو. هاواریکرد، لالایەوە، قیژانی، کەس دادی نەپرسی شەقی برد، تەقیکرد، لەتکەوەچوو کەس بەزەیی پیادا نەهاتەوە.

زمانی نەبوو تاچی لە دڵیدایە هەڵیبڕێژێت.. بەڵام لەشی بووبوو بەنیشانەی پرسیارێکی گەورە و هاواریانکرد بۆ؟

چیاکانی کوردستان دەنگیان ئەدایەوە بۆ..؟

ساماڵ پرسیارەکەی ئەقۆستەوە... بۆ؟

گوڵاڵە... گەزیزە... چنور... ڕنۆبەفر، هاوریانئەکرد بۆ..؟!

تاڤگە، قەڵبەزە، سروەی بەیان هاواریان ئەکرد بۆ؟!

شوانکارە، جوتیار، کۆچەری، ریش سپی هاواریان ئەکرد بۆ

منالێك تازە زمانی پژابوو ئەیوت... ئێدە بۆۆۆ....؟

تەنانەت گورگەکانیش ئەیان لووراند... بۆۆۆ؟! .... بۆۆۆۆ

ڕاست ئەکەن بۆ؟

گوایە لەم تالاو بە قورگاکردنە زیاتر، ڕێگای تر نییە بۆ منال لە شیر بڕینەوە؟!

بەیانی ژ/١٣-١٩٧٤

# منالّ و خەنجەر و خوێن

بەیانی ڕۆژێکی هەینی، کۆمەڵە منالێکی پێنج شەش ساڵەو بەرەو ژوور تریش لەبەر دەشتی بەردەمی ماڵەکانیاندا تۆپێنیان ئەکرد. ئەوەندەی پێ نەچوو منالێك پێی کەوتە بەر پێی ئەویتریان و نوچێکیداو بە سەرداکەوت و چەناگەی چوو بە توێژاڵی بەردێکی نووك تیژدا و زامداربوو و خوێن فیچقەی کرد، کە هەستایەوە یەخەی ئەوەی گرت کە وای لێکردوەو بەنیازی هەقی خۆسەندن کەوتە پەلاماردان و زرم و کوت دەستی پێکرد. دەم و چاوی یە کتریان داشاخان و کراسیان بە بەر یەکترەوە نەهێشت و شلکوتی مەرگی یەکتریانکرد و هەناسە بڕکێیان پێکەوت، ئەوەندە یەکتریان هێناوبرد، هیلاکبوون و هێزیان لەبەر بڕرا، بۆیە هەر کە منالەکان بە سەریاندا دابارین و کەوتنە ناوبژی ئەمان دەستیان بەردا و بە هەناسە بڕکێ و چلّم هەڵلوشینەوە لە یەکتر جیابوونەوە. ئیتر یاری ناخۆش بوو و ئاش بەتاڵی لێکراو ڕۆیشتنەوە ماڵەوە.

ئەوەندەی پێ نەچوو باوکی چەناگە زامدارەکە، خەنجەر بە بەرۆك و دەم پڕ لە هەڕەشە و گوڕەشە هاتە دەرەوە و بەر دەرگای بە ماڵی ئەوی تریان گرت، باوکی ئەمیش بەرەنگاری وەستایەوە و ژنانی هەردوولاش کردیان بەو ڕۆژەی قەرەوەیسی تیادا کوژرا. قسەی ناشرین و جوێن وەك هەورە تریشقە چەخماخەیان ئەداو گڕیان لێ ئەبووەوە، ئاگری شەڕ تا ئەهات خۆش ئەبوو و شەیتانی ئاشووب لە خۆشیدا تا ئەهات پلی ئەتەقاند و نینۆکی لەیەك دەسوو، لافاوی رق سەریکرد و دەستی کەللەشەقی برا بۆ خوێنرێژی خەنجەر، پیرە خەنجەر لەچاو تروکاننێکدا وەك ڕەشمارێك فیشکەی کرد و لە کالان هاتە دەرەوە و لە کورتە کە لەکەی بەردەرگای ماڵ پێگیرا و توندبوو و بە دلۆپێ خوێنی سوور شادبوو و دەمی پێوەنا تا تینوێتی شکا. پیرە حەنجەر کاتێك دەمی لە خوێن بەردا کە کابرا هەر قۆزی تەنیا یەك(ئای) و یەك دوو رەتی پێ مابوو، ئیتر

وورده ووردە سارد بووەوە و هەر لە ئاستی خۆی لە خوێنی خۆیدا گەوزا و دوای دوو سێجار لنگەفرتێ دەمی لێك ناو چاوی زەق بوو.

پیاو کوژ گیراو لە بەندیخانە توندکراو ژن و ماڵەکەشی بەترس و لەرز گەڕانەوە ماڵەوە و خرِ دەرگایان لە خۆیان داخست.

پاش نیوەڕۆیەکی درەنگ خەڵکوخوا خەریکی بەڕێکردنی تەرمی کوژراوەکەبوون. لەولاشەوە مناڵەکان جارێکی تر خڕبووبوونەوە و خەریکی تۆپێن دامەزراندن بوون، چەناگە زامداری لەمەڕ کابرای پیاوکوژ و کوڕی کابرای کوژراویش هاتبوون بۆ یاری، ئەویان لە تەنیایی و ترس و لەرزی دایك و براو خوشکەکانی وەڕزبوو بوو و خۆی دزیبووەوە و ئەمیشیان لە گریان و شین و شەپۆڕ و لاوانەوە پەست بووبوو.

کە تەرمی کابرای کوژراو بە بەردەمی دەشتەکەدا بەرەو گۆڕستان ڕەتبوو، چەناگە زامدار و باوك کوژراو زۆر دەمێك بوو ئاشت بووبوونەوە و وەك نە بایان دیبێت و نە باران لەگەڵ مناڵەکانی تردا وازیان ئەکرد و سەرگەرمی تۆپێن بوون!!.

بەیان ژ/١٨/ت١/١٩٧٤

# کاتێ هەڵۆ بەرز دەفڕێ

لەو ڕۆژەوە خەڵك لەسەر ئەم گۆی زەوییە دەژین، کە سانێکمان تێداهەڵدەکەون، هەریەکەیان جەربەزە و کارزان و ڕێبین دەبێتە پێشەنگی دەوروبەرەکەی بەشکستی و سەر شۆڕی و خۆ بە دەستەوەدان و تفی خەجاڵەتی قووتدان ڕازینابێ. ئەگەر بۆ جارێك سەرنەکەوت، دەزانیت سوار تا نەگلێ نابێ بە سوار ئەگەر ژیا ئەوا سەربەرزانە دەژی و ئەگەر مردیش ئەوانەمرەو لە دڵی خەڵکیدا دەژی.

بەهەر یەکە لەم هەڵکەوتوانە لە ئاستی خۆی و بۆ مەبەستی خۆی دەڵێن(هەڵۆ).

ئەم(هەڵۆ) یە بەپێی بەخاك و نیشتمانی خۆیەوە، لەگەڵ دەوروبەری خۆیدا دەژی. ئەمە ئەو(هەڵۆ)یە نییە کە پیرەمێردی شاعیر دەڵێ:

لەسەر بەردێ، هەڵۆیە هەڵفڕێ، کەوتە هەوای بێخەم

هەوایەکی غروری کەوتە سەر، تا کەوتە سەر عالەم

ئەم(هەڵۆ)یانەی کاك ئەحمەد سالار هەموویان خەم خۆر و مامە خەمەی ئەم خەڵکەن، نازانن غروری لە خۆبایی بوون چییە، بەرزدەفڕن بۆ هەق وەدەست هێنان، بۆیە بەدەم ڕێگاوە سەر بەرزانە گۆرانیی سەربەرزی دەڵێین یان وەکو سالار دەڵێت:

کاتێ هەڵۆ بەرز ئەفڕێ

گۆرانیی سەربەرزی ئەچڕێ

(هەڵۆ)کانی کاك سالار هینی ناو ژیانی کوردەواریی خۆمانن، بۆیە لە سەرەتاوە لەسەر شانۆکە، ماڵە کوردێکمان نیشان دەدا بریتییە لە جاجم و بەڕەو پێخەوی خۆمانە، دەف بە دیواردا هەڵواسراوە، بەڕە ڕاخراوە.

ئەکتەرەکان چوونە سەر شانۆ بە چەپڵەلێدان و گۆرانیی(گوڵاڵە سوورەی سەر کوڵمی یارم)ەوە ئەمەش بۆ ڕێگا خۆشکردن بۆ دیمەنی یەکەم سوارەی(هەڵۆ) ئەوەندەی یەك دنیا(گوڵێ)ی خۆش دەویست و شەیدای گوڵاڵە سوورەی کوڵمی بوو، بەڵام

بەهەموو عەزمێکەوە بە(گوڵێ)ی دەوت:"گوڵەخان نیگەران نەبی، جارێ لەگەڵ خاکدا خەریکی دڵداریم) دیسان دەیووت(هەڵۆ)یەکجار ئەمرێ و یەکجار لە دایکدەبێ، خوا ئەبێتە میوانی هەڵۆکان لێرەدا گۆرانی بێژان قوربانی قسەکانی(سوارە)دەبوون و گۆرانی(هەی جان هەی جان)یان دەوت، پێش ئەوە گۆرانی بێژ لەسەر هەوای گۆرانییەکانی(سێوە)ی گۆرانی بێژی کۆیی دەیوت:"خودایە سەریانخەیت، ئەوی عەشقێکی پاکە" گۆرانییەکانی کورت و هەمەڕەنگبوون.

لە دیمەنێکی دیدا، مەحموود خدری هەمەوەند وەك هەڵۆیەك، رادەپەڕێ و هاوار لە هاوڕێکانی دەکات: فیشەکدان لە خۆدەن، پەلاماری دوژمن دەن، کاتێك دەپێکرێ، خەریکی گیاندانە، دوژمن دەگاتە سەری و پێی دەڵێت: بەراز!!، مەحموود بە دەم گیانە لاوە دەخولێتەوە کوڕگەل و دەڵێت قیتمکەنەوە، ڕوودەکاتە دوژمن و دەڵێ:"بەراز چەند قیتە لە بەرامبەر سەگدا!!."

لە دیمەنێکی دیدا میللەت بێزاری لە فەرمانەکانی عوسمانلی دەردەبڕێ، تەنانەت جاڕدەری فەرمانی سوڵتان دەگرن و شلکوتی مەرگی دەکەن پێی دەڵێن:"فەرمان.. فەرمان... فەرمان نەبڕایەوە؟!!"، و لەدیمەنێکیدیدا بەرگەگرتن و تاڵی و سوێری ژیان فێری خەڵکیدەکەن، دیمەنەکە ڕەمزیە، لە نێوان گولاڵەو بارەشدا.

گولاڵە دەڵێ:"گولاڵە لەسەر بەردی ڕەق و دواتروپك دەمدەکاتەوە": بە جووڵانەوەیەکی هونەری بارەشێکی توند و تیژ دەهێننە بەرچاوی سەیرکەران، ئەمە تێکەڵ بە دەنگێکدەبێ کە دەڵێ:"ڕەشەبا گولاڵەی فێرکرد کە ئەبێ ڕەگ لە ڕەقەندا داکوتێ".

کاك سالار جارێکی دی باسی هەمەوەندەکان دەکات و ئەو دیمەنە نیشاندەدا کە کاتی خۆی ڕەهەند و ئاوارەی(بەنغازی)ی (لیبیا)کران، چۆن لە ساڵی١٨٥٦ لەوێ ڕاوێژ بە فەقێ قادری هەمەوەندەکەن و بڕیاری گەڕانەوە دەدەن، بە نیشانکردنی ئەستێرەکانی ئاسمان، ڕێدەگرنە بەر و دەکەونە ڕێ، هەر ڕێ دەکەن، هەر ڕێ دەکەن،... (سوارە) دەڵێت:"بۆنی مێخەك بەندەکەی بەرۆکی گوڵێ دەکەم. ئای لە من و وەی لە گوڵێ و داخ لە ئاوارەیی" لێرەدا جێی خۆی بوو دەرهێنەر شیعرە بەهارییەکەی حاجی قادری کۆیی

بێنێتەوە یاد، بۆیە شیعری(وتم بە بەختی خەواڵو بەسیەئەتوبی خوا) خوێنرایەوە مەحموودی خدر دەڵێت"مشتێ خۆڵی نیشتمان تابێکەوە سورمەی دیدەم" لە دیمەنێکیدیدا سوارە لە ڕێگا خەون بە(گوڵێ)وە دەبینێت.

یەکتر دەبینن و گفتوگۆدەکەن، دەوری خۆیان جوان دەبینن، سوارەکە لە خەونەکەی دەبێتەوە، بەدەم هاوارکردن لە گوڵێوە دادەپەڕێت، دیسانەوە دەکەونە ڕێ. سالار و یاریدەدەرەکانی ئەویان بیرنەچووە کە لێرەدا بە گۆرانیی(خاڵەی ڕێبوار) خەڵکەکە لە ئەکتەرەکان نزیك بکەونەوە ئاوارەکان لە خاك و وولات نزیکدەبنەوە، مەحموودی خدر دەڵێت کورینە بۆنی خاکدەکەم، لە دەور و بەری وڵات کابرایەك دەبینن، بانگی لێدەکەن کەچی کابرا هەڵدێ و دەڕوات، یەکێك لە ئەکتەرەکان دەڵێت"ناهەقی نییە داگیرکەر وای لێکردوون تەنانەت سڵ لە سێبەری خۆشیان دەکەنەوە".

دیمەنێکی دلگیر و پڕمانا بانگی بەیانییدا، ڕێبوار و ئاوارەکان دەستیانکرد بە نوێژکردن و لە خوا پاڕانەوە، هەندێك لە سەیرکەران بەو بانگ و نوێژە پێکەنین، دیارە ئەوانە لەو دیمەنە نەگەیشتن، ئەوە بۆ ئەوەیە کە بڵێین: ئێمە میللەتێکی موسوڵمانین، کافر نیین، خواناسین لە کەس ناکەوین و نامانەوێ کەس لێمانبکەوێت، بۆ لە خۆت و خۆڕایی کافرماندەکەن؟! کە ئاوارەکان دەگەنە نیشتمان، کانیاوێکیان دێتەڕێ، هەموو بەیەکجار دەمدەنێنە ئاوەکە و بینی پێوەدەنێن، ئەمە لە مەیدانی دەرهێنانی شانۆگەریدا سەرنجێکی وورد، پەیوەندی هاووڵاتی بە خاك و ئاوەوە نیشاندەدا.

دیمەنی هەڵۆیەکی دی، شێخ سەعیدی پیران، نوێنەری عوسمانلی پێی دەڵێ: ئاژاوەچی، ئەویش هەڵۆ ئاسا بە وەڵامێکی مەردانە و کوردانە دەمکوتی دەکات. دوایی هەڵدەواسرێت، تەنانەت(عەرەب عیدی)ی لاوك بێژیش، بڕیاری هەڵواسینی بۆ دەردەچێت.

مۆسیقاژەنەکان مۆسیقایەکی گونجاو لەتەك تەرمی بە شکۆی شێخ سەعیددا لێ دەدەن. دیسان شانۆکە دەگەڕێتەوە سەر دیمەنێکی دیی(گوڵێ)ی خۆشەویستی سوارە،

عوسمانلییەکان(گوڵێ)دەگرن و دەیانەوێت بیبەن بۆ(ئەستانە) لێرەدا گوڵی بە تەنیا لەسەر شانۆ دەوری خۆی جوان دەبینێ هاوار لە(سوارە)دەکات کە سوار پێدەزانێ وەك هەڵۆدەکەوێتە خۆی، بە یاریدەی جوامێر و هاوڕێکانی، گوڵێ لە دوژمن دەسەندنەوە لێرەدا سوارەی خاوەنی عەشقی پاك و بێگەرد بە گوڵێ دەڵێت:"من لە تەماشای چاوەکانتا، هەموو نامەکانی خوا دەخوێنمەوە!" ئەم یەك دوو ڕستەیە خانەیەکی تایبەتیی لە مەیدانی نووسینی ئەدەبیدا هەیە.

(ئەحمەد هەردی)ی شاعیر دەڵێ:

"خۆشەویستی وا کە نامەی خوایە بۆ پێغەمبەران"

دیسانەوە دیمەنێکی دیی مەحموود خدر نیشاندەدرێت کە بە کاپتن(بۆن)پێدەکەنێت و قسە هەڵۆئاساکانی بەرامبەر دوژمن دەکات. ئەم ئەکتەرەی ئەم دەورە دەبینێ لە دەورەکانی تریشدا هەر دەرکەوتوو و سەرکەوتووە.

دیمەنێکی دی: یەکێك لە ئەکتەرەکان هەر خۆی بە تەنیا وەکو لێپرسراوێکی عوسمانلی پرسیار لە(نالەپێ پان)دەکات و بە سەریدا دەشیرێنێت. هەرخۆشی بە ناوی(نالە)وە بەو پەڕی گاڵتەپێکردنەوە وەڵامی دەداتەوە. ئەم ئەکتەرە هەردوو دەوری جوان دەبینێت(نالەپێپان)یش لە ئاستی خۆیدا هەڵۆیەکبووە، هەمیشە لە ئوردووگای عوسمانلییەکانی دەدا، لە کاتی بە پەتاکردنیشدا ئاواتی خواستبوو کە پەتی قەنارەکەی سووربێ. دوا(هەڵۆ)ی شانۆگەرییەکە(شێخ مەحموودی حەفید)ە کە لەشەڕی(دەربەند)دا دەپێکرێ و دەگیرێ و دەبرێتە بەغداو(گرین هاوس) بەناوی(بەریتانیا)وە تاوانی ئەوەی دەداتە پاڵ کە چەکی بەرامبەر ئینگلیز هەڵگرتووە و بە فەرمانی ئەم(عیزەت نەجیب) ئاڵای ئینگلیز دڕاندوە، شێخ مەحموود پڵنگ ئاسا لێی ڕاپەڕی و چاوەکانی دەبنە

پشکۆو لەڕقدا پریشکیان لێدەبووەوە، هیچی پێنابێ جامانە و کڵاوەکەی لە سەریدەکاتەوە و دەیدا بەسنگی(گرین هاوس)دا. ئەکتەرەکان لەگەڵ تیپی مۆسیقادا هەموو یەکدەنگ بەم شیعرە بە ئاوازەوە کۆتایی بە شانۆگەریی یەکەدەهێنن: (کاتێ هەڵۆ بەرز ئەفڕێ گۆرانیی سەر بەرزی ئەچڕێ).

ئەم تێبینییانەی خوارەوەش شایانی پیشاندانن:

١ـ ئەکتەرەکان ژمارەیان لە چاو شانۆگەرییەکەدا کەمبوو، چونکە زۆربەیان چەند دەورێکیان ئەبینی، ئەمەش کارێکی بە جێبوو، لە کاتێکداکە. ئەکتەر بۆ هەموو دەورێك وەکو پێویست بەدەستئەکەوێت ئەم ڕێگاگرتنە کارێکی باشەو کارناکاتە سەر ناوەڕۆك و مەبەستی شانۆگەریەکە.

٢ـ گۆرانییەکان هەمەرەنگبوون، پەیوەندیی تەواویان لەگەڵ ڕووداوەکاندا هەبوو، مەیلی بینەرانیان تازەدەکردەوە. بۆیە کە شانۆگەرییەکە تەواوبوو، خەڵکەکە هێشتاگوڕی خۆیانبوون، دەبوو لە موحاکەمەکردنی(شێخ مەحمودی حەفید)دا لاوکەکەی(کاویس ئاغا) کە بۆ شێخی وتووە، بوترایە.

٣ـ هەمەوەندیەکان ڕەهەندە و ئاوارەی شاری(بەنغازی)کران لە لیبیا شایانی باسە لێرەدائەوە بخەمەوە یاد کە تائێستاش لە سلێمانی و هەمەوەندو ئەو دەوروبەرانە، قسەیەك هەیە کە بۆ شوێنی زۆر دووردەکرێت و دەوترێت: (ئەوەندە دوورە لە بنی عێزە) ئەو(بنی عیزە) شاری(بەنغازی)یەکەی (لیبیا)یەو هەمەوەندە دەربەدەرکراوەکان کە هاتنەوە لە جیاتی(بەنغازی) دەیان وت لە(بنی عێز)بووین.

٤ـ هیچ شانۆگەرییەك نییە کە ئەکتەرەکانی لە هەموو دەورەکانی خۆیاندا لە یەك ئاستدابن، بۆیە دەوری(مەحمود خدر) و(گوڵێ) و(سوارە)و (نالە پێ پان)م بە باشدایە قەڵەم. دەنا تێکرا لە دڵی خۆمدا هەستم بە ڕەزامەندی لە هەموو ئەکتەرەکاندەکرد. دڵم بە تیپی مۆسیقاکە زۆر خۆشبوو کاکی گۆرانی بێژ سەرنجی هەمووانی ڕاکێشا لەو کاتەدا کە دڵم بە شانۆگەرییەکە ئەکرایەوە هەموو(هونەرییەکان)م دەهاتنە پێشچاو کە لەکاتی وادا چونکە لەبەرچاونین دەبنە(سەربازی بزر)!.

٥ـ دەبوو کاپتن بۆن هیچ نەبوایە لە جیاتی(مشکی) کلاوێکی ئەفسەریی بنایە سەری کە ئەمە هەر زۆر بە ئاسانی لەسەر شانۆکە جێبەجێدەبوو. هەروەها لە کاتێکیشدا کە دەبووە قوماندان یان کار بەدەستی عوسمانلی دەبوو گۆڕانیك لە جلك و بەرگدابووایە.

٦ـ بەداخەوە(دکتور ئیحسان فوئاد) لە لاپەڕە(٤٥)ژمارە(٢)ی گۆڤاری(ڕەنگین)دا (نالە پێ پان)ی بە خراپەکار داوەتەقەڵەم(ناڵە) شەنەك(نالە) پێم وایە دکتۆر(نالە)ی

نووسیوە چونکە کورتکراوەی(نادر)ە بەلام لە گۆڤاری(ڕەنگین) بە هەڵەبۆیانکردووە بە(نالە) ئەگەر هەڵەی خۆشی بێت دەڵێم لای ئێمە نادرو(خدر)دەکەنە(نالە) و(خلە).

٧ـ دەبوو گۆرانی بێژ سەروپێچی بەسەرییەوە ببەستایە، چونکە ئەو کاتە مێژوویییانەی ئەو گۆرانی یان تێدا دەڵێت، کەس بە جلکی کوردییەوە سەری ڕووتنەبووە.

٨ـ ئەوانەی شانۆگەرییەکەیان دی، یان ئەم نووسینە دەخوێننەوە سەرنج دەدەن کە دیمەن و ڕووداوەکان وەك هەڵقەی زنجیرەیەکی مێژوویی یەك دوای یەك نەهاتوون، پێشئەوەی من ئەمە بە کاك ئەحمەد سالار بڵێم خۆی پێی وتم، زۆریشم پێخۆشبوو کە خۆی ئەوەی دەزانی و دەیوت ئێمە مەبەستمان ئەوە بوو کە دیمەنی هەڵۆکان بخەینە پێشچاو نەك ئاگاداری زنجیرەی مێژوویی ببن، دەنا ئەگەر مەبەستمان زنجیرە مێژووییەکە ببوایە، شانۆگەرییەکەمان بە جۆرێکی تر دەخستەڕوو.

<u>ڕۆژنامەی(هاوکاری) ١٩٨٨/٢/٢٢ ژمارە (٩٥١)</u>

# بەشی خەنجەرە

لە کۆلانەکەی ماڵی خۆمانا دوێنێ نیوەڕۆ
نامەکەت داپێم وەرمگرت هێواش سووك و لەسەرخۆ

- - -

تومەس لە سەردا لە پەنجەرەوە برا گەورەکەم
چاوی لێیە من والە خوارەوە دڵداریی ئەکەم

- - -

کە گەڕامەوە چاوی سووربوو بوو وەکو گۆمی خوێن
هات بە پیرمەوە قاچی پڕ لە شەق دەمی پڕ لە جوێن

- - -

نامەکەی گرتی قوڕی ڕەشی خەست بەسەرماکرێت
تۆشی باش ناسی ئەیووت: ئەی کوژم هەرکە دەرکەوێت

- - -

ئاگات لە خۆتبێ خۆت زۆر دەرمەخە گیانی شیرینم
با من بکوژرێم تۆ ڕزگارتبێ، ڕووناکی ژینم

- - -

لە بەختی خۆمان لە وولاتێکداین کەوا دڵداریی
خیانەتێکە بە دیاری ئەبرێت بۆ تاوانباری

- - -

ساکێو بیدی خواکەی دڵداری بڕۆ شەقبەرە
لە کوردستانا ئەوەی تۆی پەرست بەشی خەنجەرە

ڕۆشنبیری نوێ ژمارە(٠) ١٩٧٣/١١/١١

# ئەمزانی بۆ، بۆچ تۆران؟

فەرەیدوون عەلی ئەمین

لەم جەژنی قوربانی ڕابوردووەدا سەیری تەلەفزیونم ئەکرد. ئۆپەرێتێکی پیشاندا کۆمەڵە منداڵێك بە زمانی عەرەبی بەباوکیان ئەوت: بابە گیان لەم جەژنە خۆشەدا قسەی خۆشمان بۆ بکە. باسی ئەو خونچانەمان بۆ بکە کە تازە دەم ئەکەنەوە گوڵمان بۆبکەرەوە شیعرمان بۆ بخوێنەرەوە.

منیش ویستم هەر بە بۆنەی ئەو جەژنی قوربانەوە شتێك پێشکەش منداڵانی کوردبکەم. هاتم لە باخی خەیاڵ چەپکە گوڵێکم بۆ چنین لە هەموویان دیارتر گوڵەباخێکی تۆبزی سووربوو، ئەوەندە سووربوو ئەتووت خوێنە. چەپکە گوڵەکەم بەتاڵێك لەو (چنورە) بەست کە پیرەمێردی شاعیر لە بەرامبەر زوڵفی خۆشەویستەکەیدا بەمات و پەشێوی ئەزانێ.

شمشاڵێکم هێنا. لە دڵی خۆمدا ئەمووت ئەوەندە بە سۆز شمشاڵیان بۆ لێئەدەم، خەڵکی وابزانن دەروێش عەبدوڵاکەی لەمەڕ گۆرانی شاعیر زیندوبۆتەوە. کۆمەڵە بووکەشووشەیەکی جوان و نایابم بەستە چارۆکەیەکەوە توند بەستم.

ئەوەندە حکایەتی خۆش خۆشم بۆ ئامادەکردن ئەمووت هەردەستم پێکردن چاوم لێناتروکێنن تا تەواویان ئەکەم. لە دڵی خۆشمدا دەمووت ئینجا ئەگەر هەر بەوەندە ڕزگارم ببێ باشە کە ئەڵێیت چوارپێنج جار حیکایەتەکانم پێ دووبارەناکەنەوە، بیرم لەوەئەکردەوە کە لە قسەکردن لە گەڵیاندا ووشەی ناسك ونیان بەکاربێنم، زۆر وشە ئەهاتنە سەرزمانم ئەمووت لاچن ئێوە زبرودرشت و ناقۆڵان بەکەڵکی مناڵان نایەن، ئەوان بەو وشانە ئەگەشێنەوە کە وەك خۆیان ناسك و تەڕو نەرم و نیان و خڕو خەپانن، بۆیە وشەی وام بۆ دۆزینەوە کە دڵیان خۆشکات، بەستەی وام بۆ دیبونەوە کە بیانهێنێتە هەڵپەڕکێ و چەپڵەڕێزان خواخوام بوو زووبگەمە لایان چونکە بە خەیاڵ ئەو مناڵە زەردو سورانەم لە ناو ئەو دەشت و دەرە لە بەفردا سپی چوەوەوە گەلێك لە

دیمەنی گوڵەکێویلەکانی سەر سەوزەگیای بەهار جوانتر ئەهاتنە پێشچاو. دیسانەوە بیرم لەوەئەکردەوە چیی تریان بۆ ببەم و بەچی زۆرتر دڵیان خۆشبکەم، هاتم کۆمەڵە شیعرێکی منالأنم کۆکردەوە، وتم ناو بەناو ئەمانەیان بۆ دەخوێنمەوە، چەند قوتویەك نوقڵی ترش و شیرینم بۆکڕین و بڕیارمدا کە بەدەنك نەیدەمەدەستیان، وتم خۆشیەکەی لەوەدایە وەك شاباش بیپرژێنم بەسەریاندا ئنجا وەرە سەیری ئەو بەزمەبکەو بزانە چۆن هەڵئەستنەوە، بەڵام بڕیارمدابوو، ئەگەر لەسەر نوقڵەکە چوون بەگژیەکتردا هەر دەم و دەست ئاشتیانبکەمەوە هەر لەجێدادەستیان پێبکەمە مل یەکتری. دیارییەکی بە نرخم ئامادەکردبوو بۆ ئەو منداڵەی لە ڕاکردنا یەکەم دەرچێت خەنجەرێکی منداڵانەی کاڵان و مشتۆجوانم دانا بۆ ئەو منداڵەی جوانترین و ڕێکوپێکترین ڕانکوچۆغەی لەبەردابێت. کەمەرەو هەیاسەیەکی زیو بۆ ئەو کیژۆڵە ژیکەڵەیەی جوانترین بەرگی کوردیی پۆشیبێت و هەڵپەرکێ باش بزانێت. کۆمەڵە گۆڤار و کتێبێکی منالأنەش بۆ ئەو منداڵەی کە تا ئێستا دڵی هاوڕێکانی زویرنەکردووە. نەچووە بەگژیاندا وقسەی لە تەکیاندا نەبڕیوەتەوە دەستێك بەرگی نووێشم خەڵاتی ئەو منداڵە ئەکرد کە هەتا کزەبای زستان لە کوڵمەکانی بدا زیاتر سوورهەڵدەگەڕێت و باشتر خوێنیان تێ ئەزێت.

وتم شەڕەتۆپەڵێکشیان پێدەکەم و هەرکامێکیان تۆپەڵە بەفری باشی دروستکردو باش هاتەدەست و زۆرتربەرگەی گرت و دەسوپەنجەکانی سڕنەبوون ئەوا دیارییەکی جوانیشم ئەدا بەوەیان، ڕەنگە بڵێن ئنجا ئەمەیان بۆ؟ بۆچی سەرمایان بێت و نەخۆشبکەون؟؟ نا... نا توخوا هەرگیز وامەڵێن جارێ یارییەکە یاریەکی خۆماڵییە بابیرنەچێتەوە، جگەلەوەش ئەوانە کوێستانین و خەڵکی وڵاتی بەفرو کەون و سەرمایان نابێت و بەسەرما و سۆڵە ڕاهاتوون، یارییەکەش ئەوەندە خۆشە ئەوی تەنیا جارێك شەڕە تۆپەڵی کردبێت ئێستاش دڵی بۆی لێئەدات و چاوەڕوانی ئەو ڕۆژەیە کە بەفرێکی زۆری تیادابکەێت ئەو یادەی نوێ بکاتەوە، پیرەمێردی شاعیر سەری بووبوو بەکلوی سپی کەچی کەبەفر ئەباری هێشتا شەڕەتۆپەڵی بوو بۆ یاری.

سەرتان نەیەشێنم بەم هەموو دیاری و خەڵاتانەوە بەم هەموو گوڵ و بووکەشووشانەوە بەم هەموو شیعرو قسەخۆشانەوە، بەم هەموو حکایەت و سەرگوزشتانەوە، بەو هەموو نوقڵ و بەزمورەزمەوە هاتمەپێشەوە پشتێنم واڵێ بەستبوو کە هەموویان پێشکەش بەو منداڵانە بکەم کەچی هەموو ئەو منالانە لێم تۆران و ڕوویان لێوەرگێڕام و هەرلاشیان لێنەکردمەوە؟ نەمزانی بۆ ؟؟ بۆچ تۆران؟؟

بەیان ژمارە(٢٤) نیسانی ٩٧٥

# حەمەمینەکەی گەڕەکی خۆمان

فەرەیدوون عەلی ئەمین

دوێنێ هەروا چاوم بە کتێبخانەکەمدا ئەگێڕا کتێبێکم بەرچاوکەوت دەستمدایە و چووم لەولاوە لێیدانیشتم و دەستم کرد بەخوێندنەوە، ئەوەندەی پێنەچوو شیعرێکم بەرچاوکەوت کەکاتی خۆی پیرەمێردی شاعیر لە کۆچی دوایی ئەمین زەکی بەگی مێژوونووسدا وتویە، کە خوێندمەوە هەروا تاس بردمییەوە و خەیاڵم ڕۆیشت، لەپێشدا خەیاڵم بۆ ئەوە ڕۆیشت و هەروا لە دڵی خۆمدا وتم تۆ سەیرکە ئەم پیاوە لە هەموو ژیانی ئەمین زەکیدا، یادی منالی لە هەموو شتێك زیاتر جوڵاندویێتی، سەیرکە ئەو خۆی پیرێکی هەشتاو ئەوەندە ساڵەو ئەمین زەکیش لەو تەمەنەدا کەچی هەر ئەلێی ڕۆژانی منداڵییانەو لە کۆڵانەکەی گەڕەکی خۆیاندا یاری ئەکەن و بەدڵێکی سەرریژی خۆشەویستییەوە هەر وەك ڕۆژانی ئەوسا لە سەرەتای شیعرەکەیدا بانگی لێئەکات و ئەڵێ:

**حەمە مینەکەی گەڕەکی خۆمان**

**کوڕە لاوەکەی حاجی ئەورەحمان**

شێوەی پیرەمێردم هاتە بەرچاو، هەستم شان بەشانی هەستی ئەوسای ئەو جووت بوو، بەچاوی خەیاڵی خۆم پیرەمێردم دی چۆن شەنی بیری کردووە بە خەرمانی یادگاردا و چۆن دیمەنی حەمە مینەکەی گەڕەکی خۆیانی هاتۆتە پێش چاو و چۆن هەنیسکی حەسرەت بەربینی بەوەفایی و دڵسۆزیی گرتووە چۆن گرێکی تێبەربووە و چۆن دیمەنێکی هاوڕێتی یان لە دڵیدا ڕەشماڵی هەڵداوە!.

من ئاوا خەیاڵم ڕۆیشتبوو کەچی لە پڕێکا ئەو خەیاڵەم پچڕا و پەرتبوو و یەکسەر ڕۆیشت و نیشت بەسەر یادێکی ترەوە و حەمەمینێکی گەڕەکی خۆمان بیرەوەری منیشی خرۆشان و ئیتر ئاگام لە حەمەمینەکەی پیرەمێرد نەماو چووم بەلای ئەوەکەی خۆمەوە، لە پێشدا دیمەنێکی نەختێك لێڵبوو، وردە وردە کامێرای خەیاڵم نزیکتر و

ڕووناكتری ئەكردەوە، كاتێكم زانی هیچم لە دەورووپشتی خۆم نەئەدی، چاوم بڕیوەتە دیوارەكەی بەرامبەرم گەچە سپیەكە وەك ئاسمانێكی فراوانی لێهات و فیلمی حەمەمینەكەی گەڕەكی ئێمەش دەستیكرد بە ئیشكردن، ئەم حەمەمینەی لەمەڕ من نە وەزیربوو و نەهیچ، نە مێژوونووس بوو و نە ناودار، نە ناوی لە كتێبداهەبوو و نە لە كوولەكەی تەڕدا.

جارێ تائێرە ڕوومنایە بەرامبەر ئەمین زەكی بەگ من ناوی حەمەمینەكەی لە مەڕ خۆم بهێنم چونكە ڕەنگە بە منداڵێك بێمەبەرچاوتان كە ئەفسەرێكی گەورەی قایش و قرۆشدار ببینێ گورج ڕابكات و بچێت بووكە شووشەكەی خۆی بهێنێت و بەرگی ئەفسەری بكات بە بەرداو بڵێت: ئەها منیش لەوەم هەیە!!.

بەڵام ڕاست و ڕەوان پێتان بڵێم، بێ شاردنەوەو بەژێرلێوەوەكردن، ئەو شیعرەی پیرەمێرد حەمەمینێكی هێنایەوە یادم كە تا ماوەیەكی زۆر دەریای بیرەوەریمی شڵەقاندوە و پوورە هەنگی خەیاڵمی وروژاندوە.

زۆرجار كە تاس ئەمباتەوە و ڕۆژانی منداڵیم دێتەوە بەرچاو حەمەمین بە هەموو وریایی و گورجو گۆڵی یەكەیەوە لە بەردەممدا قوت دەبێتەوە.

وا ئەزانم دوێنێیە كە من و ئەو هەردووكمان لە پۆلی چوارەمی سەرەتایی بووین، هەردووكمان لەسەر یەك كورسی دائەنیشتین، زۆر دڵم بە هاوڕێیەتیی خۆشبوو و حەزم نەئەكرد قسە لەگەڵ یەكدابڕینەوە، ئەگەر قسەشمان لەگەڵ یەكدابڕیایەوە ئەوەندەی پێنەئەچوو دوای یەك دوو ڕۆژێك ناویم ئەهێناو ئاشت ئەبووینەوە. حەمەمین كوڕێكی ئەسمەری ڕیوەڵەی زرنگ و زیت بوو، قژی لوول و چاوی ڕەشبوو، دەستێك جلی شینی میلداری هەبوو هەر ئەوەی لەبەرئەكرد، لە ڕاكردندا زۆر بە گوڕبوو من قەت نەم ئەگرتەوە. كەتاقی بەیانیی دەرس خوێندن تەواو دەبوو، ئەگەڕاینەوە ماڵەوە، بەپەلە نانی نیوەڕۆمان ئەخوارد و لەگەڵ چەند قوتابییەكی پۆلەكەی خۆماندا ئەگەڕاینەوە بۆ حەوشەی قوتابخانە بۆ تۆپێن، ئەوە تۆپێنمان ئەكرد تا تاقی ئێوارەی خوێندن دەستی پێئەكرد. حەوشەی قوتابخانەكەمان لەگەڵ خەستەخانەكەی تەنیشتماندا دیواریان یەكبوو، دیوارەكەش لەشیشی ئاسنكرابوو و

سەری شیشەکانیش زۆر نووکیان تیژبوو. لەکاتی یاریدا تۆپەکەمان کەوتە حەوشەی خەستەخانەکەو حەمە مینیش وەك ئاسك تاوی دایە خۆی و ڕایکرد و بە شیشەکاندا هەلگەڕاو ویستی بچێتە ئەو دیوەوە و تۆپەکەمان بهێنێتەوە کەچی لە پڕ شیشەکەچوو بەورگیدا و هاواری لێهەستا، ئێمە کەدیمان هەموو لەشیبوو بە خوێن لە ترسی مامۆستاکانمان ڕامانکرد و خۆمان شاردەوە، هەمووی نیو سەعاتێکی پێنەچوو وتیان حەمەمین مرد.

بۆ بەیانی کەچووین سەیری شوێنەکەمان کرد خوێنەکەیماندی بە شیشەکەوە وشك بووبۆوە، لەگەڵ هاوڕێکانماندا بڕیارماندا کە نەیەڵین کەس ئەو خوێنە بسڕێتەوە، هەموو ڕۆژێك ئەهاتین بۆ سەیری و زۆر بەشتێکی سەیر و گرنگمان دەهاتە بەرچاو، وەکو شتێك لەو ئاسنە خوێناوییەدا کۆتەڵی حەمەمینمان ئەدی، کە زەنگی پشووی لێئەدا یەکسەر ڕامانئەکرد بۆ لای ئاسنە خوێناوییەکەو لەدەوری کۆدەبووینەوە و زۆر بەسەر سوڕمان و ڕێزەوە سەرنجمان لێئەدا، ئەو دیمەنەی ئەوسای خۆمان، ئێستا لەوانەدا دەبینم کە بەوپەڕی بڕواوە قسن و قفڵی شەخس و پیرەکان ئەگرن و ڕائەوەشێنن!

ئەگەر منالْ مێژوونوس بێت هەر ئەوشتانە ئەنووسێت کە بەلای خۆیەوە بایەخی هەیە و ڕەنگە زۆرشتی بیر بچێت بەڵام چاك نییە ڕاستی ناکات بەژێر لێوەوە و ئەوی خۆی بەڕاستی ئەزانێت بێ پێچوپەنا ئەیلێت و حساب بۆ خاترانە ناکات؟! منیش کەئێستا چوومەتە دنیای ئەو یادەوە و لەوێوە دەنووسم، ئەڵێم: من نازانم ئەو حەمەمینە کوڕی کێبوو، نەکەسوکاری ئەناسم و نەخزم و خوێشی، بەڵام هەر ئەوەندەئەزانم کە خۆشم ئەویست و حەزم بە هاوڕێیەتیی ئەکرد، کە مرد تا ماوەیەکی زۆر وەکو شتێکی بە نرخم بزرکردبێت بەدوایدائەگەڕام. ئێستاش کە دیوار یان پەرژینێك دەبینم بەو شیشە ئاسنە نووك تیژانە دروستکراوە یەکسەر حەمەمینەکەی گەڕەکی خۆمانم بیرئەکەوێتەوە.

ئێستاش کە قوتابییەکی ئەسمەری خوێن گەرم و ئیسك سووك دەبینم کتێبی بەدەستەوەیە وائەزانم حەمەمینەو ئەچێت بۆ قوتابخانەو بەدڵ حەزئەکەم بانگی

لێبکەم و پێکەوە بچین بۆ حەوشەی قوتابخانەو تۆپێن بکەین بەڵام ئەمجارە ئەگەر تۆپەکەمان کەوتە حەوشەی خەستەخانەکەی تەنیشتمانەوە، نە ئەیەڵم حەمەمین بەسەر شیشە ئاسنەنووك تیژەکاندا هەڵگەڕێت و نەخۆشم بەسەریدا هەڵئەگەڕێم!! تۆ بڵێیت ڕێگایەکی تر نەبێت بچین تۆپەکەمان بهێنینەوە؟!!!

١٩٧٤/١٢

# ژیانی ڕاستەقینەبۆ کێیە ؟

ئەگەرچی ئەنجامی تیشکی زیوینی قرچەی خۆری هاوین و تیشکی زێرینی زەردەپەڕی ئاوابوون و گوڕگومبونە بەڵام چونکی دوا شەپۆلی ئەو تیشکە لە پێناوی کەلْك بەخشینا پەخشبۆتەوە هەر خەلْکەو داخ ئەخوار هەر دلْەو لێشاوی خەفەت هەلْئەڕێژێ بۆی لەکاتی ئاوابوونا. ئەگەرچی ئەنجامی مانگی چواردە کەلبوون و کەم بوونەوەیە بەلاْم چونکی هەزارەها جار ناوجەرگی شەوەزەنگی شەقکردوە و بە شەپۆلی تریقە تەلیسماوێکەی جۆرە بەرگێکی دلْڕفێنی کردووە بەبەر سروشتا هەر لەگەلْ کەلبوونیا هەزارەها دلْی بۆ دائەخورپێ.

ئەگەرچی ئەنجامی گەلاْ نالاْندنە بەدەم شەقی بای خەزانەوە بەلاْم چونکی هەزارەها ڕێبواری ژێر خۆری سووری هاوین لە سایەیا وچانێکیداوە و سەرخەوێکی شکاندوە هەر ڕەشماری خەفەتەو لە گەردنی ئارەزوو ئەئالْێ و هەر هەنسکەو بەربین ئەگرێ بۆی لەگەلاْ ڕێزانا.

تۆش ئەی کچە کوردە خاوەن هەستەکە کیژێکی خوێن گەرمی کوردستانی ئەگەر فەرمانی ڕاستەقینەی سەرشانی خۆت بزانی بەرامبەر نەتەوە و خاکەکەت، سبەینێش کە بویتە دایك ئەوە بزانی کە گۆشەکەری کۆرپەی کوردی ئازیزیت و کوردستانێکی ئاسودە بە تێکۆشانی ئەو لاوانە دێتەکایەوە کە تۆ لە کۆرپەییانا شەونخونیت لەگەلاْ کێشاون بزانێت کەئەبێ بەدەم لایلایەوە ئاوازی خۆبەختکردن لە پێناوی ئازادی هەموو بستێکی خاکی باووباپیرابدەی، بە گوێی جگەر گۆشەکەتا، ئەلێم ئەی کچە کوردە دلْسوزەکە ئەگەربیت و تۆش ئەمانە بزانێت و بەم گیانەوە دەوری خۆت لەسەر شانۆی تێکۆشانی نەتەوەی کورد ببینی، گومانی نییە کە سبەینێ لە تەك ئاوابوونی خۆری ژینتا وەك چۆن بۆ کەلبوونی مانگی چواردە دلْ داخورپا بۆ تۆش هەروەها، وەك چۆن بۆ ئاوابوونی خۆر داخ خورا بۆ تۆش هەناسە هەلْ ئەکێشرێ و دەست ئەدری بە دەسا و ئەوترێ: بەڕاستی کچێکی پالْەوان... دایکێکی پالْەوان بە لەش لەبەرچاومان

ونبوو بەڵام بە گیان هەموو کاتێ لە تەکمانایە و ئاگرخۆشکەری تێکۆشانی نەتەوایەتیمانە.

پێشکەشە بە کچانی کوردی دڵسۆز.

گۆڤاری نەورۆز / ژ: ١ ساڵی ١-١٩٥٩

# دیاری

سەرەتای ماڵ پێکەوەنانمانبوو، کەسوکار و خزم و دۆست و هاوڕێ بۆ پیرۆزبایی و پۆیلانەکردن، ڕوویان تێکردین و پۆیلانەی ماڵە هاوڕێیەکەم، گوڵدانێکی کریستاڵبوو، بە هەزار و یەك جۆر ئەدرەوشایەوە، ئەبریسکایەوە ئەچریسکایەوە، زۆر دڵم پێیخۆشبوو لە شوێنێکی دیاردا دامناو ژووری میوانم پێڕازاندەوە.

ماوەیەکی پێچوو، خزمێکی خۆشەویستمان لە هەندەران خوێندنی تەواوکردبوو، گەڕابۆوە. دەبوو زوو بۆ بەخێرهاتنەوە لێکردنی خۆی و چاوڕوونی لێکردنی کەسوکاری بچووینایە. بەو پەلەپەلە هیچی وامان دەستنەکەت بیکەینە دیاری دەستمان، ناچار پێمان نا بە جەرگی خۆمانداو گوڵدانە کریستاڵەکەمان خستەوە کارتۆنەکەی خۆیەوەو پێچامانە کاغەزێکی ڕەنگاوڕەنگەوە و بە تیلماسێك قوماشی کرێم سەتەنی زەرد لەسەر کاغەزەکەوە گرێیەکمان لە شێوەی چەند پەڕەگوڵێکدا لێدا.

کە لەوێ دیارییەکەیان کردەوە خزمەکەمان سەیرێکی خێزانەکەی کردوو بەیەکەوە سەرنجێکی قوڵیان لێدا، هەردووکیان لە خۆشیدا دەم و چاویان سوورهەڵگەڕا.

ئەوەندەی پێناچێ، ئەوانیش دەیبەنە پۆیلانەی ئامۆزایەکیان لە سلێمانی، ئەمانیش زاوایەکیان دەبێ لە بەغدا نەخۆشییەکی گران دەگرێت و ڕۆژ بەڕۆژ لێی پیسدەکات، کەس بە تەمای نامێنێ دکتۆرەکان لە خەستەخانەی(ڕاهیبات)، نەشتەرگەرییەکی قورسوگرانی بۆ دەکەن ئەوەندەی، پێناچێت چاکدەبێتەوە، ئەوانیش بەو بۆنەیەوە بۆ دیارییەکی جوان و شایستەدەگەڕێن، لە پیرەکریستاڵ باشتریان دەستناکەوێت، هەڵیدەگرن و دەیهێننەوە بۆ بەغدا، پێشکەشی زاواکەیانی دەکەن، ئەویش لەدڵدا زۆری پێخۆشدەبێ، ماوەیەکی دوور و درێژ لێی ڕادەمێنێ و سەرنجیدەدا.

ئەم کابرایە خوشکەزایەکی دەبێ، زۆری خۆشدەوێ، لە پۆلی شەشەمی سەرەتایی لەناو دەپانزدە قوتابخانەی ناوچەکەیاندا بە یەکەم دەردەچێ ئەمیش تۆپێکی پێو

کریستاڵە بۆریان بۆ دەبا ئەو کوڕە لە قوتابخانەیەکی ناوەندیدا لەگەڵ کورەگەورەکەی مندا، دەکەونە پۆلی یەکەمی(أ)وە و دەبنە هاوڕێ، کوڕەکەی من بە بۆنەی جەژنی لە دایکبوونی هاوڕێکەیەوە پایسکیلێکی بە دیاری بۆ برد، من تا بەر دەرگای ماڵیان گەیاندم ئەم پایزی ڕابووردووە لە جەژنی لە دایکبوونی کورەکەی مندا یارییەکی کۆمپیوتەری بچووك و کارتونێکی پێچراوەی بە دیاری هێنابوو ئەوان خەریکی یاری کۆمپیوتەرەکە بوون منیش کارتۆنەکەم هەڵگرت و بردمە ژوورێکی چۆڵەوە، کە سەرنجمدا سەیردەکەم ئیمزایەکی خۆمی پێوەیە کە کردمەوە هەمان گوڵدانە کریستاڵەکەی خۆمانە، وەك دوڕ دەدرەوشایەوە، وتم: کریستاڵە بۆر ئەمە تۆی!، دەك بەخێربێیتەوە، شەرتبێ ئیتر سەر لەم ماڵە نەبەیتە دەرەوە!!.

ئەوە چەند مانگێکە پیرە گوڵدان گەڕاوەتەوە، قورئان بەهەقت، چێوبنێن بەورگمەوە نایبەم بە دیاری بۆ هیچ کەسێك ئەمە شانزەساڵی ڕەبەقە ڕۆیشتبووە و ئێستا بەپێی خۆی گەڕاوەتەوە. تازە من جارێکی دی گەشتی پێبکەم ئنجا کێ ئەڵێ جارێکی دی دێتەوە؟! نا، کێدەڵێت من شانزەساڵی دی دەژیم؟! نا، ئەم جارە بڕوا، چاوم پێی ناکەوێتەوە و دیارئاخر دەبم. خەڵکینە بۆ خاتری خوا کەس ڕووی ئەو گوڵدانە کریستاڵەم لێنەنێ. ئەها بەو غەوزی بەغدایە نایدەمەکەس!!.

گۆڤاری ڕەنگین

ژمارە ٤/ شوباتی ١٩٨٨/ ل٢١

# ڕۆڵە بەئەمەکەکانی شار
# فەرمیدوون عەلی ئەمین
# پیاوی نیشتمانپەرومر و خاوەن قەڵەمی هۆشیار

ئەحمەد حسێن

فەرەیدون عەلی حاجی ئەمینی کاکە حەمە له‌٢٩/٤/١٩٢٣دا لە بنەماڵەیەکی ناسراوی سلێمانی لە دایکبووە. خوێندنی هەردوو قۆناغی سەرەتایی و ناوەندی تەواوکردووە. پاشان چۆتە خانەی مامۆستایان لە شاری بەغدا و لە ساڵی١٩٥٣ بە مامۆستا دامەزراوە. سەرەتا لە شارباژێر و دواجار گوێزراوەتەوە بۆ قوتابخانەی سەرشەقامی کوڕان لە سلێمانی. هەمیشە وەك ڕابەرێکی شۆڕشگێڕ و چاونەترس بیری میللی و نەتەوایەتی بۆ قوتابیان باسکردووە. لە ساڵی١٩٦٢ بەرەو خەباتی شاخ هەنگاوی ناوە تا١٩٧٠. لەوەدوا لە وەزارەتی کاروباری ژووروودا بۆتە لێکۆڵەرەوەی زانستی. لە دواییدا هەر لە هەمان وەزارەتدا بوو بە بەڕێوەبەری(هۆی فێرکردن)، لە ساڵی١٩٧٥ بۆتە سەرپەرشتی پەروەردەی قوتابخانەکان. لە هەمان ساڵدا زانکۆی موستەنسیرییەی تەواوکردووە و بڕوانامەی بەکالۆریۆسی وەرگرتووە. لە ساڵی١٩٨٢ خانەنشینکراوە و لە ١٩٨٥ بۆتە وانەبێژ لە بەشی کوردی کۆلیجی پەروەردە لە زانکۆی بەغدا.

مامۆستا فەرەیدوون لە ئەندامە دامەزرێنەرەکانی دەستەی بەرایی یەکێتیی نووسەرانی کوردبووە. یەکەم بەرهەمی لە ڕۆژنامەی ژینی١٩٥٤دا بڵاوکردۆتەوە. وەك هەڵوێستێکی مێژوویی کوردانە ساڵی١٩٨٤ لە گفتوگۆی نێوان ی. ن. ك و ڕژێمی بەعسدا یەکێك لەو کەسایەتییانەی لایەنی کوردی پرسوڕای پێکردن مامۆستا فەرەیدوون عەلی ئەمین بوو لەگەڵ کۆمەڵێك ڕووناکبیرانی بەغدا لەوانە: دکتۆر کەمال مەزهەر، دکتۆر فوئاد حەمەخورشید، دکتۆر کاوس قەفتان و مامۆستا محەمەدی مەلاکەریم. مامۆستا لەو ساڵەدا و بۆ ئەو ڕۆژگارەی بزووتنەوەی کورد، ئەم پرۆسەی گفتوگۆیەی

بەهەنگاوێکی چاك زانی بۆیە ئامادەیی خۆی بۆ هەموو ئەرکێك نیشاندا. هەروەها لە کۆنگرەی ڕاپەڕینی یەکێتیی نووسەرانی کورد لە شەقلاوە١٩٩١ بەشداریکردووە، هەستی کوردانەی خۆی دەربڕیوە. ناوبراو بەسەربازێکی گومناوی ئەدەبی منالآن لە شیعر و چیرۆك و وەرگێڕان، وشەکانی دەنگیان داوەتەوە.

مامۆستا فەرەیدوون لە تەمەنی٥٨ ساڵیدابوو کە نەخۆشی ترسناك ئێخەی پێگرت و گێژەڵوکەی مەرگ ڕاپێچیکرد. لە ڕۆژی ١٩٩١/١١/٢٥ گیانی بەخاکسپارد. خەم و پەژارە پەرییە دڵی دڵسۆزانی دانیشتوانی شاری سلێمانییەوە. ئەمەیش لیستی نامیلکە بلاّوکراوەکانی مامۆستان:

١ـ پاڵەوانی دواڕۆژ(شیعری منداڵان)١٩٥٨ لەگەڵ مامۆستا عومەر عەبدولڕەحیمدا دەریکردووە. ٢ـ پیاوە بچکۆلەکە، چیرۆك و شیعر بۆ منداڵان(١٩٧٢). ٣ـ کارژۆڵە، هەڵبەست بۆ منداڵان(١٩٧٤). ٤ـ پاکژی، چیرۆك بۆ منداڵان(١٩٧٤). ٥ـ سێو، (١٩٧٤) چیرۆکێکی وەرگێڕاو بۆ منداڵان. ٦ـ گەنمەشامی، چیرۆك بۆمنداڵان(١٩٧٤). ٧ـ جووجەڵە و بێچووە مراوی، چیرۆکی وەرگێڕاو بۆ منداڵان(١٩٧٤). ٨ـ چەند سەرنجێك لە پیرەمێردی نەمر(١٩٧١) لێکۆڵینەوە. پیرێکی ڕیشدرێژبوو، وەرگێڕان و دانان(١٩٨٥) جگەلەمانە کۆمەڵێك وتار و لێکۆڵینەوە و ڕەخنەی ئەدەبی لە ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکاندا بلاّوکردۆتەوە.

گۆڤاری سلێمانی ئابی٢٠٠٣/ ژمارە ٣٤

# سەیرانی من

تافی شۆخیی بەهارە، چریسکەی ئاوە، سەوزەگیای ڕاخراوە، شەپۆلی پرشنگی خۆرە، خەرمەنی گوڵاڵەیە، قەڵەمبازی کارژۆڵەی قەدپاڵە، لەرەی شمشاڵە... بە کورتی بەهاری کوردستانەو هەزار دڵ عاشقی ئەبێ لە جوانیا. ئێمەش گەرمەی سەیرانەکەمانە، لەبەردەمی ماڵەکانی(قەڵاچوالان)دا لە گوێ چەمەکەکراوە بە بەزم و هەڵپەڕکێیەك نەبێتەوە. لەو لاشەوە سیرەی سەماوەرە، دەنگی قەتار و خاڵەی ڕێبوارە، یاریە، نیشان شکاندنە، خۆشیە، لێشاوی شادمانیە. نازانم چۆنبوو نەختێ لە کۆڕ دوورکەوتمەوەو ڕووە و گردەکەی بەردەمم ملم نابەدەم ڕۆیشتنەوە چاوێکم بەهەر چوارلای خۆماگێڕا سەیرئەکەم گۆڕستانێکە تاکوتەرای گۆڕەکانی کێلی تەواوی پێوەیە و ئەوانی تریشی هەروا وردە بەردو لەتەکێلە، سەرێکم ڕاوەشان وەك بمەوێ تەمی وڕبوون لە کەللەم دەرکەم، ئینجا سەرنجێکی دوور و درێژم لێدا سەیرئەکەم ئاوێنەییێکە چەند ڕووداوێکی ڕابووردووی تیا دیارە، ناچار لە عاستی خۆم چوار مەشقی لێی دانیشتم و بێ چاوتروکانن ڕوانیمە شێوەی کۆنی ئەم گۆڕستانەی بیرو هۆشی بۆ سەدەها ساڵی ڕابوردوو ئەگێڕایەوە... بۆ ڕۆژانی تەخت و بەختی(بابان)، هەر لەگەڵ وشەی بابان و تەخت و بەختی قەڵاچوالانم هات بە بیرا ئیتر نیگاری بەهار و دیمەنی لالەزارم لە مێشکا سڕایەوە، مەلی خەیاڵ بردمی بۆ شوێنێکی تر، بۆ سەیری دیمەنێکی هەزارقات جوانتر. بۆ سەیری(قەڵاچوالان)ی بێشکەی شێرانی بابان... ئەوەتا ئەوە دەستە کوڕی شان و باهو پتەوی مەچەك ئەستووری باڵا هەڵووی بە جەوهەرە. ئەوە دەستە سوارەی ووریا و زیت و بە هەڵپەیە سەیری کە چەند ڕێکومل بەرز ڕووبەڕووی لوتکە گەردن گەشەکان وەستاوون وەك بەڵێنیاندابێ بەیەك، کە هەرگیزاو هەرگیز مل شۆڕنەکەن و سەر بۆ کەس دانەنەوێنن.... ئەوا دەنگ لە کەرەناوە هەستاو کەژاوەی پاشای بابان لە بارەگای خۆیەوە ڕووە و مەشقگاهی لەشکر ڕۆی، ئەوەتا واگەیشتە ناویان و لەگەڵ

گەیشتنا هەموو وەك پڵنگ بۆی چەقین و دەنگ لە دار و بەردەوەبێت دەنگ لەوانەوەنایە.

وا پاشا دوای گێڕانی چاوێکی شادمانی پیایانا وەك شێر نەڕانی و وتی: ئەی قەڵای سەختی ئەم نەتەوەیە.. ئێمەی پەرژینی ئەم کوردستانە، نایەڵین هەتا هەتایی بستێکی بەفیرۆ بڕواو نینۆکێکی زەوتکرێ..! هەر ئەوەندەم گوێ لێبوو و هیچیتر چونکە یەکێ لە سەیرانکەرەکان بانگی کردم و بەو دەنگەش هێنامییەوە بۆ ئەم ژیانەی ئێستا! بۆ ئەم قەڵاچوالان و کوردستانەی ئێستا..! منیش بەدەنگەکەوە چووم و بەدەم ڕۆیشتنەوە دوا قسەکەی پاشای بابانم لە گوێدا ئەزرنگایەوە کە ئەیووت:"نایەڵین بستێکی ئەم خاکە بە فیڕۆبڕوا" هەر ئەوەندەم لە دەستهات زەردەخەنەیێکی پڕ تەوس هاتە سەر لێوم و لەبەر خۆمەوە ووتم: ئەمیش سەیرانی ئێمە..

<u>گۆڤاری هیوا / ژمارە(٣) ساڵی یەکەم ئەیلولی١٩٥٧</u>

# جەژنی نەورۆزم چۆنکرد

لە ژمارە(١٣٣٨)ی (ژین)دا، واتە چەند ڕۆژێ دوای جەژنی نەورۆزی ساڵێ پار مامۆستا ف- ووتارێکی لە ژێر ناوی(جەژنی نەورۆزم چۆنکرد)دا بڵاوکردبووە، لەبەرئەوەی کەوتارەکەی چەند پێشنیارێکی پەسەندی تیابوو کە ئەبێتە هۆی ئەوەی جەژنی نەورۆز خۆی کوتێتە ناو هەموو ماڵ و خێزانێکەوە و ڕەگێکی ئەوتۆ داکوتێ کە بەرگەی ئەم ژیانە کولەمەرگییەی ئێستامان بگرێ، بە پێویستمانزانی کە ئەمساڵ لە پێش جەژنی نەورۆزدا هەر هەمان ووتار وەکو خۆی بخەینە پێشچاو بە نیازیی ئەوەی هەموو برایەکی کورد پەیرەوی بکا.

هێشتا زەردەی مابوو کە هاوڕێکەم پێی ووتم:"ئەرێ براله شتێکم بە بیرداهاتوە با ڕاوێژێکت پێبکەم، منیش گوێم بۆشلکرد و سەرنجم دایە زۆر لەسەر خو ووتی:"ئەوا سبەی دووسبەی نەورۆزە خۆ پێویستیش ناکاتێت بگەیێنم کە چەند جەژنێکی پیرۆزە و باڵایە چونکە ڕەنگە لەمنی زیاتر بزانی بەڵام وەرن پیاوی چاکبن مادام ناتوانین ئەوەی هەمانە بۆیبکەین و بۆ ئەوەی نەورۆزیش سەری تیانەچێ و بیرنەچێتەوە ڕەگێکی ئەوتۆی بۆ داکوتین کە هەرگیز لە هەڵکێشان نەیە، .. شەوی نەورۆز هەریەکە لە ماڵی خۆیا بیکا بە جەژن هەر وەکو چۆن خۆمان بۆ جەژنەکانی تر ئامادەئەکەین بەهەمان دەستور کەل و پەل و پێویستی جەژنی نەورۆزیش ئامادەکەین، ئێوارە خواردنی بۆ دروستکرێ، میوە بکڕێ، ناوماڵ پاکوخاوین ڕاگیرێ و گردیلە و ووردیلەی ناوماڵ جەژنانەیان پێبدرێ و دڵیان خۆشکرێ، هەموو چاوگەش و ڕووخۆش و دەم بە پێکەنین بین ئەوحەلە بێگومان مناڵە ووردەکانمان ئەڵێن ئەم جەژنە چیەو چۆنە ئێمەش زۆرباش تییان ئەگەیەنین ئیتر هەر ئەو تێگەیشتنەیە ئەبێتە نەخشی مێژوو ناکوژێتەوە".

بەڕاستی ئەم بیرو بۆچوونەی هاوڕێیەم زۆر لا پەسەندبوو و بەڵێنمدا ئیتر بیکەم بە نەریت هەتا ماوم بەم جۆرە بەخێرهاتنی نەورۆزبکەم دڵی کەسوکارمی تیا خۆشبکەم، بۆ شەوی نەورۆز هەمووشت ئامادەکرا، شادمانی بەسەرا ڕژا، کاتێ کەڕۆژی زەردەپەڕ دوا تیشکی لە پەنجەرەکان هەڵئەسوو ناچار قوسی پێنەماو ئاوابوو و نەورۆزی بەسەرا

زاڵبوو و شەوی جەژنی نەورۆز دەستی پێکرد یەك دوو هاوڕێم بانگکردبوو ئەوەندەی پێنەچوو پەیدابوون، جەژنە پیرۆزەکرا، نان خورا، میوە گێڕا، گۆرانی ووترا، قسەی خۆشکرا، دوو هاوڕێکەم بەڵێنیاندامیٚ کە ئەوانیش ساڵی ئایندەوابکەن وهانەهانەی خەڵکیشبەن بەم جۆرە بە خێرهاتنی نەورۆزبکەن، ئینجا براو ئامۆزا ووردەکانم لێم کۆبوونەوە و دەوریاندام هەموو دەموچاویان پرسیاربووا! ئەمە جەژنی چیە بۆ پار و پێرار وامانئەکرد؟!! بەپێکەنینێکەوە دەستێکم کێشا بەپشتیانا و ووتم:"ئەمە شەوی خۆشترین جەژنی ئێمەیە، لەو رۆژدا ئەوجووتە مارەی سەرشانی(زوحاك)ی ستەمکار کە مۆخی سەری لاوان خۆراکیان بوو، ئەو جووتە مارە کەوتنە فیشکەفیشك و برسێتی تەنگیی پێ هەڵچنین نۆرەش هاتبوە سەر کوڕی نوهەمینی(کاوە)ی ئاسنگەر و کوردی گورد، کاوەم کاوە هەردووچاوی پەڕیە پشتی سەری و دەستی دایە چەکوشەکەی و ئاوایی دەنگدا و ڕووە و کۆشکی(زوحاك) وورژمیان برد، کاوە لە پێشەوە خۆی گەیاندیٚ و چەکوشەکەیدا بەتەپڵی سەریا و زرمەی لێهەستان، (هەموو مناڵەکان لەبەرخۆیانەوە ووتیان:"ئەی رۆحم کاوە، ئەی دەست خۆش کاوە... ئەی بەقوربانی دەستتبم" منیش لەسەرتەواوکردنی چیرۆکەکە ڕۆیشتم و ووتم:"ئیتر بەم جۆرە ئەو هەموو خەڵکە لە دەست ئەو زۆرداره دڵڕەقە ناپیاوە بێگانەیە ڕزگاریان بوو و کردیان بە جەژن و شایی و هەڵپەرکیٚ، هێشتا من سەر گورشتەکەم بە تەواوی نەگێڕابۆوە کەیەکیٚ لە مناڵەکان ئەوەندە ئازایەتیی کاوەی چوبوو بەدڵا قیڕانی و ووتی:"کە کاکم ژنی هێناو مناڵی نۆبەرەکەی ناوئەنێن کاوە"، کە ئەم وای ووت من قسەی هاوڕێکەمم بیرکەوتەوە کە ئەیووت:"جەژن و ئاهەنگی نەورۆز ئەبێتە یادیٚ لەسەر پەڕەی دڵی مناڵەکانمان و نەوەی نویٚ هەڵئەکەنریٚ و تا دنیا دنیایە نەورۆز بیرناچێتەوە، بەڵام هەر لەوکاتەدا ئاواتێکم خواست ئەمووت خۆزگە چیرۆك نوسەکان چیرۆکێکی بچکۆلانەی خۆشیان بۆ ئەنوسینەوە و ناویان ئەنا(نەورۆزنامە) و هەموو ساڵیٚ لە هەموو ماڵێکا ئەخوێنرایەوە و ئاهەنگی نەورۆزی پێگەرم ئەکرا، جا کاکی خۆم من جەژنی نەورۆزم بەم جۆرە کرد دیارە شتێکی پەسەندەلات وا ئەم ساڵ هیچ خوایاربیٚ تۆش ساڵێکی کە وائەکەیت.

ژین/ ساڵی١٩٥٨ ژمارە١٣٨٥

# هەر سێ ڕۆژ دوای نەورۆز!!

ئا لەم بیستوچواری(ئازار)ەدا کە خەڵکی هێشتا هەر مەستی شەرابی شادمانیی نەورۆزە وجلەوی بۆ خەیاڵی بەرداوە بەدەم جوانی کوردستانەوە بخنێتەوە، خەیاڵی سەرەڕۆش نیازیی نیە بەم زوانە بگەڕێتەوە گاهی بەدەم شنەی شەماڵەوە خۆی لە ڕووی گوڵاڵە هەڵئەسوی و گاهی لەپەنا تاشە بەردەکانا خۆی مات ئەدا تا گوێ لە بەستەی قەڵبەزبگرێ بۆ وەنەوشەی چەم، ئالەم بیستوچواری(ئازار)ەدا من بەپێچەوانەی ئەو خەڵکەوە ئەمەوێ لە تاڵی تاریکی شەوەزەنگو نوتەکی گڕ خەیاڵێکی ڕەشی قەڵاخی بچنم و سەرتاپای ئەم کوردستانەی پێداپۆشم. ئەمەوێ دەسەڵاتێکی ببێ ئەوتۆم نەیەڵم نەئاوهاژەو نەگۆم شڵقەیبێ نەلەرەی شمشاڵ بێو نەشنەی شەماڵبێ، ئەمەوێ قوڕگی هەموو کوردێ پڕبێ لە گریان و چاوی فرمێسکی تێزێ، چونکە ئالەم بیستوچواری ئازارەدا قارەمانانی شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران کران بە پەتاو هەزارەها کوردی خۆین پاکی دلێرنران بەدەست ڕێژی شەست تیرەوە تاخوێنیان جوگەلەی بەست و سەرەو خوار بۆناو دۆڵەکان کشا، کەژەکانیش وەك دایکێکی جەرگ بڕاوی بێدەسەڵات کە بەبەرچاوی خۆیەوە کۆرپەی بنرێ بە گوللەوە هیچی بۆنەمایەوە، دەستیکرد بە فرمێسك هەڵڕشتن، فرمێسك لە بەفری تواوەی کەژەکان لەسەردا هاتە خوارێ و تا لاشەکانی بە بەفراو نەشت، تێپەڕنەبوو. سیوئەوەندە ساڵ لەمەوپێش ئالەم ڕۆژەدا ئەو قارەمانەیان کرد بە پەتاو ئەو لەشانە بەهەموو ئاوات و هیواو هەستێکەوە لە جووڵەخران، بەڵام گیانی پیرۆزی نەتەوایەتی هەرگیز تاسان و خپبوونی بۆ نیە، بۆیە لەهەموو ڕۆژێکا و بەتایبەتی لەم ڕۆژەدا ئەگەر لە هەستێکی نەتەوایەتیەوە گوێ هەڵخەین دەنگی زوڵاڵی گیانی ئەو قارەمانانە دێتەگوێ کە زۆربە ئاشکرا ئەڵێ:"ئەی نەتەوەی کورد بەرەو تێکۆشانێکی نەتەوایەتی سنگ کوتن و تەفرەمەخۆن و لەسەردەمی خەباتی ئێمەی مارانگاز عیبرەت وەرگرن!".

جا کاکی خوێنەوار: ئەو قارەمانانەی کەبەو جۆرە خۆیان لە پێناوی کوردستانا بەختکردبێ و ئێستاش ئەمە ئامۆژگاری گیانی پاکیانبێ بۆ ئێمە، هەڵئەگرن خەیاڵێکی لەوەڕەشتریان بۆبچنم لەم ڕۆژی یادەیانا یان نا؟! هەڵئەگرن ئەم ڕۆژی بیستوچواری ئازارەیان بۆ بکرێ بەشین یان نا؟!.

ژین / ژمارە١٣٨٧ ساڵی١٩٥٨

# سیروان و سیروان

## پرسیارێك لە مامۆستا عەلائەدین سجادی؟!

وەختی خۆی لە ژمارە١٣٥٨ای ڕۆژنامەی(ژین)دا لەسەر ڕووباری سیروان نووسیبووتان، لەبارەی ووشەی(سیروان)ەوە ووتبوتان"سیروان یەکێکە لەو ووشە کوردیانەی کە لە دوو ووتە پێکهاتوە(سیر- وان) (سیر) لە زمانی پەهلەوی کۆندا بە(کوزەڵە) ئەڵێن و هەروەها گیایەکی تریشە وەك نیلوفەر، (وان)یش هەر لە پەهلەوی کۆندا بەمانا پاسەوانە، جا لەبەر ئەوەی ئەو ڕووباری سیروانە پڕێتی لەو گیایە وەکو ئەوەی لێهاتوە کە ئەو ڕووبارە ببێتە پاسەوان بۆ ئەو گیایە لەبەرئەوە پێی ووتراوە(سیر- وان) واتە(پاسەوانی کوزەڵە) یا پاسەوانی ئەوگیایەی کە لەنیلوفەر ئەچێ.

کەچی مامۆستا نەجمەدین مەلا لە ژمارەی پێشوتری(ژین)دا، واتە لە ژمارە(١٣٩٢)دا لە بەشی(شیعر و شاعیرەکانمان)دا دێتە سەرباسی ڕووباری(سیروان) و ئەڵێ: سیروان سێ ڕووان، ڕووکورت کراوەی ڕووبارە، سیروان لە سێ ڕووبار دروستبووە: ١ـ گاوەرو. ٢ـ ژاوەروو. ٣ـ ڕووباری مەریوان، ئەم سێ ڕووبارە یەکئەگرن و ڕووبارێکی کە دروستئەبێ پێی ئەڵێن سیروان واتە سێ ڕووان یەعنی لە سێ ڕووبار پێکهاتوە، بۆیە پێی ئەڵێن سیروان. جانازانم مامۆستا سجادی بەرانبەر بەم ڕایەی مامۆستا نەجمەدین مەلا، لەبارەی ئەو ووشەی(سیروان)ەوە ئێوە ئەڵێن چی و ئێمە کامیان بە ڕاست بزانین؟ ئاخۆ ئەوانەی شارەزای ئەم باسەن ئەوان ڕایان چیبێ؟!.

ژین/ ژمارە١٣٩٤ ساڵی١٩٥٨

# بەبۆنەی نەورۆزەکەمانەوە
# ئێمە و بەهار

وەك نامەوێ بە جوانیی بەهار و بەرگی ڕەنگینیا هەڵدەم، چونکە ئەزانم بەهاری ڕاستەقینەمان بە هاری سروشت نیە، ناشمەوێ بچمە باسی نەورۆز و سەرگورشتەی کاوەشەوە، چونکە ئەترسم لە دەشتی کاکی بە کاکی ئەو باسە فراوانەدا شامەبەستم بەئاستەم چاوبکرێ و کاری خۆی نەکا، بەڵکو ئەمەوێ سەرنجی لاوانی کورد تەنها بۆ ئەم چەند دێڕەم ڕاکێشم وبڵێم:"لە کاتێکا کە ئەم دەرودراوسێیانەمان لە جەژنی نەتەوایەتیانا لەخۆشیا پێیان ناکەوێتە سەر ئەرز و ئەوی ئەیلێن نایلێنەوە و هەربەوەشەوە ناوەستن بەڵکو هەموو ڕۆژێ دەنگی دەهۆڵی جەژنێکی تازەی نەتەوایەتیمان دێتەگوێ، لە کاتێکا کە ئەمانە بە بەرچاوی ئێمەوە ڕووئەدا و ئێمەش هیچمان بۆنەماوەتەوە ئەوە نەبێ کە هەر سەیرکەین و دڵمان لە خۆمان بمینێ، ئەڵێم توخوا لە کاتێکی وەهادا بە ڕیشی هیچ کەسێ ڕەوایە ئێمە تەنیا تاقە جەژنێکی نەتەوایەتیمان ببێ، کەچی ئەویش ساڵ بە ساڵ لەدەریایی بیرچوونەوەدا بتلیسێتەوە؟؟!! ئایا ئەبێ پیرۆزی واکە کاوەی ئاسنگەر و هاوڕێکانی تیا گەیشتنە ئامانج بە کوشتنی(ئەژدەهاك)ی بێگانەی خوێنە خوێمان و هێنانەسەر تەختی شازادەیەکی کوردی مەرد، ئەڵێم ئایا ئەبێ ڕۆژێکی واپیرۆز هەرواشتێکی ئاسایی بێو وەکو ڕۆژەکانی تربێت و بڕوا؟!!

ئایا قڕچۆکی پەتی نەتەوایەتیمان نیە کە بەدەم جەژنە وەرگیراوەکانەوە ئەتریقێنەوە، کەچی لەم جەژنەدا کەهی خۆمانە و مافی کەسی پێوەنیە هیچمان لەبارنیەو هەر بە خەیاڵیشمانا نایە کەنەورۆز هەبێ یان نەبێ؟!! دیارە هەموومان بەرامبەر بەم پرسیارانە تاوێ ئەوەستین، خۆدیارە هەروا دەستەوستان ناوەستین بەرامبەر بەم ئێستایەمان بەڵکو وێڵئەبین و ئەگەڕێین بۆ ئەوەی چارەسەرێکی ئەم

برینە پڕناسۆرانەمان بکەین، وە دڵنیاشم کە ئەوانەی بە کوڵ و بەدڵ ویلئەبن و ئەپشکنن بەدەستی خاڵێتی ناگەڕێنەوە، بەڵکو هەریەکەشتێکی لە قولەمستیاهێناوە کە دەست ئەکاتەوە دەرمانێکە لەسەری نوسراوە ئەگەر بێتوڕێگای تەقەڵای نەتەوایەتی بکرێ بە ڕێباز و کەس لێی لانەدا ئەوا برینەکانمان نەك هەرژانی ئەشکێ و ئازاری نامێنێ، بەڵکو بەتەواوی چارەسەرئەبێ و قەت هەڵ نادەنەوە، جا ئەو حەلە لە بەهاری ڕاستەقینەمانا شەقەی دەهۆڵی جەژنی نەورۆزمان دڵی ناحەزانمان بەر ئەداتەخوارەوە.

(ژین)/ ژمارەی تایبەتی نەورۆز١٣٨٦

# گەرداوی ئیمساڵ و پار
## گەڵا ڕێزانی پار و ئەمساڵ،
## پار لاشەی خوێناوی ئەم ساڵ لاشەی بێ خوێن

پار ئەم حەلە پێش ئەوەی بای خەزان گەڵا بوەرێنێ، ئێمە لە ژێر گوللەبارانا وەك گەڵایدارلێمان کەوت، ئیمساڵیش هەر پێش گەڵا ڕێزان بەلەقەی چەرخ ژینمان دائەکا، پار هەر دایکبوو بینی ئەنا بە خوێنی کورپەیەوە، ئیمساڵیش هەر خەڵکبوو و دەم وچاوی لیتاوی ئەلستەوە، پار تانجەرۆمان بە خوێن سوورکرد، ئیمساڵ لاشەشمان نایەبانی. ئەمە هەر بەشی ئیمساڵ و پارمان نیە، سەدەها ساڵە هەربرینە و برینی پێش خۆی ئەکۆڵێنێتەوە، هەر دایکەو سوێی ئەبێتەوە، هەو بەخت ڕەشییەو بەباڵامان بڕواوە...! سا کەوای لێهات با بگرین با بەفرمێسکی بێدەسەڵاتی لاشەکانمان بشۆین. دایکە جەرگ سوتاوەکان کۆرپەکانتان چیی لێهات؟!! لە نوێنی گەرم و گورپانان یان ئێستا ماسی گاز لە لەشە نەرم و نۆڵەکانیان ئەگرێ کوردەکانی بەغا: ئەگەر تاسەی هاوخوێنەکانتان ئەکەن بچن بە پیریانەوە بۆسەر دجلە چونکە تا بەلاتانا رانەبوورێن و ماڵ ئاوایش لە ئێوەنەکەن نارۆن، توخوا ئێوەش تێر هەنسکیان بۆ هەڵدەن و بە ئاوازی گریاناوی بەرێیانکەن.

ئەی چەرخی گەردون هەر زانیم بەم دەردەمان ئەبەیت، چەند ڕۆژێ بوو لێمان بەپشم وغاربویت لە عاستمان چاوت هەڵنەئەهات ورەش داگیرسابوی، ئاخرێکەی کەتنی خۆتتکرد و داخی دڵی خۆتت پێرشتین و تا شارەکەمانت خاپوورنەکرد ئاوپرژێنی دڵت نەکراوبەری ئاسمانت ڕوون نەبوەوە، ئێمەش مەگەر هەر بە فرمێسك ئەم تەمی سەردڵەمان برەوێنینەوە ئەگینا خۆئێمە نەکەس بە تەواوی بەتەنگمانەوە هاتوە و نەلایەکمان لێکراوەتەوە. ئیتر ئەم بۆ چروکییەش و هاڵاوی خەفەتەی ئەم چەند

دێڕەی منە ئەبینرێ، دەیەکی ئەو ئازار و مەینەتیەنیە کە لە سنگی هەموانا پەنگ ئەخواتەوە، چونکە لوورەی لافاوی ئەو ڕۆژەو خوڕنینەوەی ئافرەتان و قریشکەی منالی لافاوبردوو دیمەنی خانوی داتەپاو دەرهێنانی لاشەی لە ژێرخانا تاساو بەبێ دەسەلاتێکی قەڵەم کولی وەك من ناژەنرێ بە کاغەزا.

ژین/ ژمارە١٣٦٦- ١٩٥٧

# سێ تاڵە تیشکی خۆری خۆشەویستیی منداڵان

## تاڵە تیشکی یەکەم

یەکێك هەیە تازەبووە بە پزیشك و لەبەشی منداڵانی یەکێك لە خەستەخانەکاندا دامەزراوە، لە کاتی گفتوگۆدا باس هاتەسەر کارەکەی. کەلێم پرسی لەگەڵ جیهانی نەخۆش و نەخۆشکاریدا چۆنی ووتی نامەوێ بەباشم یان باشنیم وەڵامت بدەمەوە و خۆم رزگاربکەم، ئەگەر گوێم لێبگریت حەزئەکەم نەختێك درێژەی پێبدەم بۆ ئەوەی روونتر لەمەبەستم بگەیت، هەر ئەوەندە فەرموویەکم لێکرد ئیتر دەستی پێکرد و ووتی:

دایك و باوکێك بە هەڵەداوان و شڵەژاوی، منالێکی نەخۆش بەباوەشەوە، خۆیان ئەکەن بەژووردا، راستە منالەکە هێشتا زمانی بەهیچ ووشەیەك نەپژاوە بەلام بەچاو، بەروو، بەهەناسە، هاوارئەکات کە ئازاری هەیە، داوام لێئەکات کە فریایبکەوم، سەرنجی ئەدەم سەیرئەکەم لە جیاتی دوو کوڵمی وەکو خونچە سوور و ناسك دوو لێوی زەردی سیس هەڵگەراو ملیان بەسەر رِوومەتەکانیدا لارکردۆتەوە، لە شوێنی دوو لێوی تەرِ و پرِ زەردەخەنە دوو گوڵی ژاکاو بەدەم بای خەزانی نەخۆشییەوە هەڵئەلەرزین. چاو هەرچی پێی بلێیت بریقە تیایدا نەماوە. دەم لە ئاستی شنەبای گروگاڵ کپو بێدەنگەو هەر ئەڵێی ئاشی ئاوکەوتووە، هەر چەندە گوێ هەڵئەخەیت لە دەنگی کوندەپەپووی ناڵین و نکە زیاتر هیچیتر نابیستیت. کە لادەکەمەوە بەلای دایك و باوکیدا ئەبینم رەنگ هەڵبزرکاو، ئاه تیانەماو، هەناسە لەبەربرِاو سەرلێشێواو، هەنیسك لەبەربیناگیراو، خۆڵی مردوو بەسەردا کراو هەر بەدەم نەبێت ئیتر بەهەموو لەشیان پێم دەڵێن کە فریایان بکەوم. منالەکە ئەهێنم سەیریئەکەم، لێی ووردەبمەوە، سەرنجی ئەدەم بەروپشتی پێئەکەم، پرسیار لە دایك و باوکی ئەکەم، ماوەیەکی دووروودرێژ لەگەڵیدا

خەریك ئەبم. هەرلەوێدا ئەوی پێویستبێ دەیکەم و دەرمانی بۆ ئەنووسم و پێشیان ئەڵێم کە فلانەکات سەرم لێبدەنەوە.

کەدێنەوە منالەکە ئەبینم کولمەکانی سوور هەلگەڕاونەتەوە، پەپوولەی بزە بەسەر شیلەی گولی لێوەوە نیشتووە، بریقە لە چاوەکانیدا وەك ئاواتی میللەتانی ژێردەستە ئەبریسکێتەوە، ئەو جەنگەی سوپای تەو لە لەشدا هەلی گیرسانبوو دامرکاونەتەوە، منالەکە لە خۆشیدا گرۆگاڵ ئەکا، پەلئەکوتێ، چاوئەگێڕێ، دایك و باوکەش لە خۆشیدا چاویان بڕیوەتە کۆرپەکەیان و چاوی لێناتروکێنن، هەموو گرۆگالێکی منالەکەیان جۆرە تەزویەك بە لەشیاندا دەهێنێ مەگەر خوابزانێت، هەموو ڤیوەیەکی کۆرپەکەیان ختوکەیەکی لەشی ئەمانە، هەرچەند سەیری ئەکەن خۆشیان نازانن لە خۆشیدا چیبکەن و کە لادەکەنەوە بەلای بێئەوەی دەم هەلبهێننەوە هەستئەکەم کە وەك کانیاو سوپاس لەدەمیانەوە هەلئەقولێت بۆ من، منیش کە ئەوان وائەبینم گەز گەز بالائەکەم و وائەزانم هەموو دنیا هینی منە.

## تالە تیشکی دووەم

یەك دوو سالێك لەمەوبەر، مامۆستایەکی خزمم لە قوتابخانەی گوندێك لە گوندەکانی کوردستاندا دامەزرا، سالێ تەواوبوو و لە هاویندا چاومان بەیەککەوت، زۆرم حەزئەکرد لەبارەی گوزەرانی خۆی و ژیانی دێهات و پیشەکەیەوە لەگەلێدا بکەومە گفتوگۆ، وادیاربوو ئەویش حەزیئەکرد کە تێمبگەیەنێت، کوڕەکەی جاران نەماوەو ئەم سالە گیانێکی تریکردوە بە بەرداو تاڕادەیەك لە ژیاندا قالبووە و زۆرشتی بۆ ڕوونبۆتەوە کە لەوەوپێش دەرکی پێنەکردوە، یان ڕاستتر بلێین خۆی دۆزیوەتەوە و ڕێڕەوێکی بۆ خۆی دەستنیشانکردوە. بۆیە هەر سەری باسەکەم دامەزراند قسەکەی لەدەم قۆستمەوە و ووتی:"کە چووم بۆ یەکەمجار قوتابخانەم کردەوە، نزیکەی چل مندالێك بوونە قوتابی، سەیرم ئەکردن هەر وەك هەویرێکی بەپێزوان لەبەردەستمدا و چۆن گونکیان لێبگرم و چەند ڕایانکێشم وادێن بەدەستمەوە. زۆربەی قوتابییەکانم کۆنە ساوالەوان بوون.

هەر بەکراسە جاوە لەچڵکا بواردووە یەخەداچەکاوەکانیانەوە، هەر بەدەست و پلەکرێشاوییە قلێشاوەکانیانەوە، هەر بەکەوش و کلاشە ڕەق هەڵات و ڕەش هەڵگەڕاوەکانیانەوەهاتن بەرەوپیری ژیانی تازەی ناو قوتابخانە. سەرنجمدان، لێیان ووردبوومەوە وەکو چۆن جیولوجییەکان لە کەژ و کێوو هەردە و هەڵەتتدا کانزادێکی بە نرخ بەدیدەکەن بریسك و هورپیدێت، منیش ئە ئاوها لە ناو برژانگە ریپۆقاوییە لاوازەکانیاندا، چاوی بزوزیت و ووریام ڕەچاوئەکرد، لەگەڵ یەکەم رەچاوکردنندا موچڕکێك وەك لافاو تەوژمێکی هێنا بەلەشمدا کاتێك کە دامرکایەوە هەستمکرد دوو دڵۆپ فرمێسك لە چاوەکانمدا قەتیسماون، بەڵام وورده وورده ڕاهاتم و تێگەیشتم کە ئێمە لە کوێداین و ئەبێ لە کوێوە دەست پێبکەین.

وەکو هەموو لاوێکی دڵسۆز چمکی کارم لێکرد بەلاداو دەستمکرد بە پەروەردە و فێرکردنیان، ڕۆژ بە ڕۆژ هەستم بەوەئەکرد کە چرای خوێندەواری لە مێشکیاندا هەڵئەبێت و شەوقی خۆشئەبێ و تەم و لێلایی بەرچاویان ڕووناك ئەبێتـەوە و باشتر و ئاسانتر بۆ شت ئەچن و لەبارترئەبن بۆ ژیان. وورده وورده بەوە رامهێنان کە ئەبێ هەست و کەوتیان چۆن بێت و چۆن گفتوگۆبکەن و چۆن خاوێنبن و چۆن یاریبکەن و چی بکەن. زۆرم پێخۆشبوو کە ئەمدین بەڕیز لە سەرکانی خەریکی دەستوپل پاککردنەوەن، هەر چەندە ئەمزانی کە ئەمەی من ئەیکەم چارەیەکی بنەڕەتی نییەو بەهەموو چمکێکی ژیانیاندا ناتەنێتەوە، بەڵام هەر دڵم خۆشئەبوو کە لە نزیکی ساڵ تەواوبووندا ئەمدین دەستیان قەڵەم ئەگرێت و ئەنووسن و ئەخوێننەوە، سەیرم ئەکرد تاشتێك زیاتر فێرببن زۆرتر لای دایك و باوك و کەس و کاریان خۆشەویست ئەبن و بایەخیان باشتر پێئەدرێت. نەك هەر ئەوان، هەستم ئەکرد کە خۆشم زیاتر ڕێزم لە ناو ئاواییدا لێئەگیرێ، کە ئەمەم ئەدی وەك گوڵ ئەگەشامەوە و لە خۆشیدا پێم نەئەکەوتە سەر زەوی.

## تاڵە تیشکی سێیەم:

کوڕێکی هاوڕێم هەیە لە یەکێك لە کارگەکاندا کاردەکات، ماوەیەك لەمەوبەر خێزانی پێکەوە ناوە و منداڵێکیشیان هەیە. هەموو جارێ ئەگێڕێتەوە ئەڵێ: وەنەبێت لە دەست کارکردن وەڕزبم یان بێکارەبم، نا، تا گیان لە قەفەزەی سنگمدا بێت کارئەکەم و شانازیش بەوەوە ئەکەم کە بەشان و قۆڵی خۆم ئەژیم و هەمیشە سەریشم بەرزە، بەڵام هەندێکجار شەو ئەگرم بە کۆڵەوە و لە خەو هەڵئەستم و ئەڕۆم بۆ سەرکار ئەوەندەی پێناچێت کارگەئەکەوێتەوە زرموکوت و دەنگی لەمێشکمدا ئەزرنگێتەوە، هەتا ئێرە هەر ناڕەحەت نابم و تەنگم پێهەڵناچنرێت، بەڵام کە لە پڕ گێروگرفتێکی ڕۆژانە دێتەڕێم ئیتر بە تەواوی مێشکم ئەگوشرێت و لەشم شەکەت ئەبێت و سەری دنیام لێدێتەوە یەك و لەو لاشەوە پیرە کارگە هەر خەریکی زرموکوتی خۆیەتی و تەپەی دێ، ئەوسا هەست ئەکەم کە ئەو تەپە تەپەش ئاگری ناڕەحەتی و پەستیم خۆشئەکات، هەروا دەمێنمەوە تا دەست لە کارهەڵئەگرم و ڕێیماڵەوەئەگرمەبەر، سەیرئەکەم هەموو لەشم داهێزراوە و قاچم لەدوام نایەت، دڵم کەفی چەندوە، لێوم ووشك ووشك هەڵگەڕاوە، بە تەواوی بەر پێی خۆمم پێنابینرێت، بە هەرحاڵ خۆم ئەگەیەنمەوە بەر دەرگای ماڵەوە، هەر ئەوەندە لەو دیو دەرگاکە چوومە ژوورەوە و منداڵەکەمان هەستی بە هاتنەوەم کرد قریومیەکی بۆ ئەکات و ئەڵێ بابە... و هەر دوو ددانە تازەدەرهاتووەکانی پێشەوەی دەرئەکەوێت و بەدەممەوە پێئەکەنێت، بەڵام چۆن پێکەنینێك هەر ئەڵێی(نامەی خوایە بۆ پێغمبەران)، ئەڵێی بارانی پەڵەیە بۆ ساڵێکی بێبارانی پەڵە دواخستوو، ئەڵێی شلقەی ئاوی کانییە بۆ گوێی ڕێبوارێکی ڕێ لێهەڵەبووی تینوو. ئەڵێی مژدەی ئازادییە بۆ گوێی میللەتان لە پێناوی ئازادییدا جەنگاو، پێکەنینێك درزئەخاتە دەرگای هیواوئاواتەوە، لە دنیایەکەوە دەمبات بۆ دنیایەکی تر، هەرچی خەم و خەفەتی پێش هاتنەوەم هەیە هەمووی لە چاوتروکاننێکدا کۆدەکاتەوە و فرێی ئەداتە دەرەوە و هەر ئەڵێی ئەو کوڕەی ئەوسا نیم، کاتێك ئەزانم بە هەموو هێز و توانای خۆمەوە، لەگەڵ نووساندنەکەدا تەواو هەست بەوەئەکەم کە هەرچی پەستی و خەم و خەفەت و مەینەتی ئەو ڕۆژەم هەیە چوڕ چوڕ لە لەشم ئەتکێتە خوارەوە و لە ژێر پێی منداڵەکەمەوە چۆڕاوگە ئەبەستێت و بە ناخی زەویدا دەچێتە خوارەوە.

بەیان ژمارە٢١ کانونی دووەمی ١٩٧٥

# لێکۆڵینەوەی ئەدەبی
# عەلی عارف ئاغا
# شاعیرێکی دڵتەڕ و شیعرسوارە

بەلای منەوە عەلی عارف ئاغا یەکێکە لەو شاعیرانەی کە ئێستا لە مەیدانی ئەدەبدا هەقی خۆیان نەدراوەتێ، ڕەنگە یەکێك لەو هۆیانەی ئەوەبێت کە عەلی ئاغا خۆی کەمتر حەزی بە ناو و ناوبانگ کردووە و کەمتریش بەرهەمی خۆی لە گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا بڵاوکردۆتەوە. یان وەکو خۆی ئەڵێت شیعری نەکردوە بە پیشە:

**من شیعر ناڵێم کەوا بخرێتە ڕۆژنامەو گۆڤار**
**یا بڵێن بۆ ناوە، بۆ سامانە یا بۆ خاترە**
**من شیعر ناڵێم هەتا هەستی دەروون سەوقم نەکا**
**چونکە زادەی هەستە ئەشعاریش، نە سیحری ساحیرە**
**شیعر و هەڵبەستم نەکردوە سنەعەتێکی دائیمی**
**شیعرەکانم ناو بە ناوە، کەم کەمە، زۆر نادرە**

بەلای منەوە بەرهەمی زۆر خاوەن شیعرناکات بە شاعیر، بەڵام ئەگەر بەرهەمەکە زۆربوو و جۆرێکی باشیش بوو ئەواباشتر.. جاری وا هەیە بەرهەمێکی زۆری خاوەن شیعرێك دەبینین و لە گۆڤار و ڕۆژنامەشدا بڵاودەکرێتەوە کەچی ناتوانین بە خاوەنەکەی بڵێین شاعیر، جاریواش هەیە تەنیا شیعرێك خاوەنەکەی نەك هەرئەکات بە شاعیر بەڵکوئەیکات بە شاعیرێکی وەستاو خاوەن بەهرەش. بۆ نموونە ئێمە تائێستا هەر(ئیش کە ڕووی ئێستا لە هەورازە، سەر و لێژی نەکەی)ی شوکری فەزڵیمان بیستووە دەهەر بەم شیعرە(فەزلی) شاعیرە و شاعیرێکی بە دەستەڵاتیشە. شێخ سەعیدی باوکی شێخ مەحموودی

گەورە تەنیا(مردنە بێ تۆ ژیانم، زەهرە بێ تۆ شەربەتم)ی لەناواندا بڵاوەکەچی هەر بەوشیعرە ئەتوانین بڵێین شێخ سەعید شاعیرێکی بەسۆز و خاوەن بەهرەیە. ئەگەر عەلی ئاغاش هەر(گوڵ و خونچەی بەهارانیش لە تۆ نەشمیلەتر نابێ)ی ببوایە کە تا ڕادەیەك لەناو خوێندەواران و شیعر دۆستاندا بڵاوە، من بێ سێ و دوو لێکردن ئەمووت خاوەنی ئەم شیعرە شاعیرێکی دڵتەڕی بە سەلیقەو خاوەنی بەهرەیەکی سەیرە.

عەلی ئاغا لە مەیدانی خۆشەویستی و دڵداریدا شیعری وای هەیە پیاو حەیرانی ئەبێت، ووشەی وا هەڵدەیژێرێت پیاو سەری سوڕئەمێنێت، خۆشەویستییەکی توندوتیژ لە شیعرێکی ڕەوان و بێ گرێوگۆڵدا، کە سەیری ئەکەیت وا ئەزانێت بە هەموو کەسێك ئەوترێت کە دێیتە سەر ئەوەی لە وێنەی ئەوە بڵێیت سەیرئەکەیت قومتت بەسەریدا ناشکێت.

درۆیە تۆ لە ئینسان بی، ئەمە ئەقڵم قبوڵ ناکا
پەریش حەدی نییە وابێ، ئەبەد حوریش بەتۆ نابێ
بتی تۆ ئەتپەرستم من عیبادەت بۆ خوا ناکەم
ئەگەرچی ئاگری جوملەی جەهەننەم بۆم لەکارابێ

شاعیر لە پێناوی خۆشەویستەکەیدا ئەتوێتەوە، خۆشەویستییەکی بێ دەسیاو، بە تەنیا باڵ لە مەیدانی خۆشەویستیدا دڵسۆزی ئەنوێنێت. ئەگەر بەرامبەرەکەی هەمان دڵسۆزی و سۆزی نەبێت ئەم نە دڵی لێی ئەڕەنجێ و نە لەتوانەوەنەکەوێت، بەڵکو هەر دوعای ئەوەیەتی کە ئەو هیچی لێنەیەت و سەلامەت بێت ئیتر خۆشیبوێت یان نا ئەوە قەیناکا:

"نا، نا ئەی خوا هیچ دەردو ڕەنجێ
دڵدارەکەی من موکەددەر نەکا
من گیان و ڕۆحم بێ بەقوربانی
هەر چەندە منیش کە بەسەرنەکا"
"یاری من بەخشینی هیچ پیشە نییە
وەك مەلا(های) لا نییە، هەر بێنەیە"

سەیری ئەم ڕاز و گلەیی ساکارەبکەن کە لە دڵێکی بێگەردی خۆشەویستییەوە هەڵدەقوڵێت:

**لە من ساڵێکە ڕەنجاوی لەسەرچی؟!**

**گوناهم چیبوو، تۆراوی لەسەرچی؟!**

**وەکو جاران کە من دڵسۆزی تۆیم،**

**بەرامبەر من کە گۆڕاوی لەسەرچی؟!**

عەلی عارف ئاغا هیچ سڵ لەوەناکاتەوە کە ووشەیەکی بێگانە بچێتە شیعرەکانییەوە، بەڵکو ئەوەندە شارەزایانە ئەو ووشانە دائەڕێژێت ئەگەر چەند دانەیەکیشیان لە تەنیا بەیتێکدابن تۆ کە بەیتەکە دەخوێنیتەوە ماناکەی ئەتبات لەگەڵ خۆی و ووشە بێگانەکان بەهیچ کلوجێك سەرنجت ڕاناکێشن و هەر ئەڵێی ووشەی خۆماڵین:

**لە دنیادا لە تۆ جوانتر، لە تۆ شیرین و مەحبوبتر**

**ئەگەر دەعواچییەك مابێ، درۆناکا دەسا بابێ**

**دەسا با بێن بەسەف یەکسەر، هەموو چاومەست و**

**ڕوومەت گوڵ**

**بزانین چۆن ئەبێ مەحجوب، ئەوی وا لافی لێدابێ**

نەك هەر ووشەی بێگانە، بەڵکو شاعیر ئەو ووشانەی کە شاعیرە کۆنەکان لە شیعرەکانیاندا بەهەندێك مانا بەکاریان هێناوە، ئەمیش هەر لەو وشانەی بۆ هەمان مەبەست بەکارهێناوە، بێئەوەی لەوە بسڵەمێتەوە کە ئەمە ووشەی ئەمڕۆ نییە. بۆ نموونە، شاعیرە کۆنەکان(ڕەقیب)یان لە شوێنی ناحەز یان ئەوەی بەخیلی ئەبات بەکارهێناوە، شاعیریش هەر وەکو ئەوان ئەڵێ:

**وتم بۆچی ڕەقیب وەك سەگ لە دوتە**

**وتی کۆیلەی وەفای نان و نمەکمە**

شاعیر لە وەسفی خۆشەویستەکەیدا ووشەی وا هەڵئەبژێرێت کە زمانەکەمان لا خۆشەویست ئەکا، کە ئەمە خۆی لە خۆیدا خزمەتێکی گەورەی زمان و نەتەوەیە.

سەیرکەن ئەڵێ:

**چ نەشمیلەی ئەڵێی دەنکی برنجی**

**بە ڕوومەت میسلی شووشەی بێگرنجی**

**لە باخی حوسنی تۆدا بۆنی خۆش دێ**

**ئەرێ نارنجی تۆ، یاخود ترنجی**

**لە وێنەی تۆ نییە حوری و فریشتەش**

**بە شرینی و بە شۆخی تۆی برنجی**

ئەوی سەرنج ڕائەکێشێ ئەوەیە کە شاعیر هەر وەك ئەم دوو نموونەیە ئەمیش(ڕەقیب)ی بە(سەگ) شوبهاندوە.

شاعیر وەکو ئەو بولبولەی کە تا بەیانی بۆ گوڵ خوێندی و ڕەنجیدا بۆ ئەوەی لە بەیانیدا بگەشێتەوە و ئاوی دەمی بخواتەوە، ئەمیش لە ژیاندا بولبولێکی زیرەك و دەنگخۆشبوو، ویستویەتی هەمیشە بۆ ئەو خۆشەویستەی کە ڕوومەتی ئەڵێی گوڵە بەستە بڵێت تا ئەگەشێتەوە بۆ ئەوەی تێروپڕ سەیری بکات و چاو و لووت و دڵی لێپڕبکات. بەڵام بەداخەوە زەمان لە لووتی داوە و بەدڵی خۆی نەهاتۆتە پێشەوە.

(لە گوڵزاری ژیانا، بولبولێ بووم، زیرەك و دەنگ خۆش

کەچی ڕوومەت گوڵم، مەحرومی سەیری ڕووی گەشی کردم)

بەڵێ شاعیر هەموو کاتێك چاوەڕوانی زەردەخەنەیەکی خۆشەویستەکەی بووە، چاوی تینووی لارولەنجەی بووە، ئەگەرچی ئەو سڵی لێکردووە و هەمیشە سرك بووە و بۆی ڕام نەبووە.

**کە یار بۆ خەندە دەم ئەکاتەوە**

**شادی لە گیانم جەم ئەکاتەوە**

**وەختێ کە ئەڕوا بە لار و لەنجە**

**لاسایی پۆڕی چەم ئەکاتەوە**

**هەر وەك مامزی بیابانی چین**

**کە من ئەبینێ ڕەم ئەکاتەوە**

کە(گۆران)ی شاعیری بەناوبانگ، لە ئۆپەرێتی گوڵی خوێناویدا هەڵوێستی کوڕەکە لە سەرەتادا وادروستدەکات کە لە نێوانی هێنانەدی داخوازی خۆشەویستەکەی و چوون بەرە و ماڵی پاشای بە خێڵی دوژمن دەورەدراودا، دوودڵ بێت و دۆشدابمێنێت عەلی عارف ئاغا وەکو شێوەی(موعارەزە)ی کە لەناو شاعیرە کۆنەکاندا باوبوو ئەڵێ:

**گەر باخی پاشا لەوبەر ئاویشبێ**

**بە هۆردوی دوژمن ڕێ گیراویشبێ**

**بە شورای پۆڵا بەستراویشبێ**

**ئەبمە شاباز و هەڵمەت ئەهێنم**

**لە باخچەی پاشا گوڵ بۆ یار دێنم**

وەکو شاعیر بیەوێت بڵێ کە یار شتێکی داواکرد هیچ دۆشدامان و سێ و دوو لێکردنی ناوێت. لێرەدا گەرم و گوڕی شاعیر و ئامادەیی خۆبەختکردن و سەر لە ڕێگای خۆشەویستیدا دانانمان زۆر بە ئاشکرا بۆ دەرئەکەوێت.

وتمان شاعیر بە دەستیاو دولبەرەکەی خۆشناوێت هەمیشە ئامادەی ئەوەبووە چەپڵە بەدەستێك لێبدات. بۆیە ئەگەر هەندێك جار داوای تەنیا ماچێکیشی لێ کردبێت، ئەوەندە ئەو ماچەی بە زۆر زانیوە کە پێی خۆشبووە لەگەڵ ئەو ماچە ڕۆحی دەرچێ، واتە ئامادەبووە گیانی خۆی لە پێناوی ماچێکدا ببەخشێت:

**وەرە ببیبەخشە زۆر خێرە**

**بە من ماچێکی ئەو لێوە**

**لەگەڵ ئەو ماچە پێم خۆشە**

**کە ڕۆحیش دەربچێ پێوە**

عەلی عارف ئاغا وەکو شاعیرێکی خاوەن هەستی ناسك وەنەبێت هەر لە مەیدانی دڵداریدا ئەسپی شیعری تاودابێت، ئەو هەستە ناسکەی وایلێکردووە کە لەگەڵ ئازار و ئاواتی نیشتمان و میللەتەکەیدابێت. کە هەست بەکەم و کوڕیی کۆمەڵایەتی بکات و ڕەخنە لەکاری چەوت و ناهەمواربگرێت. کە ئامۆژگاری خەڵکی بکات و بەپێی بیروباوەڕ و بۆچوونی خۆی ڕێگە بۆ ئەو کەم و کوڕیانە دابنێت. دیسان هەر وەکو

شاعیرێکی هەست ناسك و خاوەن دڵ و دەرونێکی گەرم و گوڕ هەندێکجار لە دڵ و دەروون و مەبەستی خۆی داوە، دیسانەوە باسی(مەی) و خواردنەوەشی کردووە و بەدەست هەژاریشەوە نالاندوێتی.

هەر وەکو شاعیرێکی خاوەن هەستێکی ناسك و قوڵ لەگەڵ مرۆڤ و مرۆڤایەتی بووە، باشە بائێستا لە ناو شیعرەکانی شاعیردا گەشتێك بکەین و بزانین ئەم لایەنانە تا چ ڕادەیەك لە شیعرەکانیدا یەقیان داوەتەوە.

لە مەیدانی شیعری نیشتمانی و نەتەوەییدا ئەڵێت:

**(بە کوردی تێ مەگە، هەرکەس لە ڕێی ئەم خاکە پیرۆزە**

**وەکو کاوە فیداکاری نەبێ هەردەم لەکردارا)**

**(گیانێ لە ڕێگەی وڵات و گەلا**

**بە فیدانەبێ، بێ نرخ و کەمە)**

**دڵێ لە خۆشی هۆز و کۆمەڵا**

**خرۆشی نەبێ سوك و بێ هەستە)**

نەریتێکی کۆمەڵایەتیی ناڕێك هەیە کە هەمیشە خەڵکی دڵسۆز و هۆشیار لێی بە گلەیین. شاعیر ناڕەزایی خۆی بەرامبەر بەو نەریتە کە ڕاوەستانی لاوانە لەسەر شۆسەکان و دەست بە تەقەکردن و توانج لە خەڵك گرتنە، دەربڕیوە:

**(توانج ئەگرن لە کچ لە ژن**

**لە ڕێبواری وورد و مەزن**

**گاڵتەئەکەن بە هاووڵات**

**یا ئەکەونە فشەو هەلات**

**ئەوەی مەردە و هەستی بەرزە**

**دوورە لە کردەوەی هەرزە)**

لە ئامۆژگاریدا ئەڵێ:

**(مەدە پەیمانی چاکە تۆ بە ناچاك**

**ئومێدی پاکی چۆن ئەکرێ لە ناپاك)**

**(کە چوویتە ناوباخ گوڵ مەشکێنەوە**

**گوڵی هەڵومریو مەپلیشێنەوە)**

**(ئەوەی نەفام و پەستو ناژیرە**

**ئەڵێ فامیلیام گەورە و ئەمیرە**

**چونکە خۆی هیچەو لە هیچ کەمترە**

**سەرمایەی دەستی باوك و باپیرە)**

عەلی ئاغا وەکو شاعیرێکی هۆشیار ئەیەوێت هەندێك لایەنی دڵ و دەرون و دیوی ناوەوەی خۆی دەربخات بۆیە ئەڵێ:

**(بە ڕێگەی خوار و چەوتا تاکو ماوم هاتوچۆ ناکەم**

**ئەگەر بمرم لە برسا، بۆ ژیانی خۆم درۆناکەم)**

دیسان هەر لە نیشاندانی هەندێك لایەنی دڵ و دەرونیدا ئەڵێ:

**تەعامێ هاتو مێشی تێ ورووکا**

**دەنی نەفسم کە تەبعم اشتهای کا**

**بڵندو بەرزە نەفسم وەك دەماوەند**

**کە هەرگیز ئارەزووی بەرماوە ناکا**

شاعیر وەکو هەموو مرۆڤێك لە ژیاندا تووشی ناخۆشی و ناهەمواری و نەیاری و نەهاتی بووەو بەدەست هەژارییەوە ئاڵاندوێتی. بەڵام وەکو هەندێك کەس ئەمیش هاتووە هانای بۆ(مەی) بردووەو لە مەی نۆشیندا بۆ چەند ساتێکی کەم ئەو هەموو ئازار و شوێن پێ لە قەیەی زەمانەی بیر خۆی بردۆتەوە، ڕەنگە زۆر کەس بڵێن ئەمە هەڵەو ڕاکردنە لە ژیان و دەرد و کوێرەوەری ژیان بە(مەی) چارەناکرێت، ئەمە ڕاستە بەڵام عەلی ئاغا وەکو شاعیرێك بۆ فتوای ئەو کەسانە نەگەڕاوە و هەرگیز گیرفانی بۆ ئەو جۆرە ڕایانە نەگرتۆتەوە هەر وەکو چۆن(گۆران)ی شاعیر لە شیوەنەکەیدا بۆ بێکەس

مەستبوون و مەی خواردنەوەکەی بەوە شیدەکاتەوە، کە بێکەس زۆر چەوت و چەوێڵی زەمانە و دیمەنی وایدیوە کە نەك هەر بەدڵی نەبوو بەڵکو ڕقی پێی هەڵئەستاو وەك پشکۆ ئەچزا بە جەرگ و دڵیدا. ئیتر کە سەیریدەکرد کار بەپێچەوانەی بیرو باوەڕ و ئارەزووی ئەو دەڕوات و ئەمیش هیچ دەسەڵاتێکی نییەو هیچی پێناکرێت ناچار پەنای بۆ مەی دەبرد و خۆی مەست ئەکرد و وەك بەنج کراوێك بۆ ماوەیەکی کەم زەردەواڵەی وروژاوی نا لەباری و زوڵم و زۆر و ماستاو ساردکردنەوە و خۆ بردنە پێشەوە و دوژمنایەتی لەگەڵ میللەتداکردن و لافی نیشتمان پەروەریی بە درۆ لێدانی لێ دووردەکەوتەوە. بەلای منەوە مەی نۆشین و مەست بوونەکەی عەلی ئاغاش شتێکەوا.

**(من هەتا ماوم مەی ئەخۆمەوە**

**زوخاوی دڵمی پێ ئەشۆمەوە)**

**(بەڵکو ئەو خەمەی کەوا لە دڵما**

**تەفرو تونابێ بە مەی شەو لەناو)**

کە شیعرەکانی عەلی ئاغا ئەخوێنیتەوە، لە هەندێك شوێندا ئیشارەتی بۆ ئەوە تیادایە کە شاعیر بەدەم گەردەلوولی هەژارییەوە ناڵاندوێتی و زۆرجار هەژاری سەری لێشێواندوەو ئاوات و هیواکانی خستوەتە ناو تەمومژ و پەڵە هەوری چڵکنەوە تا وایلێکردوە نەك هەر ڕێڕەوی خۆی سەخت و لێژ ببینێ بەڵکو ئاواتەخوازی ئەوەبووە کە خوا تەمەنی درێژی نەداتێ کە ئەمە خۆی لە خۆیدا بێزارییەکی بێدەنگ دەربڕینە بەرامبەر هەژاری.

**(لەسەر کێوی ئەمەل ئاوارە ماوم**

**ئەبینم ڕێڕەوم زۆر سەخت و لێژە**

**لە داخی دەرد و ئازاری هەژاری**

**ئەوەی من نامەوێ عومری درێژە)**

پێم وابێت ئەم سەرپۆتە لە شیعرەکانی عەلی ئاغا بەسە بۆ ئەوەی ئەو قسەیەی کە لە سەرەتاوەکردم و وتم:"ئەم شاعیرە یەکێکە لەوانەی تا ئێستا لە مەیدانی ئەدەبدا

هەقی خۆیان نەدراوەتێ" بسەلێنم. هیوادارم جێگای سروشتیی خۆی لە ڕیزی شاعیرەکانماندابگرێت و بەپێی سەنگی خۆی لە تەرازوی ئەدەبدا هەقی خۆی بدرێتێ.

بەیان ژمارە٣١ی تشرینی دووەم١٩٧٥

# ڕاوبەرانەکەی دوکتۆر کاووس قەفتان

نامەوێ لە سەرەتاوە چەند لاپەڕەیەك لەسەر ڕەخنەو ڕەخنەکاری پڕبکەمەوە و بەهێنانەوەی یاساو دەستووری ڕەخنە دەست پێبکەم چونکە زۆرجار سەرنجمداوە، ئەوانەی وادەست پێئەکەن، ئەوەندەی پێناچێت چەند شتێك ئەڵێن لەو سنوور و یاسایەی خۆیان نووسیویانە ئەچنە دەرەوە و ئەکەونە گێژاوێکی ئەوتۆوە کە خۆشیان سەری لێدەرنەکەن. نە ئەمەوێ بڵێم ڕەخنە ئەبێ وا بێو وانەبێ و نە ئەشمەوێ ئامۆژگاری بکەم و دەستوور دابنێم. بەڵکو یەکسەر ئەچمە باسەکەوە، جا ئەگەر هەندێك شتم ووتبێت کە لەگەڵ ڕێبازەکانی ڕەخنەگرتندا بگونجێن و لای خوێنەرانی خۆشەویست پەسندبن ئەوا باشتر.

ئەم چیرۆکە بەلای منەوە چەند لایەنێکی نا تەواو و چەند لایەنێکی باشی تیادایە پێش ئەوەی بیانخەمە پێشچاو ئەبێ بڵێم چیرۆکەکە بە کورتی بەم هەوێنە داڕێژراوە. خێزانێکی کوردی لادێیی بە سەر چیایەکدا سەرئەکەون، بەدەم سەرکەوتنەوە قسەوباسی خۆیان ئەکەن و وەکو خێزانی هەموو میللەتانی تر ئەمانیش هەزار و یەك ئاواتیان هەیە و ئەیانەوێ بیانگەنێ، هێشتا ئەو ئاواتانە لە دڵ و دەرونیاندا کۆرپەن و تیشکی خۆریان لێنەکەوتوون کە لە پڕیکا تۆپێك بە خۆیان و خاوەنەکانیانەوە پەرشوبڵاویان ئەکەنەوە و هەر هیچیان نامێنێ.. هەر هیچ!!!.

لایەنە ناتەواوەکانی ئەم چیرۆکە:

۱ـ خاوەن چیرۆك ئەڵێ: "شاخێکی ڕووت و قووت بوو... هەتا بڕە دەوەنێکیشی پێوە نەمابوو" کەچی هەر دووای چوار پێنج دێڕ ئەڵێ:"سروشت ئەگەر دڵی لە هەردیش شکا ئەوە کۆلکەدارێکی پێنابەخشێت، بەڵام سروشت بۆچی ئەم شاخەت هەتا لە زڕە دەوەنێکی کرماویش بێبەشکرد؟" خاوەن چیرۆك وەڵام ئەداتەوەو ئەڵێ"... ئەوە

سروشت خۆی ئەیزانێت، ڕووتەو بڕایەوە" جا لێرەدا دووشتی لەیەکنەچوو بەرچاوئەکەوێت، لەپێشا ئەڵێ شاخەکە بڕە دەوەنێکیشی پێوەنەمابوو... واتە لەوەوپێش پێوەی نەماوە، کەچی دووای چەند دێڕێك وای دەرئەخا کە هەر لە بنەڕەتا پێوەی نەبووە و سروشت پێی نەبەخشیوە!!.

٢ـ کاك کاوس ئەڵێ:"ئەو ڕۆژە دەستەیەك بەسەر ئەم شاخە قووچەدا هەڵئەگەڕان بریتیبوون لە سێ پیاو و دوو ئافرەت" ئەوا دوو ئافرەتەکە دیارن کە خاتوو وەنەوش و بووکەکەین، ئەی باشە سێ پیاوەکە کێن و کوان؟ قەیناکا با بڵێین(ئەلە) یەکێکیانەو سۆفی حەمە وەیس دووەمیانە ئەی سێیەمیان کوا؟! لام وایە مەبەستی ئەوەبووە کە بڵێ سێ نێرینەو دوو مێینەبوون کە دیارە نە ئەبوو ووشەی(پیاو) بەکاربهێنێ چونکە هەموو نێرینەیەك پیاو نییە، بەڵام ئەی توانی خۆی لەم گێژاوە بەوە قورتاربکردایە کە هەر بیوتایە پێنج کەس بوون و بڕایەوە.

٣ـ برازاکەی(ئەلە) ئەوەیە کە لە سەرەتاوە بە کۆڵی یەکێك لە ئافرەتەکانەوەبوو، دیارە یەکێك کە بەکۆڵ هەڵگیرا ئەبێ زۆر منداڵبێ، قەیناکا با ناوبەناو لە کۆڵی ئافرەتەکە هاتبێتە خوارەوە و دوو هەنگاوی زۆر لە سەرخۆنابێ، بەڵام ئایا ئەمە ئەکاتە ئەوەی سۆفی حەمە وەیس دووای سوێند خواردنی زۆر گەورە ڕووی دەم بکاتە(ئەلە)و بڵێ: "لە تەمەنی ئەم زۆڵەی برازایەتا بوون منداڵم لە کۆشی دایکدا ئەفڕان" کە دیارە مەبەستی ئەوەیە لەو تەمەنەدا زۆر چابوك و ووریا و بەتوانا و گورجوگۆڵبووە. ئایا ئەقڵ ئەی گرێت سۆفی حەمەوەیس لەو تەمەنەدا ئەوەندە بەکاربوو‌بێت؟!!.

٤ـ مەسەلەی کات و زەمان لەم چیرۆکەدا زۆر سەرنجی ڕاکێشاوم. هەروەکو خاوەن چیرۆك خێزانەکەی بەسەر شاخەکەدا هەڵگێڕاو ووتی:"ئەو ڕۆژە دەستەیەك بەسەر ئەم شاخە قووچەدا هەڵئەگەڕان" ئەگەر بەمە وازی بهێنایەو ئیتر لە کات و زەمان نەدوایە، کارەکەی باش بۆ ئەچووە سەر و هیچ نابەجێییەکی تیادا نەئەبوو. بەڵام لەشوێنێکی تردا سۆفی ئەڵێ:"بەس خوابکا وەستاندنی ئەم شەڕە تا سەربێت وادوو سێ مانگە نەختێك حەساوینەتەوە" ئەمە ئیتر بە ناچاری ئەمانخاتە بەردەمی بیرکردنەوە

لە(کات) چونکە دیارە چیرۆکەکە لە ڕووداوی ئەم شۆڕشەی دوایی میللەتەکەمان ئەدوێ و ئەم شۆڕشەش لە جارێك پتر شەڕی تیادا وەستاوە. ئەم دەستنیشان نەکردنی کات و زەمانەش دیسان هەر هیچ نەئەبوو بەڵکو بە پێچەوانەوە دکتۆر کاوسی ئەگەیاندە هونەرێکی باڵا لە چیرۆك نووسیندا بەوەی کە ئەیتوانی بەبێ باسی کات و زەمان هەر لە چیرۆکەکەدا تێمان بگەیەنێ کە مەبەستی وەستاندنی شەڕی دووای بەیانی(١١)مارتە چونکە لە شوێنێکی تردا وەسفێکی وای ئەو ڕۆژەی ناو چیرۆکەکەی کردوە کە بە تەواوی لە ڕۆژانی ئاخر و ئۆخری مانگی مایس ئەکات لە کوردستانی ئێمەدا وەکو ئەڵێ:"ڕۆژەکەشی خۆشبوو، ئاسمان بە سەریانەوە قوول و شین کشابوو، لە ناو تیشکی ڕۆژدا ئەبریسکایەوە و ڕووناکی ئەرژانە چاویانەوە" ئێمەش ئەو دووسێ مانگەی سۆفی حەمە وەیس ئەڵێ شەڕ وەستاوە، ئەمان خستەسەر(١١)ی مارت سەیرمان ئەکرد تەواو ئەو ڕۆژانە دەرئەچێت کە خاوەن چیرۆك وەسفیکردوە، بەڵام بە ڕستەیەکی بچکۆلانە خەملاندنی ڕۆژەکەی وا لێتێکداوین کە هەر چەند بکەین و بکۆشین وەرز و کژەکەیمان بۆ نەدۆزرێتەوە چونکە کە سۆفی حەمە وەیس ئەڵێ:"وا دووسێ مانگە نەختێك حەساوینەتەوە.." هەردووا بەدووای ئەوە ئەڵێ:"زەوی خەریکە دەمئەکاتەوەو سەری گەنم و جۆی لێ بێتەدەرێ". باشە لە کوردستانی خۆماندا ئەوە چ وەرز و سەردەمێکە کە گەنم و جۆ سەری دەرنەهێناوەو تازە زەوی خەریکە دەمئەکاتەوە تا ئەوانە سەری تیادادەربهێنن؟!!. لە گەرمیانەکاندا پێش مانگی مارتەو لە قەڵەمڕەوی(سلێمانی)یشدا کە لە دەم و دووانی بەشدارانی چیرۆکەکەدا وادەرئەکەوێت شوێنی ئەو ڕووداوانەبێ، هەرچی چۆنێك بێ ناگاتە ئاخر و ئۆخری مارت. ئینجا ئەگەر دووسێ مانگی شەڕ وەستاندنەکەی سەر زمانی(سۆفی)ی لێدەربکەین ئەبێ بکاتە کام شەڕ وەستاندن؟!. نە ئەوەی دووای مانگی شوباتی١٩٦٣و نە ئەوەی دووای شوباتی٩٦٤و نەهینەکەی دووای ٢٩ی حوزەیرانی٩٦٦و نە ئەوەکەی ئەم دووایییەی دووای بەیانە بەناوبانگەکەی(١١)ی مارت ناگرێتەوە!.

٥. پێش ئەوەی چیرۆکەکە تەواوبێت بە هەشت نۆ دێرێك، کاك کاوس باسی ئەفسەرێك ئەکات کە تۆپی ناوە بە شاخەکەوە و ئەڵێ:"بە دەستێکی دووربینەکەی بە

چاوییەوە گرتبوو و بەدەستەکەی تریشی نیشانەکەی بۆ ڕاستئەکردەوە... بەڕقێکی بێشومارەوە نەڕانی: ئاگر" من وا ئەزانم لە چۆنێتی تۆپ ئاگردانەکەدا خاوەن چیرۆك کەوتۆتە هەڵەیەکی یەکجار گەورەوە چونکە هیچ جۆرە تۆپێك بەوشێوەیە ئاگرنادرێت کە ئەو ئەڵێ بەڵکو ئەفسەرێکی تۆپەوان لەپێشدا یان بە چاو یان بە دووربینێك سەیری ئەو شوێنەئەکات کە ئەیەوێت بینێ بەنیشانەوە، بۆ ئەوەی بەپێی لێکدانەوەی خۆی بزانێ نزیکەی چەند دوورە ئینجا بەپێی ئەو لێکدانەوە و خەملاندنەی خۆی دێتە سەر تۆپەکەو لەوێ جیهازێکی پچکۆلەی تیادایە بە عەرەبی پێی ئەڵێن(مزولە)ی تۆپ چاوێکی شووشە بە سەرەکەوەیەتی و چەند خەتێکی لە تەنیشتی ڕاستەوە بۆ چەپ تیادا ڕاکێشراوە، ئەفسەرەکە دێت چاو بەسەر ئەو شووشەیەدا شۆڕئەکاتەوە و دەستئەکات بە گێڕانی ئەو جیهازە بەپێی ئەو نەخشانەی کە لەوەوپێش سەیری کردوە و ناوی شوێن و شاخ و گوند و شارەکانی تیادایە و بەپێی ئەو خەملاندن و لێکدانەوەیەی خۆی و دووای حساباتێکی وورد کە بە تایبەتی لە دانیشگای ئەفسەری و دەورە، تۆپەوانییەکاندا ئەخوێنرێت تۆپەکە بۆ ئەو شوێنەی ئەیەوێت بەر تۆپی بدا ئامادە و ئاڕاستەئەکات ئنجا خۆی لێئەداو ئەڕوات و ئەچێتە شوێنێکەوە کە(نیشانە)کەی لێدیاربێت تا بزانێت سەرئەکا یان خوار، ڕاستئەکا یان چەپ و ئینجا ئەڵێ: ئاگر.

٦- لە ڕووی زمانەوە تەنیا دوو سەرنجی پچکۆلانەم هەیە، یەکەمیان کە ئەڵێ:"یەك دوو ڕۆژ لای کوێخا ئەمێنمەوە، دەم و دوانی چێشکەئەکەم" ئەگەر مەبەستی ئەوەیە کە لە ڕای کوێخا بگات ئەبێ بڵێ: دەم و دووانی تاقیئەکەمەوە، ئەگەر مەبەستی ئەوەیە دیارییەکی بۆ بەرێت و یان شتێکی بداتێ تا نەختێك نەرمی بکات ئەبێ بڵێ: دەمی چەشەئەکەم. دووەمیان لە دوو شوێندا ئەڵێ: (چاوی گەڕان) بەلای منەوە باشتر وایە بڵێ: چاوی گێڕا.

لایەنە باشەکانی چیرۆکەکە:

پێشەکی ئەبێ ئەوە بڵێم کە دوکتۆر کاوس چیرۆك نووسە، مێژوونووسیشە. ئەگەرچی تا ئێستا بە ووتار بیروڕای خۆی بەرامبەر بە شۆڕشەکەی ئەم دوواییەمان

نەنووسیوە بەڵام ئەتوانین بڵێین چەند چمکێکی کەمی ئەو بیروڕایەی لەم چیرۆکەدا دەربڕیوەو وادەرئەکەوێت بە بیروباوەڕێکی کوردپەروەرانەوە نووسیوێتیەوە و هەر بەو پێوانەیە ڕووداوەکانی پێواوە. لەبەر ئەو لام وایە ئەگەر ڕۆژێك لە ڕۆژان مێژووی شۆڕشەکەمان بنووسرێتەوە، هەندێك ڕای کاك کاوس ئەگەرچی لە دووتۆی چیرۆکێکدا دەریبڕیوە بەڵام هەر بە چاوی بایەخ سەیرئەکرێت ئەگەر بێت و بە ووتار تا ئەوسا هیچ نەڵێ.

١. سەرکەوتنی خاوەن چیرۆك لەوەدایە کە بەزۆر ڕایەکانی خۆی نەسەپاندوە بەسەر بەشدارانی چیرۆکەکەدا بە تایبەتی سۆفی حەمە وەیس کە ئەو قسانەی وەك ئاوی ڕەوان لە دڵەوە دێتەدەرێ، دیارە زیرەکیی خاوەن چیرۆك ئا لێرەدا دەرئەکەوێت و وادیارە لەم ڕووەوە شارەزای ژیانی کوردەوارییە چونکە(سۆفی) کە پابەندی(تەریقەی نەقشبەندی)یە زۆری عیبادەت و خوا ناسینەکەی لە ڕووی لێکدانەوەی قووڵ و ڕاهێنان و ریازەی دڵو دەروونەوەیە، وەکو پیاوێکی دنیادیدەو خاوەن تاقیکردنەوە دێتە بەرچاوی خەڵکی و بەتایبەتی لادێیی.

خاوەن چیرۆك، (سۆفی حەمە وەیس)ێکمان نیشان ئەدات کە ڕووداوەکانی ژیان بکاتە کەرەسەی ئامۆژگاریکردن و گفتوگۆی. (سۆفی) نایەوێت تەنانەت بە(ئەلە)ی کوڕیشی یەکسەر بڵێ نابێ لە بە شاخ هەڵگەڕانندا پەلەبکەیت ئەگینا ئەکەویت و لە ناو ئەچیت، بەڵکو بۆ ئەوەی ڕێز لە قسەکەی بگیرێت و بایەخی پێبدرێت جارێ لە پێشدا تاقیکردنەوەیەکی قووڵی خۆی ئەگێڕێتەوە کە چۆن لە لاوێتییدا وەك ئاسك لەم تاشە بەردەوە بۆ ئەو تاشە بەرد قەڵەمبازی داوە و لە ئەنجامدا خزاوە و دووسێ مانگێك لەسەر گازی پشت بۆیکەوتووە، ئینجا دووای ئەمە پێی ئەڵێ:"تۆش هەتیوەکە گوێ لە قسەی باوکی خۆت بگرە ئەوسا دووسێ مانگ لەسەر پشت بۆی ناکەوێ".

چیرۆکنووس توانیوێتی زۆر زرنگانە جیهانی تاقیکردنەوەکانی(سۆفی) فراوانتر بکات و سوفی حەمە وەیس لە مەیدانی بیرکردنەوەی کوردانەشدا وا دەربخات کە هەر لە خۆیەوە قسە ناکات و زمانی بە دڵیەوەیەو زۆر دوور ئەڕوانێت کە ئەڵێ:"بەس خوابکات وەستاندنی ئەم شەڕە تا سەربێت و کوردەکەش دەستخەڕۆ نەبێت" ئەگەر

کاك کاوس(سۆفی)یەکی وای بۆ چیرۆکەکەی هەڵنەبژاردایە بۆمان هەبوو کە بڵێین لە مەیدانی ئەو قسانەدا کە پەیوەندی بە کوردەوە هەیە خۆی چۆتە چیرۆکەکەوەو خۆی ئەبینرێت نەك سۆفی، ئەوسا ئەبوە کەموکوڕیەکی گەورە لە هونەری چیرۆك نووسیندا بەڵام کە توانیویێتی یەکێکی وەکو(سۆفی) بدۆزێتەوە بۆ ئەو قسانە ئەبێ ئافەرین بکرێ، چونکە ئەوی ڕاستی بێ زۆرجار لە شۆڕشەکەدا لادێییەکان ئەدی هەر ئەوەندە ماوەی چوونە شاری ببوایەو هەندێك شەکروچاو کەلوپەلی دەستکەوتایە ئیتر وایئەزانی دنیا خۆش و ئاسایشە، بەڵام لەهەمان کاتدا زۆر جاریش مۆخیەکی وەکو ئەمەی ناو ئەم چیرۆکەمان ئەدی کە ئەو جۆرە لادێییانەی بە کورت بینی و هەڵخەڵەتاو و دەستخەڕۆئەزانی و پێیوابوو کە ئەو کوردە بۆ هەقێك ئەو شۆڕشەی بەرپاکردوە، بۆیە لەم چیرۆکەدا شتێکی زۆر ئاساییە کە سۆفی بڵێ:"... کوردەکەش دەستخەڕۆ نەبێ وچی ئەوێ بیدەنێ". دیارە دوکتۆر کاوس وەکو مێژوونووسێك دەوری هەندێك لە شێخانی تەریقەی نەقشبەندی لە شۆڕشەکانی کوردا شارەزایەو ئەزانێ ئەو سەرکردانە وەکو پیاوی ئایینبوون کوردایەتیشیان زۆر تیادابووە بۆیە شتێکی سەیر نییە ئەگەر(سۆفی)یەك کە پەیوەندییەکی گیانی لەگەڵ ئەوانەدا هەیە بڵێ:".... کوردەکەش چیی ئەوێ بیدەنی ئەگینا... دەست ئەدەمەوە ماوزەرە کۆنەکەم".

٢ـ دروستکردنی گرێ و کردنەوەی لە شوێنی خۆیدا بە هونەرێك ئەژمێرێت خاوەنی ئەم چیرۆکە توانیویێتی هەر لە ناو لێنانی چیرۆکەکەدا واتە(ڕاوەبەران) ئەو گرێیە دروست بکات و لە دوواییدا لە شوێنێکدا کردویەتییەوە کە هەر لەو شوێنەدا تێبگەین بۆچی ئەو ناوەی لە چیرۆکەکەی ناوەو دیسانەوە بۆ ئەوەی پێمان بڵێ کە کورد کوشتن وەك ڕاوەبەران بەلای دوژمنانەوە خۆشبووا. دەبوایە بۆمان هەیە بڵێین کە وەکو لە گرێ دروستکردن و کردنەوەکەیدا سەرکەوتووە لە ناو لێنانەکەیدا سەرکەوتووترە نابێ ئەوەشمان لەبیر بچێت کە ناو لێنانی چیرۆك هەروا شتێکی ئاسان نییە.

٣ـ کە دەست ئەدەنە چیاکەو پیادا هەڵئەگەڕێن گفتوگۆیەکی زۆر ساکار و ئاسایی ئەکەن. بەتایبەتی مەسەلەی ژن هێنان بۆ(ئەلە) باسێکە کە دەیەهاجار لەو شوێنانەدا

دووباره ئەبێتەوەو ئەیکەنە پێخوری بە شاخدا هەلگەڕاندن. باوکێك بێ پێچوپەنا یەکسەر لەگەڵ کورەکەیدا ئەکەوێتە گفتوگۆ و ئامادەیە ئەو کچەی بۆبهێنێ کە کوڕەکە دڵیپێوەیەو بەڵێنی وای ئەداتێ بۆجێبەجێکردنی کە(ئەله) بە تەواوی دڵنیاببێ، ئەمە سفەتێکی باشو ڕاستی ناو کوردەوارییەو لە ناو ئەو جۆرە خێزانە بێفرۆفێڵانەدا باوە بەپێچەوانەی زۆرەملێ و کچ بە زۆر بەسەرا سەپاندن و کوڕ بە زۆر بەسەرا ساغکردنەوەی ناو زۆربەی خێزانەکانی دەرەبەگ و بۆرژوازییەکان.

(هەناسەبڕکێ) و(بیانووی پشوودان) و(هەناسەی ساردی هیلاکی قووتدان) و(قسە لەگەرودا تاساندن و تف لە گەروودا ووشکبوون) ئەو دیمەنانەن کە لە سەرکەوتنی هەورازدا بەرچاوئەکەون، بۆیە خاوەن چیرۆك بە سەرکەوتوو ئەزانم لە گرتنی ئەو وێنە زینداووانەدا بەکامیرای خەیاڵ.

٤- بەلای منەوە ئەدیبی خاوەن بەهرە ئەوەیە کە بتوانێت خەیاڵی وورد بکاتەوەو ڕستەو دەربڕینی تازە دابهێنێت نەك بەدیار دەربڕین و ڕستە ووتراوەکانەوە دۆشدابمێنێت هەر کاوێژ بکات و شتی ووتراو بجوێتەوە، ئەگەر لەم گۆشەیەوە سەیری ئەم چیرۆکە بکەین چەند ڕستەیەکی وائەبینین کە(تەزووی بەتام ئەخەنە ناخی گیانەوە).

خاوەن چیرۆك واله(ئەله)ئەکات کە بەچاوی خەیاڵ(فاتە) ئەبینێ و(..... چاوێك بەو سنگە پڕەیدا ئەهێنێ کە مەمکە هەراشەکانی لە سەری چاوەڕوانی پەنجەیەکی نەوسنە تێرتێر هەڵیان گلۆفێت) ئەم ڕستەیە نەك هەر داهێنانێکە بەڵکو هەلگێڕانەوەیەکی سەرکەوتووانەشە، چونکە ئەوەی من بستبێتم تائیستا هەر ئەوە ووتراوە کە پەنجە چاوەڕوان و تینووی ئەوەیە کە لەمەمك بکەوێت، بەلأم ئەم بەجۆرێکی تر بۆی چووەو وای لە ئێمەکردووە کە ئەم بۆچوونە نوێیەمان لەوە پێ خۆشتربێت کە تائێستا بیستراوە، ئەم ئەڵێ مەمکە هەراشەکان چاوەڕوانی پەنجەیەکی نەوسن بوون و تینووی هەلگلۆفین!! ئەم هەلگێڕانەوە بەجێیانە لە ئەدەبی کوردیدا بووە و ئەبێ، مەولەوی ئەڵێ:

**گوڵ چون ڕووی ئازیز نەزاکەت پۆشان**

**بەفراوان چون سەیل دیدەی من جۆشان**

هەردی ئەڵێ:

**ئەگەرچی وەك خەیاڵی من عەبا دەوری لەشی‌داوە**

**لە ئەندام و لەش و لاری بڵندو ڕێکی ئاڵاوە**

کە ئەفسەرێك بەرامبەر سەربازەکانی بڵێ: (دەی بۆ مەشق) دیارە هەموو خێرا هەڵئەستن و ڕیزئەبن. کاك کاوس نەیویستوە ئەمە هەروا ساکارانە بڵێ بەڵکو ئەڵێ: "وەکو کارخانەیەکی ئامادە ئەوەندەی بەسبێ دەست بە دوگمەیەکدا بهێنێ خێرا هەموویان ڕیزبوون. ئەم ڕستەیە دیمەنێکی باشتر و ڕێکوپێکتر و بە پەلەتر دەهێنێتە بەرچاو وەك لەوەی بێوتایە: خێرا هەموویان ڕیزبوون. دیسان لە شوێنێکی تردا کە سێ گوللە تۆپ بەدوای یەکترا ئەتەقین و زەمین ئەلەرزێنن و شاخەو شاخ و دۆڵاودۆڵ دەنگ ئەدەنەوە، ئەو گوللە تۆپە نەگریسانەن کە پێنج کەسەکە ئەکوژن و یەکیان لێدەرناکەن. خاوەن چیرۆك هونەرمەندانە توانیوێتی بۆ ئەو دەنگدانەوەیە لە چیایەکەوە بۆ چیایەکی تر بڵێ: "وەکو گفتوگۆیەکی خوێناوی بە یەك بگەیەنن" بیرکردنەوە لە دارشتنی ڕستەیەکی واخەیاڵ و ووردەکاری تیادایە، چونکە توانیوێتی دەنگێك بێنێتە زمان، یان وا لە ئێمەبکات لەو دەنگدانەوەیەدا ئازارێکی تایبەتی یان گفتوگۆیەکی خوێناوی بهێنێتە بەر چاوی خەیاڵمان.

نووسەری کورد ژمارە(٣) ساتی یەکەم ئابی١٩٧١

کتێبی شانۆی سالار
هەولێر-١٩٩٩

# شەوێك لەتەك خەونە ئەرخەوانییەکەی(نالی)دا

ئێوارەیەکی درەنگی ڕۆژی پێنج شەممەی(٩)ی ئەم مانگی نیسانە، چوومە هۆڵی نواندنی ئەکادیمییەی هونەر لە بەغدا، بۆ بینینی(نالی و خەونێکی ئەرخەوانی) لە نووسین و دەرهێنانی کاك(ئەحمەد سالار) تیپی(شانۆی سالار)ی سلێمانی پێشکەشیان ئەکرد. شانۆیەکی بازنەیی لە ناوەڕاستی هۆڵەکەدا، خەڵك بە هەرچواردەوریدا دانیشتبوون، لەبەر جەنجاڵی، ژمارەیەکی زۆریش بە پێوە وەستابوون، کات گەیشتە حەوت و شتێك، ڕووناکی نەختێك کزکرا، تەپڵێك ووردە ووردە دەستی پێکرد، زۆر لەسەرخۆ، بەهێمنی و بەهێوری، بەرەو هەواری خەونە ئەرخەوانییەکەی(نالی)ی بردین.

بەڕاستی خۆشم نازنم چۆن لەو ئاو و هەوایەوە پەلیگرتم و وایلێکردم خەونە ئەرخەوانییەکە شتێکی ئاسایی بێ لەبەرچاوم، ڕووداوەکانیش وەکو بەسەرخۆم هاتبن وابوون. بۆیە کە ئەکتەرەکان ئەیانووت:"ئەم خەونە ئەرخەوانییەی(نالی) ئێمەو ئەو و ئێوە دەژێنێتەوە" من لە ئاستی خۆمەوە هەستم ئەکرد کە دەژێمەوە. خۆم لە ناخی خۆمەوە ئامادەی ئەو ژیانەوەیەبووم، دەنگی ئەکتەرەکانیش ئەوەندەی تر تیژیان ئەکردم و ئەیاندام لە هەسان.

لە تەختی سەمتورەکەی(سەمتور ژەن)ەوە، ئاوازێك هەستا، لە چاوتروکانێکدا بە دنیای ئەو خەونەی ئاشناکردم و وامئەزانی لە ناو ماڵەکانی(خاك و خۆڵ) و دەشتی شارەزوور و کۆڵانەکانی سلێمانی دام(حەبیبە)ی خۆشەویستی نالی، لە چاوی من و سەیرکەران و تەنانەت(نالی) خۆشیدا، سات بە سات گەورەئەبوو، تاوایلێهات هەموو نازداران و ناسکانی گرتەوە، کوڕ و کاڵانی گرتەوە، خاکی گرتەوە، حەبیبە کە(هەم

طیب وهەم طه بیبه) لەو شانۆگەرییەدا بووە خۆشەویستی هەمووان بۆیە بە هەموو هێزیانەوە چەپڵەیان بۆ کوتا.

لەشکری ڕۆمی وەکو گێژەلۆکەیەك خۆیکرد بە خاکی بەبەدا، حەبیبە حەبیبەی خەونە ئەرخەوانییەکە هاواری لێ هەستا چونکە ئەیزانی وەیشومەی شومەن، زیان کارو دڵ ڕەقن، دەست لە هیچ ناپارێزن، (سالم) وتەنی(ڕۆمی ئەوەندە شوومە لە شەخسیش دەخەن زەرەر) لێرەدا ئەبێ ئەوە بڵێم کە هونەرمەند، هەر هونەرمەندێك بێ شاعیر، وێنەکێش بە فڵچە و ڕەنگ، دەرهێنەر بە خەیاڵی بەرزی خۆی و یاریدەی رووناکی و ئەکتەر و کەلوپەلی پێویستەوە، کە دەنگ بڵاوبۆوە و ووتیان:"ڕۆمییەکان هاتن!!" گڵۆپەکان کوژانەوە و داگیرسان و کزبوونەوە، دەفەکان بەرزکرانەوە و لەرزین، وژەوژو دەنگێکی گێژەلووکە ئاسا هەستا، سامێکی خستەدڵەوە و دنیای تاریك کرد.

ئەمە هەر تەواو لەو وێنەیە دەچێت کە(سالم) بە ووشە کێشاوێتی. وێنە شیعرییەکە لای(سالم) و لای(ئەحمەد سالار) و هاوکارەکانی هەر کەسەیان بە شێوەی خۆی، هاتنی ڕۆمییەکانی، وەك گێژەلووکەیەکی سەر و دڵقورسی کەرو ناخۆشی، دێتە بەرچاو بۆیە(سالم)یش بۆ هەمان هاتنی ڕۆمییان ئەڵێ:

**لێم گەڕێن با گۆشەگیربم دەستە ئەژنۆ کەف زەنان**

**گێژەلوولەی بای نەدامەت تاری کرد صەفحەی جیهان!**

دوای ئەوە(دەرهێنەر) هونەرمەندانە بەراوردێکی سەرپێیی ڕۆژانی ڕۆمییە داگیرکەرەکان و ڕۆژانی لەوەوبەرئەکا و لەسەر زمانی ئەکتەرەکان شیعرەکەی شێخ ڕەزای بیری سەیرکەران دێنێتەوە:

**لە بیرم دێ سلێمانی، کە دار الملکی بابان بوو،**

**نە مەحکومی عەجەم نە سوخرەکێشی ئالی عوسمان بوو.**

لە(نالی و خەونێکی ئەرخەوانی)دا، کاك ئەحمەد سالار لە سەفەرەکەی نالی، پێشهاتنی ڕۆمییان دواوە.

بۆ ئەم مەبەستە سوودی لە ووتارە نایابەکەی(پیرەمێرد)ی شاعیر وەرگرتووە کە چۆن لەگەڵ بەرێکەرانیدا، دەچنەلای شەخسەکەی(وەیس) کە ئەوسا لە دەرەوەی

شاربوو. لەوێ دوعا خوازی ئەکا و ئاوڕێك لە سلێمانی و چیاوچۆڵی ئەداتەوە ئەوەێ لە ڕووی دەرهێنانەوە هونەرە ئەوەیە کە(سالار) یەکسەر ئەم چوونە لای شەخسی(وەیس)ی بە گۆرانییە فۆلکلۆرییە باوەکەی سلێمانی و دەوروبەرییەوە بەستۆتەوە، ئەکتەرەکان هەر بە ئاوازەباوەکەی خۆیەوە دەنگی لێهەڵ ئەبڕن:

**بابچینە سەر(وەیس) وەیسی خۆمانە**

**لە(وەیس) ئەپرسین، خەتای کاممانە**

بەمە شانۆگەرییەکە خۆماڵیبوو، هونەرەکە باڵاتر دەینواند چونکە بیرەوەرییەکان و شوێنەکان و گۆرانییە فۆلکلۆریەکان و حەبیبەو نالی و خەونە ئەرخەوانییەکە هەموویان وەك پاساری لەسەر تالێکی پرشنگی چاوی سەیرکەران ئەنیشتنەوە و ڕێك دەچوونە پاڵ یەك، هیچ ناڕێکی و لەیەك نەچوونت رەچاونەدەکرد.

دیسان وەکو پیرەمێرد لە ووتارەکەیدا بۆی چووە، نالی کە لای(وەیس)ەوە کەوتەڕێ دوائاوری لە شار و شاخ و کێو و بەڕێکەرانی دایەوەو چاوێکی پیادا گێڕان نەی ئەزانی کە ئەوە دواچاوپیاداگێڕانە و ئیتر نایان بینێتەوە(تایەومی نەفخی صور).

(ئەحمەد سالار) هەڵوێستەکەی هەروا ڕووتوقووت بەجێنەهێشتووە، توند بە گۆرانییەکی باوی ئەم سەردەمەی ئێستاوەی یەستۆتەوەو شەتەکی داوە، بۆ ئەوەی بە مەبەستی(نالی و خەونێکی ئەرخەوانی)یەوە ببەستێتەوە، هاتووە ووشەکانی گۆڕیوە، بەم گۆڕینە کارێکی باشیکردووە، چونکە ئەگەر واینەکردایە گۆرانییەکە لەگەڵ مەبەستەکانی دیکەدا جووت نەدەبوو، ئەوسا نەدەچووە سەر تاڵێکی پرشنگی چاوی سەیرکەران و پاڵی نەئەدا بە پاڵ پاسارییەکانی دیکەوە. ئەکتەرەکان لەسەر ئاوازەکەی(حەمەی ماملێ) بەیەك دەنگ دەیان ووت:

**کۆچی نالی کۆچی سوورە         مامە خەمەی شارەزوورە**

**ڕاستە نالی مامە خەمەی شارەزوور و هەمووی شاری شارەزوورە.**

بۆیە لە ئاوارەییشدا ئەیووت:

**قوربانی تۆزی ڕێگەتم ئەی(باد)ی خۆش مروور**

**وەی پەیکی شارەزا بە هەموو شاری شارەزوور**

بەڵێ ڕۆمی بەتەختوبەختی خاکی بەبە شادبوون ئەیان ویست لە خەڵکی بگەیەنن کە هیچ نەبووەو نە(با) بینراوەو نە(باران)، کار بە دەستانی پێشوو جێگایان هەرزەنێرە، ئەوەندە هەیە ئەوان ڕۆیشتوون و عەبدوڵا پاشای عوسمانلی و دەست ودایەرەی هاتووتە شوێنیان، بەڵام ئەو قسانە نەدەچوونە گیرفانی کەسەوە، تەنانەت(جارچی)ش کە جاڕیدا بە شارداو بانگی بوونە(موتەسەرف)ی عەبدوڵا پاشایدا بەگوێی ئەو خەڵکەدا بە گاڵتەپێکردن و لاقرتییەوە بانگیدا هێشت و جاریدا، چونکە دەیزانی نەخۆی و نەکەس بڕوایان پێ نییە. ئەو فۆلکلۆرەی کە ئەڵێ:

**خانەقا و حوجرە و حەسارم، بۆتە موڵکی ڕۆمییان**

**ڕەبی ڕۆمی هەر زەلیلبێ، دوور لە سوڵتانی جیهان**

ئەڵێم ئەم فۆلکلۆرە هی ئەو سەردەمەیەو لەو ساوە هەیە(داری شێخ هەباس)یان بڕی، داری پیرمەسوور لەخەم و مەینەتدا(پیرو ئیفتا دەتەن)بوو.

چاو بڕابووە ئەکتەرەکان، گوێ بۆ ئاوازی دەست و پەنجەی سەمتور ژەن هەڵخرابوو. ئەمانویست لە خەونە ئەرخەوانییەکەی نالیدا بخەملێنن، تێبگەین، ئەکتەرەکان بەیەك دەنگ و یەك سۆز، چوارچێوەیەکی پڕۆپوختیان بۆ خەونە ئەرخەوانیەکە دروستکرد، چونکە ووتیان خەونی نالی بە تەنها حەبیبەیە و حەبیبە دڵدارە، حەبیبە گوڵێکە هەزاران گوڵی گرتووە کاك(نەهرۆ ساڵح) کە دەوری(نالی)ی ئەبینێ. شیعرەکەی(نالی)ی ئەخوێندەوە و دەیووت:

**(یاری من تەنها گوڵێکە سەت هەزاری گرتووە).**

حەبیبە، پەپوولەیەکە خەم خۆری گوڵانی باخی نیشتمانە، بۆیە ئەکتەرەکان سێ دەف لەسەرباڵی ڕاست و سێ دەف لەسەر باڵی چەپی دا ئەنێن، لێپرسراوی ڕووناکی تیشکی گڵۆپێکی بەهێزئەگرێتە باڵ و ڕووی حەبیبە، دیمەنەکە پەپوولەیەك دەردەچێت لە جیاتی دڵێ سەددڵ حەیرانی ئەبێ، بۆیە منیش لە جیاتی جارێ، سەتجار ئافەرینی(دەرهێنەر)م کرد.

حەبیبە پەلکە زێڕینەیە بۆ ئاسمانی کوردەواری، بۆیە ئەکتەرەکان دەفەکانیان کەوانەیی لەسەر سەری حەبیبەڕاگرت، ڕووناکی نەما، لە پڕ تیشکێك ئاڕاستەی سەری

حەبیبەکرا، پەلکە زێڕینەیەك دەرچوو وەك پەلکەزێڕینەکەی خەیاڵی ڕەنگاوڕەنگی گۆران:

**پەلکە زێڕینەی پاش بارانی زۆر**

**چەماوەتەوە بەرامبەر بە خۆر**

لێرەدا، لە دڵی خۆمدا ئافەرینێکی گەرمی نووسەر و دەرهێنەر و لێپرسراوی ڕووناکیمکرد، چونکە حەبیبەیان کردە پەلکەزێڕینەیەکی ڕەونەقدار و هەمیشەیی ئاسمانی خاکەکەمان.

دوایی پێهێنانی شانۆگەریی نالی و خەونێکی ئەرخەوانی، دوایی پێهێنانێکی هونەرانە و داهێنانێکی لێهاتووانەبوو، حەبیبەی خەونە ئەرخەوانییەکە ژان ئەیگرت، ئەکتەرەکان بەیەك دەنگ ئەیان ووت:"ئافرەتەکە ژان ئەیگرێ، وازیی لێبێنن باهەزاران منداڵی ببێ".

هاوکاری / ژمارە ٨٨٧ / ٩٨٧/٤/١٦

# ڕەشپۆشێکی جیهانی چوارەم

## هەڵسەنگاندن و ڕەخنەکاری

کە کورتە چیرۆکەکانی ناو (ڕەشپۆشێکی جیهانی چوارەم)ی کاک (مستەفا ساڵح کەریم)م خوێندەوە، چەند تەکنیکێکی نوێ و هونەری چیرۆکنوسین و دەستخستنە سەربرینی قووڵم هاتە پێش چاو، دیسان سەیرم کرد کە کاک مستەفا پاڵەوانانی کورتە چیرۆکەکانی ئەبینێو وایان گفتوگۆ پێئەکات، وایان هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەکات کە ببێتە پاڵپشت و یاریدەدەری ئەوانەی ئەیانەوێت لە دەروونی ئەو پاڵەوانانە بگەن و دەست بکە بە شیکردنەوەی دەرونی). ئەمەش شتێکی سەیر نییە چونکە (خزمایەتییەکی زۆر نزیک لە نێوان شیکردنەوەی دەرونی و ئەدەبدا هەیە، هەردوکیان بە دوای راستیدا ئەگەڕێن، هەردوکیان بایەخ بەو هێزانە ئەدەن کە پاڵ بەو مرۆڤەوە ئەنێن).

لەبەر ئەمانە لە دڵی خۆمدا بڕیارم دا کە هەڵیانسەنگێنم و بەپێی توانای خۆم لەرووی رەخنەکارییەوە لێیان بدوێم.

خۆیان چۆن ریزکراون هەر بەو پێیە لێیان ئەدوێم، تکام ئەوەیە کە خوێنەری بەرێز یەك بەیەکی ئەو کورتە چیرۆکانەی خوێندبێتەوە ئینجا دەست بداتە ئەم نووسینەی من، چونکە ئەگەر وانەبێت لە یەکترناگەین، شایانی باسە کە هەوڵی ئەوە ئەدەم ئەم نووسینەم کورت بنووسم و هەتا بتوانم بیگوشم.

### أ (باوەڕنامەی لەدایك بوونی گوڵێك)

پاڵەوانانی ئەم چیرۆکە سێ کوردن روخاوێك و نەبەزێك کە ڕۆژێك لە ڕۆژان هەرسێکیان خۆیان لە یەك بەندیخانەدا ئەبیننەوە!!

دیاره نەبەزەکە ڕێگای خۆی گرتووەو دڵداری لەگەڵ بیروباوەڕی خۆیدا ئەکات و هیچ باکی نییەو باجی ئەم کارەی چییە ئامادەیە بیدات، هەرچی هەڵخلیسکاوەکەیە هەردوو کونەگوێی خۆی ئاخنیوەو وائەزانێت ئەو درۆیەی خۆیی پێ خەڵەتاندووە خەڵکیشی پێ ئەخەڵەتێت، بەڵام کلۆڵ (رووخاوە) کەیە کە لە ناخی دەروونیدا شتێکەو بە ڕواڵەتیش شتێکیتر، لەلایەك تووشی نەخۆشیی ڕاڕایی و لە لایەکی ترەوە شەخسیەتی دوولەت بووە، هەر لەتەیان لە ئاشێك ئەکات... (ئەحمەد لە پووره هەنگی سەریا، هاتوچۆی بەسەر تولەماری دوودڵیی خۆیدا ئەکرد) (.. پووره هەنگەکە بڕیارێکی یەکسەریی تێدانە دەگیرسایەوە) (ئەوەندە سەرت قاڵە نازانی شتەکانت لەکوێ فڕێ ئەدەیت) (بە ددان نینۆکەکانی خۆی ئەقرتاند...) (...ووشەی چ بڕیارێکت دا؟ هەزار هەڵبەزودابەزی بەدڵی دەکرد) (دوو دەنگی جیاواز هاواری لێئەکرد) (ئەحمەد دوو ئەحمەد بوو).

ئەگەر بە وردی وەك هاوڕێیەکی دێرینی کاك مستەفا لەیەك دوو چمکی ژیانی وورد ببمەوە زوو ئەگەمە ئەوەی کە (دلێر) لە هەندێك ڕووەوە رەنگ دانەوەی کاك مستەفا خۆیەتی، چونکە ئەم هاوڕێیەکی گیانی بە گیانی حەسەن تۆفیقی جوانەمەرگ بوو، کە حەسەن لە ئاوارەیدا بە نەخۆشیی وەناق مرد، کاك مستەفا زۆر بۆی پەرێشان و پەرۆش بوو، دوای چواردەی تەموزی ١٩٥٨، بەماوەیەکی کەم (زڕەی زنجیر)ی بەوێنەیەکی گەورەی (حەسەن)ەوە، بڵاوکردەوە، واتە یەکەم هەڵی هەڵکەوتووی بۆ یادی ئەو قۆستەوە، بۆیە کە ئەڵێ (دلێر لە خەویا حەسەن تۆفیقی جوانەمەرگی بینی،) من یەکسەر کاك مستەفا خۆیم هاتەپێش چاو، بەتایبەتی کە چەند جارێکیش لە ژیانیدا زیندانی دیوە.

با لە رووی داهێنانی رستەی نوێی پڕ لە ناوەرۆکی خەستوخۆڵەوە، سەیربکەین، ووشەیوا ئەبینین لە رستەدا کە بە پانی و درێژی و قووڵییانەوە، تەزووی سەیر سەیر بە لەشدا دێنن، وا لە خوێنەر ئەکەن کە چەند جارێك سەرنجیان بدات، (لەزیندانێکا کە دەرگاو پەنجەرەکانی لە دیوارەکانی وەرزبوون...) (لە زیندانێکی تاریکدا، کە تیشکی خۆر بە دزیشەوە خۆی پێدا نەدەکرد،) جاری وا هەیە (تەنیا) وشەیەك لە لای دوو

دەستەی دوژمن بەیەك، دوو مانای پێچەوانە ئەدات، چیرۆكنووس لە بەرگێکی جواندا ئەمەی پیشانداوە. ئەوەی لە زیندانا دلێر ئازار ئەدا پێی ئەڵێ:"ئەمە حاڵە ئێوەی تیان، ئاوا ریسوا بوون." کەچی ئەو بە خەیاڵ (تریفە) پێی ئەڵێ:"دلێر نەکەی خۆت ریسوا بکەیت". واتە (ریسوا)ی کابرا (ریسوا)یەکی تری بیرئەخاتەوە کە ئەبێتە پاڵپشتی خۆڕاگرتنی"، ئەو ئەیەوێ بە (ریسوا)ی خۆی ئەم بڕوخێنێ کەچی نازانێت کارتێکردنەکەی هەر تەواو پێچەوانەیە.

کابرای چەتەوڵ ئەڵێ:"هابخۆ ئەوە دەردت بێ ئەڵقە لە گوێ..." کەچی ئەم بەو ووشەیەدا بە خەیاڵ تریفەی دێتە بەرچاو و پێی ئەڵێ"دلێر، با ئەم ئەڵقەیەت پێشکەش کەم بۆ یادگار و لەبیرت نەچم..."، بەم خەیاڵە خۆشەوە ئیتر دلێر چۆن خۆی ئەدۆڕێنێ!.

ئەمەوێ بە دیمەنی (عەبدوڵا) هەڵخلیسکاوەکەی ناو بەندیخانە دوایی بەم نووسینەم بێنم، دیمەنێکی سەیرە، لە بەندیخانەکە بەنجەکە بەرێئەدات، بە تەمای خانوو موچەزۆربوون بوو، بۆ ریش چوو، سمێڵیشی نایە بانی، وا دیارە نازانێت کە کڕیارەکەی هەر ئەوەندە ئیشی پێیەتی تا ئیشی خۆی پێ جێبەجێ ئەکات و دوایی وەك خوێڕییەك بەڕەڵڵای ئەکات و ڕیسوا ئەبێت، لێرەدا ئەبێ عەبدوڵڵا نەختێك لە شیعرەکەی (بێکەس)ی شاعیری بێتەوە یاد، لەگەڵ جیاوازییەکی زۆردا، بێکەس بە ناوی میللەتی کوردەوە بەرامبەر ئینگلیزە داگیرکەرەکان ئەم شیعرە ئەڵێ، بەڵام عەبدوڵڵا بە ناوی خۆیەوەو بۆ خۆی، لەگەڵ گۆڕینی (٢٧) ساڵە بە (ئەمە چەند ساڵە) دەرحەق بە حاڵی خۆی:

**ئەمە چەند ساڵە من ئەڕمتێنی**
**بە فرۆفیشاڵ ئەم خەڵەتێنی،**
**رۆژی نەوعێکم هەڵئەپەڕێنی،**
**کە ئیشت نەما وازم لێ دێنی...**
**گوناهم چیبوو بەم دەردەت بردم**
**بۆچی بە ناهەق وا سووکت کردم!!**

**٢- (سێ وێنە و ڕێبوارێکی ماندوو)**

ئەم کورتە چیرۆکە بە ڕواڵەت خەوزڕانێکە، بیرکردنەوەیە لەسێ جۆر خۆشەویست و گفتوگۆ لەگەڵ هەریەکەیاندا تاوەکو چیرۆکنووس ووتەنی: "بەشەکەتی دەچێتە باوەشی خەوەوە".

تۆ با بڵێین ئەو سێ ناوە هەربەکەیان جۆرە هەڵسوکەوت و ڕەوشت و فەلسەفەیەکی لە ژیانیدا هەیە، کاك مستەفا لەگەڵ هەریەکەیاندا بە جۆرێك مامڵەی بووەو بەپێی جۆری پەیوەندیی و ئاشنایەتیی ئەوسایان ڕازو گلەیی ئەکەن. دوای ئەو هەموو کارەساتانە کاك مستەفا هیوای هەر ئەمێنێت و(لەگەڵ چاو بڕینە دوا ڕۆژا) چیرۆکەکە تەواو ئەکات.

زۆرجار دڵداری لەگەڵ بیروباوەڕدا خەست و خۆڵتر ئەبێت وەك لە دڵداری و خۆشەویستی لەگەڵ کچێکدا، بۆیە لە ناونانی ئەو کچانەدا، هەریەکەیان بە پێی هەڵسوکەت و ڕەوشتیان بۆیە لە ناونانی ئەو بیروباوەڕانەدا بە ناوی کچانەوە هیچ جۆرە نەشازییەك نابینم لێرەدا پاڵەوانی کورتە چیرۆك یەقدانەوەی چیرۆکنووس خۆیەتی.

لە ئاخر و ئۆخریی چلەکاندا (گێلاس)ی بە ڕەنگە ئاڵەکەیەوەو چوو بەدڵدا، هەر لە هەمان کاتدا لە (پرشنگ)یشەوە نزیك بووو ئەویشی چوو بەدڵدا، چونکە هەردوکیان وەك سێوێك وابوون و کرابوون بە دوولەتەوە، یان وەکو خۆی بە پرشنگ ئەڵێت:"خۆشەویستیم لەگەڵ گێلاسا لەناو خۆشەویستیی تۆدا توابووەوە" لە بنەڕەتا دوو کچی وەك یەك بوون، ئەوەندە هەبوو بە پێی ئەو ڕۆژگارەو بۆ سەردەمێکی کەم خایەن (پرشنگ) لە (گێلاس) زیاتر دەرئەکەوت و زۆرتر بەسەر دەمی خەڵکەوەبوو. هەڵسوکەوت و ڕەوشتی سێیەم بەلای کاك مستەفاوە لە کچێکی پرچ زەردا بە ناوی (یادگار)ەوە خۆی ئەنوێنێ، خەڵکیش هەر وایان ئەزانی کە (یادگار) ڕەنگی زەردی لاپەسەندترەو کردوێتی بە دروشمی خۆی. دیارە ئەم (یادگار)ەش هەر لە چلەکاندا سەری هەڵدابوو، وەکو بەقسەکانی چیرۆکنووسدا دەرئەکەوێت، ئەم پەیوەندییەکی ئەوتۆی لەگەڵدا نەبووە، تەنانەت لای پرشنگ پاکانە بۆ ئەو ماوەیە ئەکات کە لە

ناوەڕاستی هەفتاکاندا نەختێك لە (یادگار) نزیك بووەوە، وەکو خۆی ئەڵێ:"بڕوات بێ، مەسەلە نە (یادگار) بوو نە پرچی زەردی، شتەکە زۆر لەوە گرنگتربوو، باخچە خۆشە پڕ لە درەخت و گوڵوگوڵزارەکەی ماڵی یادگار، دوشمنان دەوریان دابوو، چاویان تێ بڕیبوو ... هتد) لێرەدا چیرۆکنووس باخەکەی هەر بە باخی ماڵی (یادگار) داناوە کە بەلای منەوە باخی هەمووانەو نە ئەبوو بڵێ "غیرەتم قبوولی نەکرد بە بەرچاومەوە، باخەکەیان پێ شێل بکرێ... هتد"، بەڵکو باخە رازاوە دڵگیرەکەی هەمووان گلەیی و مشتومڕەکەی چیرۆکنووس لەگەڵ یادگاردا واتە (یادگار)ی پرچ زەرد، گەرم و گوڕی و قسەی لەرووی زۆر تیادایە [1]، یان راستتر بڵێم چی لە دڵدایە ئەیڵێت، دواجار ئەڵێ:"ئەمەوێ پڕ بە سییەکانم هەوای پاکی بێگەرد هەڵمژم، هەوای ژیانەوەو سەرکەوتن، هەوای بردنەوەیەکی نوێ دوای چەند جارێك دۆڕاندن".

با سەرلەنوێ چاوێکی تر بەم کورتە چیرۆکەدا بخشێنینەوە.

کاتێك کە ئەڵێ:"... شەوێکی سەیرە لەو شەوانەیە کە لە بیرناچنەوە، ئەبێ خەو لە کوێ بێ؟". خۆی وەڵامی پرسەکەی خۆی ئەداتەوە"خەو ئێستا میوانی ئەوانەیە کە دەستیان لەملی ئەو گوڵە باخە نەژاکاوانەدایەو بە مژینی شەرابی لێویان مەست بوون، پزیسکی کارەبای گۆی مەمکە قنجەکانیان لە سنگیان کەوتووەو سڕی کردوون، بەدەم نۆشینی گوڵاوی گوڵی ئاڵەوە خەوبووە بە میوانیان" من دەنگی ئەو وەڵامەم لەسەر دەمی رێبوارێکی ماندوو، خۆش نایەتە بەر گوێ، ئەمە کارتێکردنی (دڵداری کچی تازە)ی [2] چاپی یەکەمی (رازی تەنیایی) تەواو پێوەدیارە، بەڵام ئەم زۆر پێی لێ هەڵبڕیوە، وشەکان رووتو قووتن. پاڵەوانەکە کە رێبوارێکی ماندووەو بە دەست ئەو بیروباوەڕانەی کە لە (گێلاس) و (پرشنگ) و (یادگار)دا خۆیان ئەنوێنن و چاوی (دوای سەعات یەکی پاش نیوەشەو)ی ناچێتەخەوو خەوی ئەزڕێت. ئەو خەیاڵە تۆخەی لێ نایەت، وەکو ئەو وشانەی بۆ داتاشرابێت وا دێنە بەرچاوم، وەکو زۆر لە خۆکردن و

---

[1] بەرامبەر ئەو گلەیی و مشتومڕە رایەکی تایبەتیم هەیە، کام مستەفا لە کورتە چیرۆکی (قەڵەم)یشدا گەڕاوەتەوە سەر هەمان گلەیی لەوێدا منیش راکەی خۆم دەرئەبڕم وەك وەڵامێك بۆ ئەوێ و ئێرە.

[2] (ئەم دڵەی وەك بتپەرستێ روو ئەکاتە چاوەکەت)

قسە تێترنجاندنی تیادابێت وایە. کوردییەکەی ئەمەوێ بڵێم ئەمە لە خەیاڵی یەکێکیتر ئەچێت نەك رێبوارە ماندوو شەکەتەکەی خۆمان.

لە رووی زمانەوە ئەم سەرنجەم هەیە(رێگای ژیانی بە کوچك و کەڵەك و درکەزی چاند)[٢] (چاند) بۆ گوچك و کەڵەك نابێت. لەشوێنێکی تردا (ل٣١) ئەڵێ:"چونکە هەندێ قسەکار لە مێشك و دەروون ئەکات"، لەبەرئەوەی(هەندێ) لە کوردیدا لە یەکێك زیاترە، ئەبێتە (کۆ ئەوجا ئەبێ بڵێین (ئەکەن) نەك (ئەکات).

## ٣. ژیلەمۆ

ئەم کورتە چیرۆکە دەق چمکێکی ژیانی ساڵێکی خاوەن چیرۆکە. کە لە پێناوی (شەوبۆ)دا دابوویە چیاوچۆڵ. (ئازادی)ش لەو وشانەیە کە لە خۆشەویستیدا خەڵك بە ئارەزووی دڵی خۆی ناوی لێ ئەنێت ئەی بۆچی چیرۆکنووس هەقی نەبێت ناوی (شەوبۆ)ی لێ بنێ مەسەلا. لە ساڵی ١٩٧٦دا، لەشاری (رومادی) لەو بیابانەدا نووسیوێتی، دوای ئەوەی وەکو خۆی ئەڵێ"ئەم جارەیان لەتواناما نەبوو بە شەوبۆ شادبم" دیارە ئەو رۆژانە، دوای بە شەوبۆ شاد نەبوون پشت شکاوو زامی برین نوێ بووە، ئەگەرچی دوایی چیرۆکەکە بەوە دەهێنێتەوە کە رۆژێك دێت دەست لە ملی (شەوبۆ) بکات و دڵنیایە لەو رۆژە.

چیرۆکنووس تەکنیکێکی نوێی لێرەدا بەکارهێناوە، بەستنی چەند چمکێکی ژیانی خۆی بە ژیانی پاڵەوانی داستانێکی (بابلی)یەوە، شکاندنەوەو بەستنەوەی رووداوەکانی خۆی بە رووداوەکانی ناو ئەو داستانە بە شێوەیەك کە ئەقڵ بیگرێت و رێك و رەوان بڕوات، وا خوێنەر بەلای خۆیدا رابکێشێت کە ناچار ببێت چیرۆکەکە تەواو بکات، رەنگە بووترێت خۆشەویستەکانیان جیاوازن، ئەویان (عیشتار) و ئەمیان (شەوبۆ)یە، دیارە ئەو (شەوبۆ)یەی چیرۆکنووس مەبەستێتی، لەوەڵامدا ئەڵێم: هەردوکیان دڵدارن ئەویان عاشقی (عیشتار)بوو، ئەمیان (ئازادی)، خورپەو تەپەی دڵیان یەکە، قوربانی و دەست لە خۆشتنیان یەکە، (عیشتار و شەوبۆ) هەردوکیان ئاواتن، ئاواتیش پێویستیی بەخوێنی جگەر هەیە، سەیری ئەم پێکەوەبەستن و سەری رووداوەکانی هەردوولا

[٢] رەشپۆشێکی جیهانی چوارەم ل ٣٥

بەیەکەوە چەسپکردنە بکەن... تەمووزی شوان گیرۆدەی چاوی عیشتارە، ئەمی دلّداریش (هەر تەنیا ناوی شەوبۆ بهێنرایە تەزووو بە هەموو ئەندانی لەشیدا) ئەهات، تەمووز خەوی نەما چاوی ئەبرپیە ئەستێرەکان، ئەمیش لەگەلّ ئەستێرەدا کەوتە چاوشارکێ، تەمووز کە تووشی عیشتار ئەبوو، زمانی لالّ ئەبوو، ئەمیش کە (شەوبۆ)ی دی هەرچی ووشەیەکی ئامادەکردبوو کە بلّێت پچرپچربوون و بوونە یەك ووشەو لە دەمی دەرچوو.

ئەم جۆرە تەکنیك و بۆچوونە، چیروك لە قاوغەکۆنەکەی جارانی رزگار ئەکات. رادەی رۆشنبیریی چیرۆکنووس پیشان ئەدات.

ئەوە دەردەخات کە خوێندنەوەو موتالاّ لە هەر مەیدانێکی زانست و ئەدەبدا بێت، زەمینە بۆ بەهرەو هەلّکەوتن و سەلیقە خۆش ئەکات.

تەمووز لە یەکەم رۆژی مانگی نیساندا لە وولاّتی هات و نەهاتەوە گەڕایەوەو (هەموو جەماوەر بەبۆنەی گەڕانەوەی تەمووزی خۆشەویستیانەوە بەشداریی ئاهەنگێڕانیان کرد) ئەمیش سالێکی بەسەر بردبوو، چاوەڕوانی چەپکە گولێك بوو بیباتەوەو بیدا لە سەری شەوبۆو گەڕانەوەکەشی هەر لە دەوروبەری نیساندابوو، بەلاّم چۆن گەڕانەوەیەك یەکێك خاکی ژێرپێی هەرەس بینێ، ئەبێ حالّی چی بێ.

لە دوای ئەو شەکەتی و شپرزەیی و دلّشکاوییە، دوای گەڕانەوە بەر تیروتوانج و سەرزەنیشتی ئەم و ئەویش ئەکەوێت، لەناو ئەم دووئاگرەدا، تووشی حالەتێکی دەروونی دەبێت، هەلّئەچێت و یەخەی ئەوانە ئەگرێت کە تیری تێئەگرن و تانەی لێئەدەن.

ئەگەر ئێستا چاوێك بەو گەڕانەوەیەدا بگێڕینەوەو ئەو وێنانەی بهێنینەوە بەرچاو کە چیرۆکنووس لەو کات و رۆژگارەدا گرتوونی، سەیرئەکەین زۆر راستگۆیانە هاتۆتە مەیدانەوە، چ لەگەلّ خەلّك و چ لەگەلّ خۆیدا، ئەو رستەو ووشانە ئەگەرچی لە دلّ و دەرونی ئەو هاتونەتە دەرەوە واتە (زاتی)ن بەلاّم بۆ هەزاران کەسی دیکەی ئەو

ڕۆژگارەی ئەوساش ئەبوون، واتە بووبوە حاڵەتێکی دەروونی نەك تەنیا کەسێك بەڵکو هەزاران کەس.[٤]

دوایی چیرۆکەکەشی وەکو لە سەرەتاوە ووتمان بەوە دەهێنێتەوە کە (ڕۆژێك دێت لەژێر سێبەری گوڵاڵە سوورەی کوردستانا بەبێ ترس دەست لەملی شەوبۆ) بکات.

لە رووی زمانەوە چەند سەرنجێکم هەیە. (قەلەرەشەکان هەوڵیان دا چاوەکانم و زمانم هەڵکۆڵن[٥]....) هەڵکۆڵین بۆچاو ئەبێت بەڵام بۆ (زمان) نابێت. بۆ زمان بڕین ئەبێت.

واتە ڕاستیەیەکەی ئەمەیە کەبڵێین (چاوەکانم هەڵکۆڵن و زمانم ببڕن).

چیرۆکنووس ئەڵێ:"بەخۆما ڕائەبینی دیواری دەنگ کوناودەرکەم" ئەمە وەرگێڕانێکی کتومتی(اختراق الحاجز الصوتی)یە کە خوێنەرێکی کورد ئەبێت عەرەبی زۆرباش بزانێ و مانای ئەو زاراوەی هەزم کردبێت ئینجا لە مەبەستی چیرۆکنووس ئەگات، تۆ با واز لە وشەی کوناودەربێنین و بێینە سەر دیواری دەنگ کە بە عەرەبی (حاجز الصوت) و بە ئینگلیزی(SOUND BARRIER)ە، کە ئەمانەوێ بیکەینە کوردی ئەبێ لەسەری بخوێنینەوەو تێبگەین کە مەبەست بۆچیەو لەچیەوە هاتووە ئنجا بگەڕێیین لە زمانەکەی خۆماندا زاراوەیەك لە مێشکماندا گەڵاڵە بکەین و وورد ووردە ئەم دیوو ئەو دیوی پێ بکەین تا دوابڕیاری لەسەرئەدەین ئنجا دایبنێین، هەرچەندە زۆرجار ئەمە ئەرکی چیرۆکنووس یان شاعێرێك نییە بەڵام لە زمانێکی وەکو زمانی ئێمەدا لە رووی ناچارییەوە ئەبێ چیرۆکنووسێك یان ئەدیبێك ئەو ئەرکە

---

[٤] لە لێکۆڵینەوەی مێژووییدا و لەشی کردنەوەی حاڵەتی کۆمەڵایەتیی ئەو سەردەمەدا، ئەو دیمەنانەی چیرۆکنووس نیشانی داون وەکو بڕوانامەیەك پشتی پێ دەبەسترێت، هەر وەکو چۆن شیعرەکەی حەمدوون:

ئەم ڕۆژە چە ڕۆژێکە کە عالەم شڵەژاوە

دنیا بە چە خارێ جگەری قیمە کراوە

لەهێنانە پێش چاوی حاڵەتی کۆمەڵایەتیی ناو کوردەواریی سەردەمی یەکەم شەڕی جیهان، تا ڕادەیەك لای مێژوونووسان بایەخی هەیە، ئەم دیمەنانەی چیرۆکنووسیش شتێکن وا.

[٥] ڕەشپۆشێکی..... ل ٤١ دێڕی (٢)

بگرێتە ئەستۆی خۆی بۆ ئەوەی خوێنەر لە بەرهەمەکەی بگات و لەلای رەوان بێ، یان چی تێدا ئەبوو ئەگەر بە چەند دێرێك كاك مستەفا ماناکەی لەسەرچاوەیەکی زانستییەوە وەربگرتایەو لەپەراوێزدا بینووسیایە. ئەوەتا ئەگەر كاك مستەفا لەو (الحاجز الصوتی)یە شارەزا بوایە ووشەی (کوناودەر)ی بەکار نەئەهێنا چونکە ئەو (حاجز)ە کوناودەر نابێت بەڵکو ئەشکێتەوەو لە شێوەی قوچەکێکدا ئەچمێتەوە.[٦]

دیسان چیرۆکنووس ئەڵێ:"با درك و پەیکوڵی بەپێمابچی، با بەفروزریان رەقم کاتەوە" راستییەکەی ئەوەیە بڵێ (بچن) و (رەقم کەنەوە)

## ٤. (تەزووی خەم لە گۆرانیی دڵدارەکاندا)

بۆردومانە، خەڵکەکە شپرزەئەبن و ئەپەشۆکێن، بە پاڵەپەستۆ خۆیان ئەکرد بە ژێر زەمینەکاندا، بۆردمان هەر بۆردومانە لە هەر شوێنێك بێت ئەم شڵەژان و سەر لێتێك چوونەی تیادا ئەبێت ئیتر با قاهیرە نەبێت شارێکی فەلەستین بێت، نەو با ئەمیش نەبێت یەکێك لە شارۆچکەکانی هەرووڵاتێك بێت، چ کارێك ناکاتە سەر پێشەکیی کورتە چیرۆکەکە، با سەری خۆمان بەو شتەوە نەیەشێنێن و خۆمان بەوانەوە خەریك نەکەین نەوەکو سەرمان لێ تێك بچێت) با بێینەوە سەرکورتە چیرۆکەکەی خۆمان و بڵێین: لێرەشدا قارەمانی کورتە چیرۆکەکە هەر یەقدانەوەیەکی دیاری چیرۆکنووس خۆیەتی، لێرەشدا مەسەلەکە هەر عاشق بوونەکەیە، لە کورتە چیرۆکی پێشوودا ناوی (شەوبۆ)ی لێ نرابوو، لێرەدا (نێرگس).

کاتی خۆی لە (هۆڵی مرواری) هەست بەوە ئەکات کە ئەبێ زۆرتر لە (نێرگس)ەوە نزیك بێت، یان رۆشنتر بڵێم بۆ سەرکەوتنی (نێرگس) هەوڵ بدات، لە پێشدا ناوی نەبردووە یان نەی ویستوە ناوی بەرێت یان وەکو خۆی ئەڵێت:"دەرفەتی ئەوە نەبوو کە خۆمت پێ بناسێنم"، دوای کپ بوونەوەی ئەو بوردومانە ئەبینێت، بەڵام هێشتا هەر ناوێرێت ناوی بێنێت تا (نێرگس) لە گێژاوی ئەو نەوێرانە، یان بایڵێین ئەو شەرمە رزگاری ئەکات، سەیربکەی بزانن چیرۆکنووس چۆن هونەرێکی نوێی پیشان

---

[٦] السلسلة العلمية، عبد الخالق ثروت، الرقم (٢٦) دار ثقافة الاطفال، دار الحرية للطباعة. بغداد. ١٩٨٤ ل(٥)

داین، سەرنج بدەن ئەوەی ئەو کردویەتی بە پێشەکی، لە زنجیرەی ڕووداوەکاندا دوای بینینەکەی (هۆڵی مرواری) دێت، لەو شوێنەوە کە ئەوی تیادایە بابڵێین بینایەکی بەرز و (تەلار)ێکە لە چاو خانوبەری ئەو ناوەدا، لەوێوە ئەڕوانێتە چیاکەی بەرامبەری و سەر لووتکەی چیاکەی وا دێتە پێشچاو کە ئەڵێی (مرواری)یەو ئەدرەوشێتەوە، ئنجا بەو ووشەی (مرواری)یەدا خورپەیەك دێت بەدڵیداو (هۆڵی مرواری)یەکەی لەمەڕ شاری بەغدای دێتەوەیاد. شەوێك لەو هۆڵەدا یەك دوو دەستەخەڵکی تر دەبینێت کە ئەوان بیروڕایان وەکو ئەم نییە(گوڵشەن و لاوەشاعیر)ەکە بە دوو دڵخوازی ڕاستەقینە ئەزانێت، لە دواییدا بۆی دەرئەکەوێت کە لای گوڵشەن نە عەشقی ڕاستەقینەو نە پەیمانی دڵداری پۆلێك ناکەن و مەسەلە هاوڕێیەتیی (کۆلێژ)ەو هیچی تر!! ئەگەر سەیری مێژووی نووسینی کورتە چیرۆکی دووەم و سێیەم و چوارەم بکەین، ئەبینین هەرسێکیان لە ساڵی ١٩٧٦دا نووسراون، لەوەش زۆرتری بنووسیایە لەو ساڵەدا هێشتا هەرکەم بوو، چونکە حاڵەتەدەروونییەکەی یەکجار پەرێشانی کردبوو، ئەمەم لەمەوپێشتر باسکردووەو پێویستی بە دووپات کردنەوە نییە، بەڵام شتێکی تر هەیە، ئەمەوێ ڕوونی بکەمەوە: ئاشکرایە کاتێك گیروگرفتێك سەردڵی مرۆڤێك ئەگرێت و ئەیگوشێت، پەنگ ئەخواتەوە، ئارام لەبەر ئەو مرۆڤە هەڵئەگرێت، سەری لێ ئەشێوێنێ و خەوی لێ ئەزڕێنێ و لێی ئەکاتە نەخۆشییەکی دەروونی، لەم حاڵەتەدا باشترین شت ئەوەیە کە هەر قسەوڕازێك لە دڵیایەتی چ بەقسە، چ بە نووسین، دەریبڕێت.

جاری وا هەیە ئەو کەسەی کە لەو حاڵەتەدایە، مەسەلەکە لە دەست ئەقڵ و بیرچوونەوەی دەرئەچێت، قسەورازە شاراوەیەوە ئەنێت وەك کوێرەکانی ئەتەقێتەوە، ئیتر بەوە ئاوپرژێنێکی دڵی ئەکرێت و ئاهێکی ئارامبوونی تێ ئەگەڕێت و ئەحەسێتەوە. من دڵنیام کە کاك مستەفا لەو ساڵەدا ئەم سێ چیرۆکەی نووسیوە ئاوپرژێنێکی دڵی کراوەو ئەو بارە ناخۆشەی تارادەیەك یان بۆ ماوەیەك لە کۆڵ کەوتووە.

لەگەڵ (نیرگس)ی ڕەمزی مەسەلەکەیدا ئەژی، توانیویێتی گیان بکات بە بەری ئەو ووشەو ڕستانەدا کە لە گێرانەوەی مردنی (نیرگس)دا بە کاری هێناون، ئەوەتا ئەڵێ (گڤەی زریان ئاگری زستانەمی کرد بە خۆڵەمێش).

لە کورتە چیرۆکی (ژیلەمۆ)دا ئەڵێ"چاوم چاوەڕوانی ئەو کاتە بوو کە پێم ئەڵێن، دەرمانی نەخۆشیەکەی (شەوبۆ دۆزرایەوە) لەم کورتە چیرۆکەدا، دوای مەرگی (نێرگس) نێرگسێکی تر لە شێوەی (منداڵێکی خنجیلانەی ناسکۆڵە)دا ئەبینێت و بەم بینینە (بۆ یەکەم جار لە دوای کۆچی نێرگسەوە، زەردەخەنەیەك گرتی و دەستی بە ڕوومەتەکانی نێرگسە پچکۆلەدا هێنا).

لە رووی رێنووسی زمانی کوردییەوە، سەرنجێکم هەیە، ئەویش لەسەر (سەرناوی) کورتە چیرۆکەکەیە، ووشەی (گۆرانی) کە کەوتە حاڵەتی ئیزافەوە (ی)ی ئیزافەی پێویستە بەڵام لەسەر حسابی (ی)یەکەی خۆی ناروات ئەبێ بنووسین (گۆرانیی خەم) نەك (گۆرانی خەم). لە ساڵانی پەنجادا، یان باشتر بڵێم پێش ١٤ تەموزی ١٩٥٨. مامۆستا (تۆفیق وەهبی) هات بۆ دیدەنی مامۆستا (نەجمەدین مەلا) لە سلێمانی، بەرێکەوت من لای مامۆستا نەجمەدین دانیشتبووم، کە هاتە دەرەوە سەری هەڵبڕی دیی کە بە گەورەیی لەسەر دوکانەکەی نەجمەدین مەلا نووسراوە (کەشتی نووح) مامۆستا وەهبی ووتی: "لەرووی رێنووسەوە ئەو (کەشتی)یە (ی)یەکی تریشی ئەوێت."

## ٥ـ قەڵەم

لەم کورتە چیرۆکەدا دووکەس زۆر دیارن

چیرۆکنووس هەر لەناو دەردو ژان و ئازارەکانی دوای توانەوەی بەفرەگەورەکەدا ئەتلێتەوە، لێرەدا دیسان گومانێکی تری ناخۆش و جەرگبڕ پیشان ئەدا، ئێمەش لەگەڵ خۆیدا وا لێئەکات دووجۆرە خەڵك ببینین، جۆرێکیان خەم خۆرو کسپەلەجگەرەوە هەستاو جۆرێکی تریان بێ خەم و شەیدای پارە، جۆرێکیان ڕەنگ هەڵبزرکاو، جۆرەکەی تریان ئەڵێیت نەبای دیوەو نەباران، ئیتر خوای ئەکرد گەورەقەڵا لەگەڵ توانەوەی بەفرەگەورەکەدا داری بەسەر بەردییەوە نە ئەماو ئەبووە کەلاوە، دیارە ئەم دوو جۆر خەڵکە پێش توانەوەی بەفرەکەش هەربوون، ئەبوایە چیرۆکنووس ئەم

دووربینییەی) لە یەکێك لەم کورتە چیرۆکانەیدا بکردایە، چونکە کە دوو جۆر خەڵك بوون، دوو جۆر ئەنجام دێنە پێش چاو یان ئەوەتا هەرچی چۆنێك بێت بە هۆی جۆرە خەم خۆرەکەوە گەورە قەڵا تەواوئەکرێت یان ئەوەتا بە هۆی جۆرە بێخەمەکەوە لەگەڵ هەرەسهێنانی چیاکەدا ئەمیش ئەڕمێت، چیرۆکنووس لە هیچ لەم کورتە چیرۆکانەیدا باسی جۆری گڵ و بەرد و خاك و چەوی چیاکەی نەکردووەو هیچ پێشبینییەکی لەو بابەتانە تیادا نییە، لە هەموویاندا هەر سەری سوڕ و واقی وڕ ئەمێنێت، ئەو هەرەسهێنانە هەر بە رووداوێکی (لەناکاو) ئەداتە قەڵەم و هیچی تر. لە (ژیلەمۆ)دا ئەڵێت"لەناکاو دەردێك لە تاعون پیستر و لەرشانەوە سامناکتر بلاوبوەوە". لە (تەزووی خەم..) ئەڵێت: "لەناکاو دەردێك لە تاعون پیستر و لەرشانەوە سامناکتر بلاوبوەوە). لە (تەزووی خەم...) دا کە باسی نێرگس ئەکات ئەڵێ:"خۆشم سەرم سوڕماوە، هەمووی بە چاونوقاندنێك زیندە بە چاڵ بوو"، لە سێ وێنەو ڕێبوارێکی ماندوو) ئەڵێ"کێ چاوەڕوانی ئەمەی ئەکرد." لەم کورتە چیرۆکەی (قەڵەم) یشدا ئەڵێ:"لەناکاو هەورەتریشقەیەکی جەرگبڕ لێیداو...".

کاك مستەفا وەك چیرۆکنووسێکی رۆشنبیرو شارەزا، ئەبوایە پێش هەرەسهێنانی بەفری سەر چیاکە ئەمووستی بۆ ئەو ڕاستییانە رابکێشایە کە دوای هەرەسهێنانەك بۆ هەندێکیانی راکێشاوە، دەنا هەمووشتێك بردنەوە سەر (لەناکاو!) و (سەرسوڕماندن!) جگەلەوەی کە (دەردە دەروونی)یەکە ئاڵۆزاوتر دەکات، هیچ رادێکی تر نادات.

ئنجا با بێینە سەر لایەنێکی تری ئەم کورتە چیرۆکە، توند شەتەکدانی پێشەکییەکەی بە دەوری شاعیرەکەی هاوڕێیەوەو گەڕانەوە بۆ لای ئەو دەڵاڵەی کە لە نەبوونی و دەستکورتیدا پاڵتۆکەی دابوویە، بۆی بفرۆشێت تەکنیکێکی نایاب و کەم هاوتایە.

چۆن شاعیرەکە (دڕی بە خەڵکەکەدا، هەناسەی سارد و ڕەنگی ژاکاو، بێ هێز و لێوبەبار، بەڵام چاوەکانی گەش) چۆن بە توڕەییەکەوە دەستی بۆ پاڵتوکەی برد، لەدەست دەڵاڵ و کڕیارەکەی راپسکاند، چۆن(دەستی بە گیرفانی بەرباخەڵی پاڵتۆکەیاکرد، قەڵەم پاندانێکی لێ دەرهێنا) چۆن ووتی"کاکە من ئەمەیانم بۆ فرۆشتن

نەناردووە)، (ئەمەیان هەرگیز نافرۆشم...) سەیری ئەم وێنەو تابلۆیانە ئەکەیت و بە ووردی ئەیانخوێنیتەوە، رەنگی دەم و چاوو تەپەی دڵ نەك لەگەڵ هەموو رستەیەکدا، بەڵکو لەگەڵ هەموو ووشەیەکدا ئەگۆڕێن، ئەو هەڵمەت بردن و راپسکاندنی قەڵەمە لەگەڵ ئەو هەموو بێهێزییەدا دیمەنێکی سەیرت دەهێنێتە پێش چاو با هێزی لەشیش نەمێنێت، بەڵام هێزی بڕوا بەخۆبوون و بڕیاری قەڵەم نەفرۆشتن، واپاڵی پێوەئەنێن (نە هەناسەی سوار و نە رەنگی ژاکاو)ی لەبیر نامێنێت، دیمەنی ئەو قەڵەمە دیمەنی ئەو تیرانە بەدەست کوردەکانەوە دێنێتە پێش چاو کە گەزنەفۆن لە گەشتەکەیدا باسیان ئەکات، (درێژی تیرەکانیان گەزونیوێك بوو، تیرەکانیان ئەوەندە گەورەو قورس بوون کە ئێمە لە باتی کورتەڕم بەکارمان ئەهێنان). ئەو قەڵەمانە چەند ئازاو بەڕێزن کە پیاو بە بینینیان نوکی تیرو ڕم و نێزەو خەنجەری دێتەوەیاد، ئەو قەڵەمانە چەند ئازاو پیرۆزن کە پیاو بە بینینیان قسەکەی (گۆران)ی شاعیری دێتەوەیاد کە لە شینی پیرەمێردا ووتویەتی:"خوای گەورە گەڵێ لەپێش چەکا، لەسەرەتای داهێنانی هەستیا، قەڵەمی دروست کرد، پێی ووت بنووسە! ووتی چی بنووسم؟ ووتی: قسەی جوان بنووسە، باوەڕی راست بنووسە، اشهد ان لا اله الاالله بنووسە.. هتد)

لایەنی سێیەم لەم کورتە چیرۆکەدا ئەوەیە کە کاك مستەفا بەیەك دوو رستە توانیوێتی زۆرشت بڵێ، توانیوێتی نەبوونیی هاوڕێکەی بخاتە خەیاڵێکی بەرزەوە، یان دیمەنێکەوە کە رەنگەکانی ئەوەندە دیاربن خەریك بن لەوێنەکەوە بێنەدەرەوە و هاواربکەن. سەیر بکەن ئەڵێ: "نان لە قووڵینەیا نەماوە، بەڵام هیوا لە دڵیا هەر سەوزە" بزانن بەو چەند ووشەکەمە چ وێنەیەکی گرتووە. (مارۆن عەبود) لە هەڵسەنگاندنی (نزار قەبانی)دا ئەڵێ:"نزار وەك (جریر) شیعرەکانی شیرینە، بەڵام خەیاڵی نزار بەرزترە، چونکە بە ووشەیەك وێنەیەك ئەگرێت کە خەڵکی تر بە قسەیەك ئەوەیان پێ ئەکرێت".

لە رووی زمانەوە، لە دوادێڕی لاپەڕە (٧٨)دا (شاعیرێکی ئەشکەنجەدراو) نووسراوە، لام وایە راستییەکەی ئەوەیە بووترێت (ئەشکەنجەکراو) چونکە کورد ئەڵێت"ئەشکەنجەم مەکە" یان "فلانەکەس ئەشکەنجەی کردووم". من وام بیستووە.

## ٦- لەئاسۆی چاوەڕوانیدا

چیرۆکنووس هونەرمەندانە ئەم کورتە چیرۆکەی دارشتوە مەبەستی سەرەکی لێرەدا دەردێکە لە کۆمەلگای کوردەواریی خۆماندا وەکو گەلێك کۆمەلگای تر، بەرچاو ئەکەوێت، هەندێك خوێندەوار بە دەموپلێکی بەڕوتیادا هەلتۆقیوەوە خۆی وا ئەنوێنێ کە هونەر خواهەوپشتی هونەرئەگرێت و بە نەنگی ئەزانێت، کە ئافرەت دەورەوپەرێز بوەستێت و نەیەت شان بەشانی پیاو لەم مەیدانەدا بەشداربێت و خۆی بنوێنێت، ئیتر هەر ئەوەندە کیژێکی تازەپێگەیشتوو ئامادەیی پیشاندا، بە گەرمی هاتەپێشەوە، یەکێك لەو هەندە خوێندەوارانە لە شوێنی خۆیەوە لێی ئەچێتە پێشەوە، هەزار و یەك درۆی وەك لیژنەدار بۆ هەلئەچنێ، بە چل دەم پیرۆزبایی ئەو ئازایەتی و چاونەترسییەی لێ ئەکات، کە چۆن کۆتوزنجیری کۆنەپەرستیی پچڕاندوەو بەرگی دواکەوتنی دادڕیوەو بەوپەڕی سەربەستییەوە هاتۆتە مەیدانی هونەروجوانییەوە، بەلام کە پاش ماوەیەك بۆی دەرکەوت ئەو کیژە خۆراکی ئەو نییەو ملی بۆنادات، هەر هەمان ئەو هاتنە مەیدانی هونەرەوە ئەکاتە بەلگەو دەستکەلای دەست بۆ ناوزڕاندن و سووك کردنی، لە چاوتروکاندنێکدا ئەو هەموو پێدا هەلدانە ئەبێتە لێ خوێندن، یان وەکو (سەناریا)ی قارەمانی کورتە چیرۆکەکە لە ئەنجامی تاقیکردنەوەیەکی دوورودرێژ و تالی خۆیدا ئەلێ:"هە نە خۆی نزیك ئەکاتەوە، وا تێ ئەگەی بەو هەموو ووشە رازاوانەیەوە فریشتەیە، بەلام ئەوەندەی پێ ناچێت، پێستی مرۆڤایەتییەکەی لەبەر دائەمالرێ و لە پێستی گورگیکدا دەرئەکەوێ، ئەمجا کە ئەبینێ بەرخەکەی بەرامبەری بۆخواردن دەست نادات، ئەڕشێتەوە، چی شتی ناشیرین لە فەرهەنگە شاراوەکەیدا هەیە ئەیخاتە پال ئەو کەسە." دیسان ئەلێت:"لەوەش سەیرتر، خۆی باسی هونەر و جوانی و سەربەستیت بۆ ئەکا، کەچی کە داوەدەزوەکەی نێوانتان دەترازێ، یەکەم کەسە تەنانەت هاتوچۆی ئەو کچە بۆ پیشانگاکان و بایەخ دانی بە هونەر و تێکەلاوبوونی بە هونەرمەندان و رووناکبیران، ئەکات بە بەلگەیەك بۆ سەروپۆتەلاك شکاندنی و لێدانی."

ئـەو تـاقی کردنـەوە قوڵـە ئەوەنـدە کـاری تێئـەکات، ئەوەنـدە لـە دڵـو دەروونیـدا کەڵەکەبووە، تەنانەت ئەگەر (سـەناریا) (یەکـەم جاریـشی بێـت هەسـت بـە لێدانی دڵـی بکات، یەکەم جاریش بێت لەناخەوە، بە هەموو سۆزێکەوە یەکێکی خۆش بوێ.) هێـشتا هەر ڕاڕایەو تاقیکردنەوە قوڵەکانی هەموو ساتێك ئەچنە بـن دەستییەوەو ئەچرپێنن بـە گوێیـدا: ئـەوە چـی ئەکـەیت، نەکـەی تـوخنی بکـەویت، ئـەمیش گورگێکـە وەکـو گورگـەکانی تـر!! تـا (سـەناریا)ش وای لێ دێـت ڕۆژی دەجـار سـێ و دوو بـە دڵـی بکـات، ساتێك گوێ لەبانگی دڵی و ساتێکی تـر گـوێ لـە بـانگی تـاقی کردنـەوەکانی بگرێـت، لـە ئەنجامیشدا پێ بەسەر ئەو دڵەیدا بنێت کە بۆ(یەکەم جار هەستی بە لێدانی ئەکرد" و بیشێلێ!!

بێینـەوە سـەرەوکاری کـوڕەی دڵـدار، ئـەمیش دوای (سـێ سـەعاتێك) چـاوەڕوانی (دەستی بخاتە سەر ستێرنی ئۆتۆمۆبیلەکەی و سەری بنێتە سەر)، کۆترە تەقلەبازەکەی خەیاڵیش هەرجارە (گەڵایەکی هەڵوەریو) یان (ئاوازێك)، وای لێ بکات بداتە شـەقەیباڵ و بـە ئاسمانـە بـێ سـنوورەکەی بیرەوەرییـەکانی ئـەم دڵدارییـەدا، بگـەڕێت، لـە بیرەوەرییەکـەوە تەقلەیـەك بـدات بـۆ بیرەوەرییـەکی تـر، لەشـی لەگـەڵ هـەموو بیرەوەرییەکەدا لەخۆشیدا مێرووله بکات، تا دیمەنێکی ناخۆش، نوقرچێکی لێئەگرێت و بەدەم نوقرچەکەوە ئەگەڕێتـەوە لانـەی لـەش، ئەوسا دێتـەوە سـەرخۆی، کـە هاتـەوە سەرخۆی هیچ تاوانێك ناخاتە پاڵ (سـەناریا) و لـەگوڵ کـاڵتری پێناڵێت، بـەڵکو گلـەیی لەو گورگانە ئەکات کە هەموو جارێك (سەناریا) باسیانی بۆئـەکرد، بۆیـە ئـەڵێ:"ئەشێ بەڕاستی منیشی وەك ئەوانی تر سەیرکردبێت، یان ئەبێ ئەو جانەوەرانە دڵیـان وارەش کردبێت کە لە ئاستی کەسی تر سپی ئەبێتەوە" ئەم جۆرە بۆچوونەی جارێکی تـریش پێش ئێستا هەردێت بە خەیاڵدا.

ئەم دەردە ئێستاش لەناو ئێمەدا نـەك هەر بـۆ ئـەو لایەنـەی کـە کـراوە بـە بناخـەی ئـەم کورتـە چیرۆکە بـەڵکو بـۆ زۆر لایـەنی تـری ژیـانیش بـڵاوە. شـایانی باسـە کـە چیرۆکنووس لـە دوادێـری کورتـە چیرۆکەکەیدا، هونەرمەندانـە، کارێـك ئـەکات کـە

ووتەکەی (ئیرازمۆس): (تا ژیان مابێت، هیواش ئەمێنێ)، نەك هەر لە گوێی کوڕەدڵدارەکەدا، بەڵکوله گوێی هەموو مانا بزرنگێتەوە.

له رووی زمانەوە (بێزاری له لەشیا کەوتە مێروولەکردن) نابێت ئەوەی بیستراوە ئەوەیە کە (لەش) له (خۆشی)دا مێروولە ئەکات، ووتراوە: (لەشی لە خۆشیدا میروولە ئەکات.) واتە ئەوی مێروولە ئەکات (لەش)ە نەك (بێزاری) . (لەش)ەکەش لە خۆشیدا نەك لەبێزاریدا.

## ٧ـ جەژنێکی ئەرخەوانی:

ئەم کورتە چیرۆکە لە ئەیلوولی ١٩٨٠دا لە سلێمانی نووسراوە، سەرەتایەکی پایزی ماتەم، تێکەڵ بە یادی رووداوە مێژووییەکانی ئەو مانگە، پەپوولە پایزە بەو هەموو سوکەڵەیی و نەرمونۆڵییەوە خۆی ئەکات بە حەوش و هەیوانی ماڵانداو لە قوژبن و پەناو پاساردا خۆی لوول ئەدا، ئەگەر هەر بە ئاستەمێك دەرگای ژوور، درزێکی تێکەوت، ئەم بە خشپە خۆی ئەکات بە ژووردا و گەڕانەوەی لەسەفەری یەکساڵەی خۆی ئەخاتەوە یادی هەموان، چیرۆکنووسیش بە پەپوولە پایزەی، پایزەبرادا ئەڕوانێت، لەگەڵ ئەو روانینەدا ئەمیش سەفەرە یەکساڵەکەی خۆی و چەند هاوڕێیەکی دێتەوەیاد، بەڵام ئەمان هەر یەکەیان بەخشپە خۆی نەکردووە بە ماڵی خۆیدا بەڵکو وەکو شێرکۆی هاوڕێی ئەڵێ:"پێش ئەوەی گوڵەباخەکەم بۆن بکەم، پاسەوانەکان کردمیانە دەرێ و لە بیابانێکی چۆڵی دوور فڕێیان دام."

لێرەدا هونەر ئەوەیە کە هاوڕێکانی هەر یەکە باسی گیروگرفتێك ئەکات لە هینی ئەویدی ناچێت، بەڵام هەموو گیروگرفتەکان لەیەك سەرچاوەوە سەریان هەڵداوە کە ئەویش ئەنجامی سەفەرە یەکساڵەکەی ئەمانە. دیسانەوە هونەر ئەوەیە کە چیرۆکنووس ئەوگیروگرفتانەی وەکو ئەنجامێکی سروشتیی دوای سەفەرێکی لەو بابەتە باس کردوون، بۆیە وەکو کارێکی سروشتی دێنەپێش چاو، سواڵی بەزەیی پیادا هاتنەوەی نەکردوە، بەڵکو لەو هەزارەها گیروگرفتانەی دوای سەفەرەکە هەڵی بژاردوون و دەست چنی کردوون. بە پێچەوانەی هەندێك چیرۆکنووسەوە کە بە خەیاڵ بەسەرهاتی ناخۆش بەسەر پاڵەوانانی چیرۆکەکانیاندا ئەهێنن بۆ ئەوەی بە خەیاڵی

خۆیان بەزەیی خوێنەر راکێشن بە لایانداو لەو رێگەیەوە ئافەرین بکرێن و بەوەستایان بدەنە قەڵەم.

لەم کورتە چیرۆکی (جەژنی ئەرخەوانی)یەدا لە پاڵ کارەساتەکانی (بایز و هاوار و شێرکۆ و ئارام)دا دیمەنێکی پڕ ناسۆری تریش ئەبینین (دیمەنی ئەو لاوانەی لە ناو ئۆتۆمۆبیلێکی سووتاودا هەڵئەقرچێن) چونکە ئەمیشیان ئەگەر باش لێی ووردبینەوە هەر لە ئەنجامی سەفەرە ساڵ خایەنەکەوە هاتووە.. (هەرچواریان، چاویان بڕییە یەکتر، هەر بەچاو لە یەك گەیشتن، ئەو بیرەی بە مێشکیان هات یەك سەرچاوەی هەبوو.) بەلای منەوە هەر هەمان سەرچاوەیە کە کارەسات و تەنگوچەڵەمەکانی (بایزوهاورێکانی) لێوە هەڵقوڵاون.

سەرنجی گفتوگۆی بایز و هاورێکانی بدە، سەیر ئەکەیت هەریەکەیان لەگەڵ هەر ووشەیەکدا تاڵاوێك ئەنۆشێ بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تۆزقاڵێك هیوای ماوەو بە تەمای تیلماسکێك ترێی ئومێدە، کەچی ئارام کە بەلای منەوە چیرۆکنووس خۆیەتی کە بەدەم ئۆتۆموبیل ئاژووتنەوە قسە لەگەڵ خۆیدا ئەکات، تەنانەت گلۆپێکی کزیش لە دەرونیدا هەڵناگیرسێت، ئەوەشی کە بە برازاکەی ئەڵێت "دڵنیابە بەم زوانە باوکت دێتەوە" یان کە ئەڵێ:"ئەبێ گڕی دەروون... هتد بکەم بە زەردەخەنە،" پێشەکی خۆی بۆ منداڵ خەڵەتاندن بڕیاری داوە وابڵێ، دەنا ئومێدێکی نییە لە دڵدا چەکەرەی کردبێت. بە پێچەوانەی کورتە چیرۆکەکانی ترەوە، بە تایبەتی کە قارەمانەکە یەقدانەوەی خۆی بێت هەمیشە هەر گەشبین بووە، رەنگە ئەم هەڵوێستەی ئێستای لەبەر ئەوەبێت کە جاروبار مرۆڤی عاتیفی بۆ باوك و براو برازا زووترو زۆرتر دڵی پڕ ئەبێت، وەك بۆ خۆی و ماڵ و منداڵی، زیاتر سەری دنیای لێ دێتەوەیەك و درەنگتر ئاسۆی گەشبینی بەدی ئەکات.

ئێستا با بگوێزینەوە بۆ لایەنێکی تری ئەم کورتە چیرۆکە، سەیری هێز و پێزی ئەم رستەیە بکەن، (هەنگ لە گوڵە باخ دابڕین باجێکی گرانە" ئایا ئەمە لەو قسانە نین کە بە کەمترین ووشە زۆرترین مانا دەرئەبڕن؟!.

(بایز، گۆڤارەکەی دەستی داناو جگەرەیەکی داگیرساند، لەگەڵ گڕی چەرخەکەیا بیرەوەرییەکانی وروژان.) ئەم وردبوونەوەیە لە کردار و هەڵسوکەوتی مرۆڤ کە چۆن ئەبێتە هۆی کارپێ کردنی مێشك تا وای لێ بکات دەست بکات بەخەیاڵ کردنەوە یان بیرەوەری هێنانەوەیاد یان بیرکردنەوە کە بەمانە ئەڵێن (کردارە ئەقڵییەکان)، ئەڵێم ئەم وردبونەوەیە بە سەلیقە لای ئەدیبێکی هونەرمەند سەر هەڵئەدات و شتەکەش ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو نزیکی و خزمایەتییەی لەنێوان ئەدەب و دەروونداهەن، لەم ڕووەوە فروید ڕاستئەکات کە ئەڵێ: شاعیران زۆر پێش من (لاشعوریان) دۆزییەوە. من کە ئەم ڕستەیەم خوێندەوە: "لەگەڵ گڕی چەرخەکەیا بیرەوەرییەکانی وروژان." یەکسەر (کچە شخارتە فرۆشەکە)ی (ئەندرسۆن)ی (نووسەری دانیمارکی)م هاتەوەیاد کە چۆن کچۆڵەیەکی پێخاوس لە جەژنی سەری ساڵدا لە پەنادیوارێکدا لەسەرما و لەبرسێتیدا خۆی گرمۆڵەکردبوو، دەنکە شخارتەکانی یەك بە دوای یەکدا دائەگیرسان، لەبەرگڕی هەر دەنکێکدا بە خەیاڵ شتێکی خۆشی ئەدی، تا دوادەنکی سووتاند ئیتر لەجێی خۆی بەدەم ئازاری برسێتی و سەرماوە ووشك هەڵهات و ڕەق بووەوە.

لە ڕووی زمانەوە (پلاوو قەیسی و شلە قاورمە) ئەو (قەیسی)یە پێویست ناکات چونکە لە شلەقاورمەکەدا، قەیسی هەیە و هەتا ئێستا هەر (پلاوو شلەقاورمە) بیستراوە، ئیتر ئەم قەیسییە لە کوێوە خۆی هەڵقوتانە ئەو شوێنەوە.

"پێی بە بەنزینانا) ئەمە ڕاستەو ئێمەش هەروامان بیستوە نەك وەك دێڕی سێیەمی لاپەڕە(٧٧) کە ئەڵێ (پێی بەسکلێتەرا، نا) ئەمەیان هێشتا باو نییەو ئەوی تریان خۆشتر دێتەگوێ.

## ٨ـ مەلەکان بەرەو کوێستان ئەگەڕێنەوە.

ئەم کورتە چیرۆکە خنجیلانەیە لەوانەیە کە شارەزایی دەروونی و دیمەنی دەروونی و تاکنیکی نوێ و دەستڕەنگینیی بە خەستی تیادا کۆبوونەتەوە. عەسرێکی ڕۆژگاری بەهار لە شارێك لەو بیابانەدا، هەواڵێکی ناخۆش، ئارامی لەبەر هەڵئەگرێت، ئەچێتە دەرەوە بۆ ماوەیەك، لەسەرەتای گەڕانەوەیدا بۆ ماڵەوە چیرۆکەکە تەواو ئەبێت، بەڵام لەم ماوە کەمەدا توانیویێتی دیمەنێکی زۆر گەورە و ڕەنگاورەنگمان پیشان بدات. لە

رۆژێك پێش ئـەوەوە، بەدەسـت هـەواڵی لـە ناکـاوی گرتنـی کورەکەیـەوە ئەینالاند، بـەو ژانەوە ئەتلایـەوە تـا هەسـتی کـرد(ئەگـەر نەچێتە دەرەوە، لەوانەیـەبخنکێ) هێشتا لـە سەرەتای گەرانەوەیدابوو، چیرۆکەکە تـەواوبوو، چۆن چـوونە دەرەوەیـەکی هەڵکـەوت و لـەباربوو وا ئـەم چـیرۆکەی تیـادا هاتـەدنیاوە، لـە هـەمووی دیـارتر چـەند بـاوکێکی راستگۆیە لەگـەڵ حاڵەتـە دەرونییەکـەی خۆیـدا، چـۆن ئـەو هەواڵـە لـەباڵی داوەو چۆن زوخاوی پێ هەڵرشتوە بێ پێچ و پەنا هـەمووی ئـەڵێت، خـۆی ووتـەنی (ئەمـەوێ خـۆم واپیشان نەدەم بەڵام ناتوانم فێـڵ لـەخۆم بکـەم، دەسـەڵاتم نییـە) بـەلای منـەوە مـەزنی ئـەم کورتـە چـیرۆکە لەوەدایـە، چـونکە وەکـو باوکێـك هەسـت ئـەکات (گیـانی خەریکـە شەقارشـەقارئەبێ) (منـاڵ پارچـەیەکە لـە جگـەری مـرۆڤ و یـەکجار شـیرینە!) دڵنیـام ئەوانەی کە باوك نین ناتوانن لەو حاڵەتە بگەن و ئەڵێن:

نە ئەبوو باوکەکە وا رەشبین بێ، هەقیانـە وابڵێن چونکە لـەو دنیـای باوکێتییـەوە دوورن لـە لایەکـەوەو، لەلایـەکی تریـشەوە رەنگـە هـیچ حـسابێکیان بـۆ دواپـێ هێنـانی کورتە چیرۆکەکە نەکردووە کە بەچ گەشبینییەکەوە کۆتایی دێت.

هونەر نییە پیاو واخۆی دەرخات کە گەشبینە، بەڵکو هونەر ئەوەیە یـەکێك لـە نـاو زامەکانی خۆیدا سووربکرێتەوە، سوێی ببێتـەوە، ئازارەکـانی خـوێنی جگـەری بخۆنـەوە، ئنجا لەگەڵ ئەوەشدا هەر گەشبین بێت.

کێشەی خـۆی و کوڕەکـەی لـەم چوونەدەرەوە کـەم خایانـەدا، تـاڵ تـاڵ شـیئەکاتەوە، هەر بەوەشەوە ناوەستێت لەگەڵ کێشەی ئەردەڵان و باوك و دایکی ئەردەڵانیشدا ئـەژی، بەشێوەیەکی مرۆڤانەی وا کە (هەستی ئـەکرد بەرەبـەرە خەمـەکانی سـەر دڵـی پچووك ئەبنەوەو لە خەمە گەورەکانی ئەم خەڵکەدا ئەتوێنەوە.) فەرموو ئەگەر باوکە گەشبین نەبێت چی وای لێ ئەکات، ئەو هەستەپڕ سۆز و پیاوەتییـەی ببێـت؟! ئەمـە جگەلـەوەی کە بە سەلیقە ئەو حاڵەتـە دەروونییـەمان بـۆ دەرئـەخات کـە مـرۆڤ دەردوخەفـەتی تـر ئەبینێت و ئەبیستێت وەکو لای خۆمان ئەڵێن (نەسەللا)یەکی دێت و ئاوپرژێنێکی دڵی ئەکرێت و گیانی لە خۆبردنی بەرزئەبێتەوە، پێشینان ووتویانە (مەرگ لەگـەڵ ئـاوەڵان جەژنە.)

ئێستا سەیرێکی ئەو نەخشانە ئەکەین کە بە ووشەکێشاونی.

(ئەو ڕۆژنامانەی دیوارە ساردەکەی ئەم لاولای و بەرامبەری پێداپۆشیبوون، دێڕەکانیان لەبەر چاوی گەورەبوون تا بوونە مانشێتێك: کورەکەت گیراوە!)، ئینجا بابزانین چەند ووردو لەسەرخۆ گەڕاوە بۆ ئەوەی (دار عەسا) یەك بداتە دەستی خەیاڵ بۆ ئەوەی شتێکی یا ڕووداوێکی بهێنێتەوە یاد، ئێمە ئەزانین کە ڕووبار هەمیشە لە جووڵەو سەفەردایە، بەمە یاریدەی خەیاڵی ئەدا کە بڵێ: (لە کاتی لە دایك بوونی دلێرا لە سەفەربووم) ئەم سەفەرەش حەڤدە ساڵ لەوەوپێش بووە. چۆلەکەیەکی تەڕەبوو ئەکاتە (دار عەسا) و ئەیداتە دەست بیرەوەری، بۆ ئەوەی بێتەوە بیری کەبڵێ: (ئەم بەیانییە شاعیرێکی هاوڕێم لە بیابانەوە، بە گەروویەکی تاساوەوە بە تەلەفۆن هەواڵی چۆلەکە باڵکراوەکانی شاری لێ ئەپرسیم.)

با سەرنجێکی تریش لەم کورتە چیرۆکەبدەین، ئەو باوکە کە ئەو هەموو دەردو ئازار و ئەشکەنجەیەی خۆیمان بۆ هەڵئەڕێژێت، هەر ئەو باوکەیە کە لە دواییدا دەستە پچکۆلەکانی (ئەردەڵان) ئەخاتە دەستییەوەو بە خەیاڵ وائەزانی منداڵیی (دلێر)ی کوڕییەتی، بە (پێکەنینەوە!) تەکان ئەدات و ئەڕوات، تکایە جارێکی تریش چاو بەو کورتە چیرۆکەدا بخشێننەوە، ئەو باوکەی کە (لۆژلۆژ بەرەو پردەکەی پشتەوە کشا، تاو تاو وەك خەو ببینێ دەستی بەگریان ئەکرد) هەر کە (ئەردەڵان)ی دوای نەختێك دی، چۆن (خەمەکانی سەردڵی پچووك بوونەوە) تا وای لێ هات، بە پێکەنینەوە تەکان بدات، نەك هەر ئەوەندە بەڵکو ئاواتێکی گەورەتر لە ئاسۆی خەیاڵیدا گزنگیدا، بەو گزنگ دانە تینی گەشبینی زیاتر گەڕایە دەمارەکانییەوە، بۆیە ووتی: "وادیارە مەلەکانیش بەرەو کوێستان ئەگەڕێنەوە".

ئەگەر دواجار لە ڕووی زمانەوە سەرنج لەم کورتە چیرۆکە بدەم ئەڵێم •چڵەی چاوت ئەهات) ڕاست نییە، ئەبێ بووترێت (چڵەی چاوت ئەدا). ئەمە لەلایەك، لە لایەکی ترەوە، (وەك بۆ سەیران چووبێت، یان لە گەشتی قوتابخانەبێت)، ئەم (لە گەشتی قوتابخانە بێت)ە دارشتنێکی خۆماڵیانەی زمانی کوردی نییە، ئێمە بە کوردی ئەڵێین (فلانە کەس لە گەشتی شارە زوورە یان (وەك لە گەشتی شارەزوور بێت) ،

(وەك لە گەشتی گەرمیان یان هەورامان بێت) واتە قوتابخانەی ناوچەیەك یان هەرێمێك نییە تا بڵێین (وەك لە گەشتی قوتابخانە بێت) بۆیە ئەڵێم زۆرتر لە وەرگێڕانێکی کتومتی (رحلە مدرسیە) یان (سفرە مدرسیە)ی عەرەبییەوە نزیکە.

**٩- (پردی وەنەوشە)**

نیازم نییە زۆر لەسەر ئەم کورتە چیرۆکە بنووسم، چونکە لە رووی تەکنیك و هێنانە بەرچاوی دیمەنەکان، هەمان شێوەی کورتە چیرۆکی (ژیلەمۆ)یە، لەوێ قارەمانی چیرۆکەکە، داستانێکی (بابلی)ی بەدەستەوەیە کە کردویەتی بە داردەست و دارعەسای دەستی بۆ بەرچاوخستنی رووداوەکانی ناو کورتە چیرۆکەکە، لەم کورتە چیرۆکەشدا (رۆمان)ێکی بۆ هەمان مەبەست بەدەستەوەیەو ئەیخوێنێتەوە، لە سەرەتاشەوە پێش ئەوەی (رۆمان)ەکە بخوێنێتەوە، ووشەیەك ووتەی دەمی یەکێك، پزیسکی چەخماخێك، زڕەیەکی تەلەفون، ئەکاتە ئەو (دار عەسا)یەی لە کورتە چیرۆکی پێشوودا باسمان کرد.

ئەوەی کە لێرەدا بەپێویستی ئەزانم بیخەمە بەرچاوی خوێنەری خۆشەویست دووشتە: یەکەم پاڵەوانی چیرۆکەکە گەیشتە ئەوەی کە هیچ رقێکی شەخسیی لە (دڵخواز) لە دڵدا نەمێنێت، بەڵکو رقەکەی لە دوژمنان و چەوسێنەرانی ئەوسەردەمە بێت، کە لێرەدا وا دیارە دەوری پاشایەتیی پێش ١٤ی تەموز ١٩٥٨ی مەبەستە.

کە بەمە چەند پلەیەك لەبەر چاو بەرز ئەبێتەوەو ئەگاتە ئەو رادەیەی ژیرانە بیربکاتەوە، بۆ ناوەڕۆك بگەڕێت نەك بۆ توێکڵ، شەڕی لابەلایی بۆ خۆی نەنێتەوە بۆ ئەوەی زوو بگاتە ئامانج، چونکە شەڕی لابەلایی و پەیداکردنی کێشەو بەڵای لاوەکی، چەواشەی ئەکات و مەبەستە سەرەکییەکەی لەبیر ئەباتەوە، کە دیارە ئەم ژیرانە بیرکردنەوەیە بۆ هەموو کات و زەمانێك، بۆ هەموو سەردەمێك پێویست بووەو پێویستە.. هەر لەبەر ئەوەشە کە بڕیار ئەدا دڵخواز ببینێت و لە گوڵ کاڵتری پێ نەڵێت، تا (ئاسۆ)ی ئەم و (ناز)ی ئەو بە یەك بگەن، تا ئەو پردەی ئەم شیش بەندەکانی بە خەم و پەژارە بنیات ناو دڵخواز نەیهێشت بەسەریا بڕوات، ئێستا بە گوڵەوەنەوشە) بۆ ئاسۆی کوڕی بچنێت. دیسان وەك بە ئاسۆ بڵێت: "دڵنیابە کە پردی خەمت بۆ ئەکەم بە پردی وەنەوشە" جا دووەم شت کە ووتم بە پێویستی ئەزانم

بیخەمە بەرچاو ئەم ووشەی (وەنەوشە)یە کە لێرەدا هەڵەیەکی هونەری دێتە بەرچاومان، هەڵەکە زۆرزۆر زەقە، ڕەنگەکانی باش دانەناوە، چیرۆکنووس ئەڵێ:"پردی خەمت بۆ ئەکەم بە پردی وەنەوشە"، کە وەنەوشە خۆی نیشانەی خەمە، نیشانەی (مل کەچی) و خامۆشییە، هەمیشە خەفەتبار و خومپۆشە کە دیارە ئەو مەبەستی پردی ئاڵ یان پردی سوربووە.

پیرەمێرد ئەڵێ:

**چنوور بۆ زوڵفت لوول و پەشێوە**

**وەنەوشە مل کەچ خاڵی لای لێوە**

گۆران ئەڵێ:

**گیانی من بۆ ئەڵێ وەنەوشە پەرۆشە**

**کە لە ژێر سێبەری تووترکا خامۆشە**

## ١٠- ڕەشپۆشێکی جیهانی چوارەم

ئەم کورتە چیرۆکە، پێش هەموو کەسێك، لای چیرۆکنووس، لەوانی تر پەسەندترە، هەر بۆیەکە ناوی کۆمەڵە کورتە چیرۆکەکانی لە دوو بەرگی کتێبێکدا، بەو ناوەوە ناوناوە.

دوای ئەوە خوێنەرانیش، کە لە خوێندنەوەیان ئەبنەوە، زۆرتر (ڕەشپۆش)ەکە لە خەیاڵیاندا ئەمێنێتەوە، چونکە وا دیارە زیاتر کاری تێکردوون، ئەمە بەلای منەوە لەبەر ئەوەنییە کە لەتکنیك و هونەری ئەم لەوانیتر بالاتر بێت چونکە بۆ (نیان)ی قارەمانی چیرۆکەکە هەرهەمان شێوەی (لەخۆ هەڵهێنجان) یان وەکو بڵێین (الاستباگ من الژات)ی بەکار هێناوە، بەڵکو لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوەیە.

جارێ لە پێش هەموو شتێکدا (دڵداری)یەکەی ناو ئەم کورتە چیرۆکە دڵدارییەکی دانسقەو نەوازەیە، هەر چەندە لە سەرەتادا (نیان) کچێکی ئاسایی بوو، لە مەیدانی دڵداریدا وەکو زۆر کچانی تر بیری ئەکردەوە. (من لە سەرەتادا ئەمویست بمکات بە ئەستێرەیەك، لە تەنیشتیا بدرەوشێمەوە، بە جووتە بکشێین تا لە چاوی خەڵکی وون

دەبینین) بەڵام (شوان) جۆرە لاوێکی تازەپێ گەیشتوو و خاوەنی بیروباوەڕو ڕۆشنبیرێکی نوێ بوو، ئەیویست (نیان) بەرەو ڕێگەیەکی راست و ئامانجێکی باڵا ببات، ئەوەتا (نیان) ئەڵێ (بەڵام ئەو بەرەو ژیانێکی نوێی ئەبردم، وای لێکردم، چێژ لە خوێندنەوە وەرگرم، فێری خۆشەویستیی راستەقینەی کردم).

ئەمە لە لایەك، لەلایەکی ترەوە، لە وولاتی ئێمەدا هەر وا باوبووە، کوڕە دڵدارەکە خۆی پەرێشان و دڵسوتاو پیشان بدات و لەبەر کچە بمرێت و لێی بپاڕێتەوەو نازی قبوڵ بکات، لە فۆلکلۆری کوردی و لە شیعریشدا ئەمەمان زۆر بیستوەو خوێندۆتەوە، هەر کوڕە بۆ کچە شێت بووەو (سەر بەر دەبازی ڕێتە)ی بۆ ووتووە. ئەگەر کچە خوانە خواستە دڵی گەردگرتی، کوڕە پێی ئەڵێ: "هەرزە گوێیم کرد هەرچیم ووت، وا ئەو چڵکەم بە فرمێسك شت" بەڵام لەم کورتە چیرۆکەدا کە کچە دان بەو هەموو سۆز و پەرۆشییەدا ئەنێ ئەمە وەکو شتێکی نوێ دێتە بەرچاوی نەك هەر کوڕان، بگرە کچانیش، لای کوڕان چونکە قسەکان پڕ ئاواز و سۆزن و دانپێدانانێکی خۆشەو ختووکەی فیزیان ئەدا، لای کچانیش، لەبەر ئەوەی راستگۆیی و لە خۆبوردن و ئازایەتیی تێدایە، کە ئەمانە ئەبنە مایەی لە خۆشیدا رەنگ سوور هەڵگەراندنیان، ئەوەشمان بیرنەچێت کە (نیان) ئەوەندە دڵی بە خۆشەویستییەکەی خۆش بوو، ئەو ناوی (سەرەخۆرە)یەی کە دایکی ناوی لێ نابوو و بووبوە(گرێیەکی دەرونی) لە دڵیدا، ئەویش نەماو ڕەوییەوە.

ئەمە مژدەیەکی خۆش و رووناکی یەکی ئەمرۆو داهاتووە، کە کچانی کورد خۆزگەی ئەوە بخوازن کە تووشی کوڕێکی وەك (شوان)بن، بۆ ئەوەی وەك نیان بڵێن:"خۆزگە زووتر بمناسیایە، سەرنجم بەرامبەر ژیان ئەگۆڕاو بە جۆرێکی تر بیرم ئەکردەوە."

ئەوەی زەمینەی ئەم دڵدارییەی لە لای نیان خۆش کردوە، ئەوەیە کە (شوان) لای (سیروان)ی براشی بەڕێزو ئازیزبووە (نیان ئەوە شوانی برادەرمە چەند جارێك باسیم بۆ کردوویت. یەکێکە لە برادەرە هەرە ئازیزەکانم.).

دیسان لەو هۆیانەی کە ئەم کورتە چیرۆکەی لای خوێنەران لەوانی تر خۆشەویستر کردوە ئەوەیە کە وەك (دڵدار)یەکە دانیسقەیە، کۆستەکەش تایبەتی و سەیرە، کۆستی براو دڵدار، خۆشەویستیی (برا) لای خوشك، خۆشەویستیی (دڵدار)یش نەخوازەڵا دڵدارێکی وەك (شوان)یش، شوان مەگەر هەرخۆی شوانبێت. ئەو دووجۆر خۆشەویستییە کە وەکو دوو میوە هەریەکەیان تام و چێژی خۆی هەیە، هەر یەکەیان بە رەنگێك کار ئەکەنە سەر (نیان)، ئەو (نیان)ەی بە خۆشەویستیی (براو دڵدار) دڵی لێوان بووبوو. لەپڕ کەوت بە سەر کۆستی نەمان و لە ناوچوونی هەردووکیاندا. ئەم کۆستە لە دڵدارییەکە زۆرتر ئاهو هەناسە بە خوێنەر هەڵئەکێشێت.

دیسان داهێنانی زاراوەی (جیهانی چوارەم) شتێکی نوێیەو مایەی سەرنج راکێشان و ووردبوونەوەیە، کاتێك کە شوان لە رادیۆدا باسی جیهانی سێیەم ئەبیستێت ئەڵێ:"سەیرە، ئەی بۆ کەسێك نییە باسی جیهانی چوارەم بکات؟!". ئەمانەی تائێستە باسکران، تێکڕا رەنگ و روویەکی نوێیان داوە بە ناوەڕۆکی چیرۆکەکەو لای خوێنەرانی خۆشەویستر کردووە.

ئەگەر لێرەدا بوەستم و کۆتایی بە نووسین بێنم، نابێت، چونکە بەلامەوە گوناهە ئەگەر نەختێك لە جۆری دوایی پێ هێنانی ئەم کورتە چیرۆکە نەدوێم، چیرۆکنووس لەسەر زمانی (شوان) ئەڵێ:"شارەکەمان.. رۆژانی ووشك و برنگە بەلام شەوانی تەڕو پاراوە..) بەم دوایی پێ هێنانە، ئەبێ ئافەرینی چیرۆکنووس بکرێت، کاك مستەفا قسەکەی زۆر راست و جوانە، پێشینان ووتوویانە: "شەو قەڵای مێردانە"، پیرەمێردی شاعیریش ووتویەتی:

بەسەر شاخی ئەراراتا بە لاوك پیرەمێرد سەرکەوت ئەڵێ: پێشم کەون کوڕگەل، شەوی سەرکەوتنە ئەمشەو.

گۆڤاری بەیان/ ژ: ١١٢ / تـ١ ١٩٨٥

# هۆیەکانی روون کردنەوە
## Audio - Visul Aids

هۆیـەکانی روون کردنـەوە بـریتین لـە کۆمەڵـە ئـامرازێکی پـەروەردەیی بـەکار ئـەهێنرێن بـۆ روون کردنـەوەی وانـەکان و نزیـك کردنـەوەیان لـەزەین و میـشکی قوتابیـیەوە. تاکو قوتابی بتوانێ شارەزایی پەیدا بکا لەبەشە شاراوەکەی ئەو بابەتەو لەنهێنیـیەکانی ئاگاداربێ. چونکە رێك ئەکەوێ ئەو شتە بە قەوارە گەورە یاخو بەکێش قورس بێ. یان نرخ گران بێ. یاخو ئامادە کردنی مەترسی تیابێ. کەبۆ ئەم جۆرە بابەتانە هۆی روون کردنەوە شتێکی دروست و بەجێیە.

هۆی روون کردنـەوەش بناغەیـەکی دەروونـی هەیـە ئـەویش بەستنی وانەیەکە بە سروشت و ژیانی رۆژانەی قوتابیـیەوە.

فەیلەسوفی ئینگلیـزی-جون لوك- لەو باوەڕەدایـە کەمێشکی ئادەمیزاد راستەوخۆ توانای وەرگرتنی زانیـاریی نیـیـە. بـەڵکو ئـەو زانینانـەی کـە مـرۆڤ دەیگاتێ و وەری دەگرێ بەهۆی هەست کردنەوەیە. هەست کردن بۆ مێشك وەکو کۆمـەڵی پەنجەرە وایە بۆ ژورێکی تاریك و نووتەك و زۆریش سوور بوو لەسەر ئەوەی کە مرۆڤ بەهۆی هەست کردنەوە شت فێردەبێ. کەوابو تاکو چاکتر هۆی هەست کردنمان رابهێنین زووتـر فێـری زانست ئەبین و ئەچینە بنج و بناوانیـیەوە هۆیـەکانی روون کردنـەوەش کاری هەست سووك و والا ئەکەن و پەردە لەسەر لایەنە تاریکەکانی لائەدەن.

برێ جار پێویستیمان بە گەورە کردنی تـەنێکی بـچووك یان بەشێکی بـچووك لەو تەنە دەبێ. بۆ ئەم مەبەستەش میکرۆسکوب و گەورەکەری ئەلکترونی دۆزراوەتـەوە کە دەتوانێ وردترین شت وەك میکرۆب و کرۆمۆسۆم و جیناتGenet بـە گـەورەیی و ئاشکرا نیشانبداو فێربوونی خاسیەتی و لێکۆڵینەوەی لای قوتابی سووك و ئاسان بکا.

جۆرەکانی هۆی روون کردنەوە:

١. هۆی روون کردنەوەی دیتن: وەکو وێنەو نیگار. مومیاو نەخشە، پێی دەگوترێ دیتن چونکە هەستی دیتن-چاو- دەور ئەبینی لە بەکار هێنانیا.

٢. هۆی روون کردنەوەی بیستن: وەکو تۆمار کەر- مسجلە — قەوان و رادیۆو گەورە کەری دەنگ کەبۆ روون کردنەوەی دەنگ بەکار دێن. یاخو دووپات کردنەوەی ئەو دەنگە بەزوبانی خاوەنەکەی. پێی دەگوترێ بیستن چونکە هەستی بیستن —گوێ — کاری خۆی دەکا.

٣. هۆی روون کردنەوەی دیتن و بیستن ئەو هۆیانەیە کە هەستی دیتن و بیستن کە چاوو گوێیە تێدا بەشدارن وەکو تەلەفیزیون و فلیمی دەنگدار و نمایشی مێژوویی و ئەدەبی و گەلێکی تر.

مەبەستیشمان لەهۆی روون کردنەوە ئەوەیە کە ئەو شتەی گەرەکمانە لە قوتابیی بگەیێنین. پێ نیشانی بدەین. خۆ ئەگەر لە توانادا بوو راستەوخۆ شتەکە پەیدا بکەین و بی خەینە بەر دەم قوتابی ئەوا ئەویش باشتر تێی دەگاو ئاگاداری خاسیەت و قەوارە و فۆرمی ئەبێ. چونکە کوت ومت شتێکی تەواو — واقع — ی دەخەینە پێش چاو.

— روسو — Rousseau هەردەم ئاموژ گاری ئەوە بوو کە هەتاکو پێمان بکرێ راستەوخۆ شتەکە پێ نیشانی قوتابی بدەین. خۆ ئەگەر لە شوێنەواری — البیئە — خۆی دابوو ئەوا چاکترە چونکە پەیوەندی ئەو شتە روون دەبێتەوە لەگەڵ دەور و پشتیا. وەکو لێ کوڵینەوەی روەك لە کیلگەکانا یان لێ کۆڵینەوەو باس کردنی هەندێ گیاندار لە مۆڵگەو لانەی تایبەتی خۆیاندا. وە ئەگەر ئەم کارە دەستی نەدا لەبەر نارەحەتی و مەترسی ئامادە کردنی ئەو گیاندارانە. ئەو حەلە ئەتوانین — مومیا — کراوی ئەو شتە نیشانی قوتابی بدەین ئەگەر باڵندەو گیاندار بوو. یان نمونەیەکی — نموزج — ئەو شتە ئامادە ئەکەین. بێ گومان نموونەش خاسیەتێکی گرنگی هەیە. چونکە ئەتوانین بەگوێرەی پێویست گەورەتر و بچوکتری بکەین. هەندێ جار قوتابیش بەشداری ئەکا لە دروست کردنیاو شارەزاییەکی قووڵیش پەیدا ئەکا.

– دروست کردنی نموونەیەکی منارە پێچاوپێچەکەی سامەرا – الملویە – ئەبێتە مایەی تێ گەیشتنی قوتابیەکان و بەچەشنێ لە میشکیاندا بنج دائەکوتێ کە هەرگیز لە بیریان نەچێتەوە

دەنگی مامۆستا / ژمارە ٥ ساڵی دووەم ١٩٧٢

# عەزیز ئەتروشیی شەهید

لەبیرەوەری یەکەمی شەهیدبونی عەزیزی جوانەمەرگدا ئەم هەڵبەستەی خوارەوە پێشکەش بە هەموو ئەوانە ئەکەم که هەمیشه شەهیدانی کوردستانیان لە یادەو لەگەڵ گیانی پاکو بیرەوەرییەکانیاندا ئەژین.

بەجێت هێشتم بە یەکجاری، لە دەشتی چۆڵی حەسرەتدا
ئەناڵێنێ دڵم بۆ تۆ، بەسەر جەرگی لەت و پەتدا
کە پێم ووترا عەزیز کوژرا، دڵم وشرا، لەشم بەنج بوو
عەزیز مەردبوو، عەزیز پیاوبوو، عەزیز جەنگاوەر و گەنج بوو
عەزیز زۆرباش ئەوەی زانی کە بۆ کورد هەر ئەبێ بمرێت
کە چڵکی پیسیی دیلێتی بە خوێنی خۆی ئەبێ بسڕێت
لەگەڵ دەنگی بەیاندابوو، لەگەڵ سروە و شنەی دووری
بەسەر شاخی(شنرۆێ)دا، رژا خوێنی گەش و سووری
ڕژا ئەو خوێنە پیرۆزەی کە مایەی سەرفرازی بو
پڕا ئەو مێشکە خاوێنەی کە سەرکەوتن نیازی بو
ئەوا ئێستا هەموو کوردێك بە فرمێسکی بە خوێن سووری
ئەکا یادی عەزیزی خۆی، (عەزیز)ی ڕەمزی رووسووری

گۆڤاری برایەتی/ ژمارە ١ / ساڵی ١/ لاپەڕە ١٦

## ١ـ بەهار

ئەی نێرگزی دەشت و چیا
با پێت بڵێم وام لە چیا
لە بەهاری کوردستاندا
لە خۆشیام، لە خۆشیا
ئەی کاریلەو بەرخۆلەکە
وا بەهارە رزگارتان بوو
لە دەست زستان و تۆفەکە
بۆق بۆقیلەی سەر زلە
غاردە بۆ چەم بە پەلە
تەوشقی ئاو شکاوە
بۆ خۆت دەست کە بە مەلە.

١٩٨٠/٣/٢٣ کتێبی(فەرەیدوون عەلی ئەمین)

## ٢ـ کوڕە کوردم

کوڕە کوردم بەکارم     کاکە ئالانم ناوە
دایکی کورد و نازدارم     مەمکی لە زارم ناوە
کوڕی وڵاتی جوانم     پرچیاو بەفرو ئاوە
بەنازە کوردستانم     تەماحی تێ کراوە

١٩٨٣/٢/٢٦ کتێبی(فەرمیدوون عەلی ئەمین)

# هەنگ

ویزز ویزز، ویزز ویز
ئێمە هەنگین هاتین بەڕیز
ئێمە هەنگین، زۆر بچووکین
هەتا بڵێیت ئێسك سووکین
دەم ئەنێیەنە ناو گوڵاو
ئەیکەین بە هەنگوینی خاو
منداڵ بیخوا بە خۆشی
پێی نەوێرێ نەخۆشی.

...

تاق تاق ق. چراخ خ چراخ
هاوار هەستا لە باخ، لە شاخ
چیمان کردووە، بۆ وا ئەکەن
بۆ خۆشیمان لێ تێك ئەدەن؟
ئێمە هەنگین، هەنگوین ئەکەین
بۆ ئەوسەرە، بۆ کوردستان
دەمی خەڵکی شیرین ئەکەین
هەنگ زیرەکە، کرێکارە
هاوڕێی گوڵە، هی بەهارە
ئەو شانانە هی خۆیانە
بۆچی ئەیکەن بە وێرانە؟

کتێبی(فەرەیدوون عەلی ئەمین)

# نوقڵێ

نوقڵێ! سەرچاوەی هێز و ئیلهامم
نوقڵی گەزۆی خاو، میوەی بەتامم
نوقڵێ! نوقڵی ئەوسای ژینی من
نوقڵێ! چقڵی چاوانی دوژمن
کوای؟ لە کوێی ئێستا؟ لەکام پێدەشتی
لەکام سەیران و گەڕان و گەشتی
شیلەی شیرینی جووتە لێوی تۆ
کام خواپێداوە، ئەینۆشێ ئاخۆ؟
گوڵی گۆی مەمکی، بێ هامتا و بێ ڕەنگ
کام لێو، گولاوی ئەمژێ وەك هەنگ؟
بۆنی هەناسەی نیوەشەوی تۆ
ئەڕژێتە سەر ڕووی کێ، سووك لەسەرخۆ؟
ئاخۆ تۆش وەك من، هیچ نەبێ جارێ
فرمێسکی گەرمت، لە چاو ئەبارێ؟
ئاخۆ ئێستاکەش، شیعرەکانی من
وەکوو خۆی ماون، یاخود دڕاون؟
ئەو ملوانکەیەی، وێنەکەی منت
تێدا دانابوو، لە سەرگەردنت
ئاخۆ ئێستاکەش، وا لە ملتایە
یان هەر نەماوە، کوێراییم دایە؟
ئەی نامەکانم، کە وەك بێچووەمەل

تووندتکردبوون، لە تەنکەی باخەڵ

هەر لەوێن، یا دەستی وەرزبوون

فرێیداونەتە، ناو دنیای بیرچوون؟

نوقلێ! ئەمانە و پرسیاری تریش

خەم و خەفەت و ئازاری تریش

ئێستا لە تەکما، هاوڕاز و هاوڕێن

لە شادەماری خوێنما ئەگەڕێن

نوقلێ! بەڵام من، بەش بەحاڵی خۆم

هەتاکوو ئەمرم، بە دڵ سۆفیی تۆم

خەڵوەتخانەکەم، کونجی نووستنم

بۆتە نزرگەی، تۆ پەرستنم

وادیار ئەتبینێ، چاوی خەیاڵم

هەر ئەڵێی خۆتی، هاوار بەماڵم!

جا چۆن نەهەژێم، نەیەمە سەما

چۆن قوڕی دنیا، نەکەم بە سەرما؟

یان چۆن شێت نەبم، دینم نەلەقێ

کە چزووی نازت، لە لەشم چەقێ؟

شەپۆلی پرچت، بە بای هەناسەم

لاشەی ئارامی، بردە گۆمی خەم

دەزوولەی تیشکی، گەردنی چرات

وەك داو، بولبولی دڵم، ڕاوئەکات

پرشنگی چاوت، بۆ ئەم شەوانە

گوڵئەستێرەکەی، ئارامی گیانە

لەرەی مەمانت، بە نەرمەبای شەو

بازاڕی جوانیت، ئەخاتە برەو

ماسیی دڵی من، قولاپی نیگات
زۆر بە ئاسانیی، خۆی لێگیرئەکات
نوقلێ! حاڵی من، ئێستاکە وایە
ئەی توخوا تۆ، بۆچ دەنگێکت نایە؟
بۆ نەغمەی دەنگت، دنیای شەوەزەنگ
نایدا بە گوێما، شەوگاری درەنگ؟
هیچ نەبێ، لە ناو کۆڕی کچانا
ناوێکی منت، بێ بەزمانا
قەیناکا، مەڵێ، من خۆشمئەوێ
جوێنێکم پێبە، قەزات لێمکەوێ
توخوا ئەم جارە، دڵم مەشکێنە
بیکە لە ڕای خوا، ناوێکم بێنە
ناوی من، هەر چەند گران و پەستە
شمشاڵی گەرووت، ئەیکا بە بەستە
نوقلێ! لە خۆشیی دنیا، بێبەشم
نوقلانەی خێربە، بۆ بەختی ڕەشم
بەمەی بەزەییت، جامی ژیانم
پڕکە، بینۆشم، هەتا ئەتوانم
بەو مەیە، لاشە و گیان و دڵ مەستکەم
ناحەزانی خۆم، بەجارێ پەستکەم
زرێی مەیانی ئاشووب، لەبەرکەم
دوژمنانی دڵ، ژێرەو زەبەرکەم
بە پڕشنگێکی، ئەو چاوە کاڵە
سوارەی غیرەتم، (ڕۆستەم)ی (زاڵ)ە
بەو تەڕاییەی، عەتری لێو و دەم

لە گیانەڵادا، لێوم تەڕبکەم
بۆ ئەوەی، ئەگەر مردم نابەدڵ
تێشووی عەتری لێو، ببمە ژێر گڵ
نوقڵێ! وا چرای شەو کوژایەوە
کەچی ڕەحمی تۆ، نەتلیسایەوە
قەیناکا، ئەوە با گلەیی بێ
ئەو دڵەت ئاوا، بێ بەزەیی بێ
با نەتپرسیبێ، حاڵی ئەم وونە
کە غەرقی دەریای، خەمی بێ بنە!

تێبینیی:

گەلێجار، گوێم لە(نوقڵێ)بووە، هەر جارێکیش، بە شێوەیە بیستوومە. بەڵام، هەموو جارەکان، لە نوقوڵ شیرینتر، لە حەڵوا بە تامتر و لە گەزۆ لام خۆشتر بووە. لەبەرئەوە، لە مێژبوو، بەدوای دەقە ڕەسەنە تەواوە باوەڕپێکراوەکەیدا وێڵبووم. ئەوەبوو، خواکردی و کاکە(ئالان)ی جگەرگۆشەکەی مامۆستا(فەرەیدوون)، ئەم هۆنراوە سەنگین و ڕەنگینەی، بە دەسوخەتی هۆنەر خۆی بۆهێنام. کاتێ خوێندمەوە، هەستمکرد، لە هێندێ جێدا، هەڵەی ڕێنووسی تێدا هەیە، بە ڕێنووسی ساڵی حەفتاکان نووسراوە و نیشانەکانی خاڵبەندیی بۆ دانەنراوە. لەبەرئەوە بڕیارمدا، جارێکی دیکە بینووسمەوە، هەموو ئەو شتانە چاککەم و بڵاویکەمەوە، بێئەوەی، یەك پیتم لێگۆڕیبی.

ئەوا لێرەدا، پێشکەش بە ئەڤیندارانی هۆنراوەی کوردییدەکەم و داوای لێبووردنیش، لە گیانی پاکی ڕەوانشاد مامۆستا(فەرەیدوون)دەکەم، گەر بێمۆڵەت، دەسکاریی(نوقڵێ)کەیم کردبێ!

دکتۆر حوسێن محەممەد عەزیز

سولەیمانیی ٢٠٠٥/١٢/٢٥

# باخەوان

هاوین هات کۆڵێك گەرمای لەگەڵ خۆی هێنا، هەموو ڕۆژێك(ئالان) بە باوکی ئەووت: بابەگیان ئەم شاری هەولێرە زۆرگەرمە، وا لەگەرمادا پڕووکام، ئەوە نابێت بۆ ماوەیەك ئێمەش بچین سەرێك لەو حاجی هۆمەران و ئەو ناوانە بدەین، باوکی پێی وت: با کوڕم بۆ نابێت، یەك دوو ڕۆژی تر خۆمان کۆئەکەینەوە، من و تۆو دایکت و برا بچکۆلانەکەت ئێرە بەجێئەهێڵین و ئەڕۆین.

کە ڕۆیشتن ماڵئاواییان لە خانوەکەیان کرد، ئالان چووە باخە خۆشەکەیانەوە، ماڵئاوایی لە گوڵەکان کرد. بولبلێك بەسەر دارهەنارەکەوە بەدەنگێکی خۆش خوێندی، وتی: خواتان لەگەڵ، پەپوولە و هەنگ بەباڵ چەپڵەیان تەقاند، گوڵەکان دڵیان پڕبوو لەگریان. دوو هەفتە لەو کوێستانە خۆشانە مانەوەو ئینجا گەڕانەوە هەولێر، کە هاتنەوە ئالان یەکسەرچووە سەر باخەکە، سەیریکرد گوڵەکان هەموو سیس و ژاکاون، نە پەپوولە دیارە نەهەنگ، نە بولبل، هەرێزەکەیان خەریکە لە تینواندا بخنکێت.

ئالان هەر ئەوەندە ماندوێتی ڕێگای شکا، قۆڵی لێهەڵماڵی کەوتە بژاری باخەکەو ئاودانی دار و گوڵ و هەرێزەکە، چەند ڕۆژێك لەسەریەك وازی نەهێناو هەر خەریکی بژار و ئاودێران بوو، ئەوەندەی پێنەچوو هەرێزەکە سەری هەڵدایەوە، خونچەی گوڵە باخەکان دەمیانکردەوە، گوڵەکانی تر گەشانەوە.

بولبلەکان بەسەر گوڵە باخەکاندا خوێنیان و چوون مژدەیان برد بۆ پەپوولەو هەنگەکان، ئەوانیش گەڕانەوە و کەوتنە پێکەنین، پەپوولەکان بە ئەسپایی بەسەر گوڵەکانەوە نیشتنەوە و تێروپڕ ماچیان کردن. هەنگەکان بە باڵ گوڵەکانیان باوەشێنکرد و ئینجا شیلەکانیان مژین، بۆنی خۆش ئەو ناوەی کاس کردبوو، جەژنی گوڵ و بولبول و پەپوولەو هەنگ بوو.

یەك دوو مانگی پێچوو هەنگەکان نەختێك هەنگوینی خۆشیان بە دیاری بۆ(ئالان) هێنا.

١٩٧٠/١٢/١٢

# خوێندن لە زستان ئازاترە

منالە خۆشەویستەکانی شارەکانی کوردستان، ئێستا زستانە هەرکەسەتان بەیانیان خۆی باش ئەپێچێتەوە، لە ماڵ دێتە دەرەوەو بە دوو هەنگاو خۆی ئەگەیەنێتە قوتابخانە نزیکەکەی لای ماڵی خۆیان، دیارە ئەوە ئازایەتیە خۆت لە سەرمای ڕێگاوبان ڕزگاربکەیت و خۆت بکەی بە قوتابخانەدا، نیوەڕۆش دیسان بگەڕێتیتەوە و خۆت بکەیت بە ماڵدا، سەیربکەیت دایکت ژوورەکەی گەرم کردووە و چاوەڕوانی تۆیە، تۆش لە دوورەوە ئەڵێیت دایە چیمان هەیە، برسیمەو سەرماشمە.

بەڵام ئەی منالە خۆشەویستەکانی ناوشارەکان، ئەوە ئەزانن لە هەندێك لە گوندەکاندا قوتابخانە نیە، بەڵام منالانی ئەو گوندە وازیان نەهێناوەو دەستیان لە خوێندن هەڵنەگرتووە، هەستاون چوونەتە ئاواییەکی نزیکیانەوە کە قوتابخانەی تیادایە، لەوێ ئەخوێنن، هەموو ڕۆژێ شەبەقی لە ماڵی خۆیان لە خەو هەڵئەستن، بەرچایی ئەخۆن و قەڵەم و دەفتەر و کتێبیان ئەخەنە بن دەستیان و ئەکەونە ڕێ بۆ قوتابخانە، ئەم گرد بۆ ئەوگرد، ئەم هەوراز بۆ ئەو هەوراز، بەدەم گۆرانی خۆش خۆش و بەدەم پێکەنین و قسەی خۆشەوە، کاتێك سەر هەڵئەبڕن سەیرئەکەن قوتابخانەکەیانە، خۆیان ئەکەن بە ژووری خوێندناو وەك شێر دائەنیشن و دەستئەکەن بە دەرس خوێندنی خۆیان.

ئەو منالانە ئێستاش بەم زستانە، بەم سەرماو ڕەشەباو شەستە بارانە، بەم بەفر بارین و ڕێوبانگیرانە، لە چوونە قوتابخانەی خۆیان نەکەوتوون.

گوێم لێبوو زستان دانی لێ ڕیچ ئەکردنەوە و هەڕەشەی لێئەکردن، ئەیوت: من زستانم، من زستانی کوردستانم، ڕێگە ئەگرم، دەست و پەنجە ئەتەزێنم، زمان لە گۆ ئەخەم، خەڵك ڕەق ئەکەمەوە.

منالەکان ئەیانووت: ئێمەش منداڵین، منداڵی کوردستانین، ئەمانەوێ بخوێنین، پشتی زستان ئەشکێنین.

زستان ئەیوت: دار و بەرد و ئەردم بە بەفر داپۆشیوە، کەس ناوێرێ سەر لە ماڵ بێنێتە دەرەوە. دانیشن بە دیار ئاگردان و ئاگری خۆتانەوە، دانیشن قاچ درێژکەن و هەلوور بلوور بکەن. بۆ کوێ ئەڕۆن، خوێندنی چی. ئێوە لە مردن ناترسن قورتان بەسەر، بۆ کوێ ئەڕۆن بەخوا هەر گورگ ئەتانخوات.

منداڵەکان ئەیانوت: ئێمە منداڵی ئەم شاخ و کێوەین، شوانێتیمان کردووە، دارمان بڕیوە، هەزارجار گورگمان دیوە.

زستان ئەیوت: من زستانم، من زستانم، ڕەقتان ئەکەم، خوێن لە گیانتانا وشك ئەکەم.

مناڵەکان وەکو جاران خۆیان کۆکردەوە و هەر گوێشیان نەدایە هەڕەشەو گوڕەشەی زستان. لە ئاوایی خۆیان دەرچوون، دەفتەر و کتێبەکانیان پێچایەوە و خستیانە باخەڵیانەوە و توند پشتێنەکانیان بەسەردا جەڕاند. کاکە هەڵۆ پێشیانکەوت و کەوتە ڕچەشکاندن، ئەوانیش بەدوایدا ئەڕۆیشتن، هەر بەفربوو لە ژێر پێڵاوەکانیاندا ئەتلیسایەوە. ڕچە شکاندنەکەیان بۆ خۆیانکرد بە یاریەکی خۆش.

لەپڕێکا یەکێکیان قاچی هەڵ ئەخلیسکاو تەپ ئەکەوت بەدەمدا، شێرانە هەڵئەستایەوە، خۆی بۆ ئەتەکاند و ئەکەوتەوە ڕێ. ئەوانی تر ئەیاندایە پڕمەی پێکەنین و قیوەیەکیان بۆ ئەکرد.

مامۆستاکان لە پەنجەرەی ڕاڕەوی قوتابخانەکەوە کە ئەیڕوانی بەسەر ڕێگاکەی بەردەمیدا سەیری دەرەوەیان ئەکرد، هەتا چاویان بڕی ئەکرد هەر بەفربوو، لە پڕێکا ڕەشاییەکیان چاوکرد، ڕەشاییەکە تا ئەهات نزیك ئەبووەوە، مامۆستایەکیان وتی: خۆیانن، هەڵۆ و هاوڕێکانین، ئەی ئافەرین منداڵ بۆ خۆتان و بۆ هەوەسی خوێندنتان، بەخوا لە دڵی خۆمدا هەر خەیاڵم لایان بوو، ئەم وت تۆ بڵێیت بەم ڕۆژە تۆفە بتوانن بێن، تۆ سەیرکە بزانە ئەم منداڵانە چەند حەز بە خوێندن ئەکەن، دیارە دوا ڕۆژ هەر بۆ ئەمانەیەو کەس گرەویان لێ ناباتەوە.

کە گەیشتنە ناو ڕاڕەوی قوتابخانەکە هێشتا زەنگی چوونە ژوورەوەی لێ نەدابوو.

١٩٧٧/١٢/١١

# موچڕکێك
# وا ئاوایییەکانیان کردە وێرانە

ئەسپی ئەتیلا ئاسایی هەر شوێنی پۆستاڵی سەربازەکانیانی گەیشتبێ سەوز نەبوو.

شینایی بە کێو و کەژەکانمانەوە نەما.

گۆڕستان و شەخس و پیرەکانمان بە بلدۆزەر و پاچ و پێمەڕە تەختکران، ناوی دێهاتەکانیان گۆڕی.

ئەی وشەی شەهیدان و ئێسك و پروسکی باو و باپیران و شەخس و پیرانمان چی لێئەکەن و چۆنی لە ناو ئەبەن.

ئەی چۆن ئەتوانن ڕەنگی گوڵاڵە سوورەی سەرگۆڕەکان بگۆڕن. چۆن کەو لە قاسپە قاسپ ئەخەن چۆن... هتد

١٩٧٨/٥/٢٠

# ڕەسم کردن

منالّینە هەر یەکەتان دەستە قەلّەمی ڕەنگا و ڕەنگی خۆی دەربێنێت و دەست بکا بەڕەسم کردن.

ـ مامۆستا چی ڕەسم بکەین؟

ـ بە ئارەزووی خۆتان، چی لە خەیالّتانایە، چ شتێك کاری تێکردوون، ئەمڕۆ، یان چەند ڕۆژێك، یان سالّێك لەمەوپێش. ئیتر وەکو وتم بە ئارەزووی خۆتان.

ـ یەعنی بە هەوەسی خۆمان؟

ـ ئا، ئا.. بە هەوەسی خۆتان.

منالّەکان قەلّەمە ڕەنگاو ڕەنگەکانیان گرت بە دەستەوە و خەریکبوون، مامۆستاکەیان لە گۆشەیەکەوە وەستاو خۆی لە قوتابیەکان نەگەیاند، وازی لێ هێنان هەر کەسەو بۆ خۆی چی ئەکات بیکات. نیوەی دەرس تەواو بوو، زۆربەی قوتابیەکان پەنجەیان هەلّبڕی، وتیان مامۆستا گیان تەواومانکرد.

مامۆستا وتی بەڕیز، پەلەمەکەن، لە(خدر)چووە پێشەوە و پێی وت: ئادەی خدر بۆم باسبکە بزانم چیت ڕەسمکردووە؟.

خدر: مامۆستا گیان ئەمە دێیەکەی خۆمانە بە بناری شاخی سورکێوەوە.

١٩٧٨/٩/٢٦

# سەعاتە گوڵ

لە باخێکی زۆر زلدا، بەرامبەر(سەعاتە گوڵ) دارێك چەقێنرابوو، گلۆپێکی شەوق خۆشی پێوەبوو، ئێواران کە دائەگیرسا ئەیدا لە سەعاتەکە، ئیتر خەڵك بە ئێواران و بەشەویش ئەیانزانی سەعات چەندە.

منداڵەکان: ئێی!

پیرۆت: من، نەئێی، ئەمە چیە ئێوە هەر لە خۆتانەوە زوو ئەڵێن ئێی.

منداڵەکان: بۆ وا نەڵێین؟ ئەی بڵێین چی؟!

پیرۆت: ئەی جارێ نابێ بزانین سەعاتی گوڵ چیە، ئینجا بڵێین ئێی.

منداڵەکان: قسەتە، باشە(سەعاتی گوڵ) چیە..؟ پیرۆت: زۆر زۆر باشە(سەعاتی گوڵ) سەعاتێکە بەلاپاڵی تەپۆڵکەیەکەوە، یان گردۆڵکەیەکەوەیە، ژمارەی سەعاتەکە بە گوڵی ڕەنگاو ڕەنگی ڕاستییە، هەر ڕاستی ڕاستی، سەعات ژمێرو دەقیقە ژمێرەکەشی لە تەختەیەو بە کارەبا ئیشئەکات. تێگەیشتن؟!

منداڵەکان: بەڵێ، بەڵێ. ئینجا ڕوویانکردە پیرۆت، باشە کاکە پیرۆت ئینجا بڵێین ئێی.

پیرۆت: بەڵێ، ئینجا هەموومان ئێ یی.

ئێوارەیەك منداڵان لەگەڵ دایك و باوك و کەسوکاریاندا هاتبوون بۆ ئەو باخە بۆ سەیران، بۆ خۆیان یاریان ئەکرد، هەندێکیان بەرەو لای سەعاتی گوڵەکە ڕۆیشتن بۆ ئەوەی بزانن سەعات چەندە، چوونە پێشەوە، سەیریان کرد گلۆپە شەوق خۆشەکە داگیرساوە، بەڵام زوورە زوور ئەگری.

منداڵەکان: ئەوە بۆ ئەگریت.

گلۆپەکە: ئەی نابینن سەعاتەکە خەوتووەو ئیش ناکات. ئەی ئەگەر ئەو بخەوێت و کارنەکات من خۆم بۆ هیلاك بکەم؟ بۆ بەدیاریەوە بوەستم؟، ئەی ئێوە چۆن بزانن سەعات چەندە؟ سەرتان لێ ئەشێوێت. وەختتان بە خۆڕایی ئەڕوات.

منداڵەکان: دەباشە بچۆ یەکێك بانگ کە چاکی بکاتەوە.

گلۆپەکە: ئەی نای بینن من بەم دارە چەقاوەوەم ناتوانم لە جێی خۆم بجووڵێم.

منداڵەکان: باشە، هەر ئێستا ئێمە ئەچین تەلەفۆن ئەکەین.

منداڵێك لە تەلەفۆنی باخەکەوە تەلەفۆنی هەڵگرت.

منداڵەکە: هەلۆ، تەلەفۆنخانەیە؟..

بەبێ زەحمەت ژمارەی تەلەفۆنی دووکانی سیامەندی سەعاتچی چەندە؟..

منالەکە نەختێك وەستا، ژمارەی تەلەفۆنەکەی وەرگرت، ئینجا تەلەفۆنی کرد.

منداڵەکە: وەستا گیان سەعاتە گوڵەکەی باخی گەورە ئیشناکات، بەبێ زەحمەت وەرە چاکی بکەرەوە، پارەشت چەند ئەوێت لە باوك و کەس و کارمانی کۆئەکەینەوە و ئەت دەینێ.

سیامەندی سەعاتچی: کاکە ڕاستە من سەعاتچیم، بەڵام ئەو سەعاتە بەکارەبا ئیشئەکات، کارەباچیەك لە مەکینەی کارەباوە بانگ بکەن هەر ئێستا بۆتان چاك ئەکات.

منداڵەکە: سوپاس. تەلەفۆنەکەی داخستەوە، دوای نەختێك هەڵیگرتەوە و بەهۆی تەلەفۆنخانەوە مەکینەی کارەباکەی وەرگرت. قسەی لەگەڵکردن، ئەوەندەی پێنەچوو(سەعاتی گوڵ)ەکەی چاك کردەوە، سەعاتەکە دەستیکردەوە بەچکەچك.

منداڵەکان: هەموو بەجارێ وتیان هێ ێ ێ ی.

گلۆپەکە: دەستی کرد بە پێکەنین و شەوقی خۆشتربوو.

سەعاتەکە: چك چك چك، چك چك چك.

١٩٧٨/١٢/١

# زەردە زیڕە

هەر چەندە زستان بوو، بەڵام ڕۆژەکەی خۆشبوو، هەتاوەکەی گەرم بوو، دایکی کاوە تەنافێك جلی شت و لەبەر خۆرەکە هەڵیخست. پانتۆڵێکی سەوزی تێدابوو گوڵێکی سووری لەسەرچنرابوو، هەنگێك هات بە باخەکەدا گەڕا بۆ گوڵێك، بەڵام زستان کوا گوڵماوە، گوڵە چنراوەکە بەزەیی پێداهاتەوەو دڵی پێی سووتا، هاواری لێکرد و بانگیکرد وەرە، وەرە، نەختێك لای من بنیشەرەوە و ئیسراحەت بکە، ئەزانم هیلاکی و بۆ گوڵ ئەگەڕێیت.

ئەوەندەی پێنەچوو پەپوولەیەکی ڕەنگاوڕەنگ هات و بە ناو باخەکەدا بە هێواشی بۆ گوڵ ئەگەڕا، هیچی نەدۆزیەوە، لە تاوا بەسەردار و دیوارەوە ئەنیشتەوە، گوڵێکی مۆر بەسەر کراسێکی سپیەوەبوو، بە دەنگێکی خۆشەوە دەستیکرد بە گۆرانی وتن و پێی وت: وەرە، وەرە پەپوولە بێ دەنگەکە، وەرە من لێرەم لەسەر ئەم تەنافە بەرزە، وەرەوە لێرەوە سەیری ڕۆژبکە، خۆت گەرم کەرەوە، خەفەت مەخۆ، نەختێك لەمەوپێش لەسەر جلشتنەکە گوێم لێبوو دایکی کاوە بە باجی گوڵچینی دراوسێیانی ئەوت زستان کەمی ماوە ئەبڕێتەوە و ئەڕوات، ئینجا بەهاردێت، گوڵەکان دێنەوە. پەپوولەکە فڕی، فڕی و چوو بۆ لای گوڵە مۆرەکەو پێی وت: سوپاست ئەکەم مژدەیەکی خۆشت دامێ.

لەولاوە زەردە زیڕەیەك بەسەر چیلکەیەکی وشکەوە نیشتبووەوە گوێی لەو قسانەبوو، وتی بامنیش بچم.

گوڵە سوورەکە وتی: بڕۆ، بڕۆ نەیەیت بەلای مندا.

- ئێ بۆ بۆ؟
- ئەڵێم بڕۆ.

ڕووی کردە گوڵەمۆرەکە، ئەویش پێی وت: بڕۆ، بڕۆ، ئەڵێم بڕۆ لەولاوە فانیلەیەک هەڵواسرابوو ڕەسمی منداڵێکی بەسەرەوەبوو تفەنگێکی بە دەستەوەبوو، منداڵەکە کە گوێی لەم قسانەبوو بەزەردە زیڕەکەی وت: ئەڵێم بڕۆ، ئەگینا بە فیشەکێك مێشکت ئەبەم بە ئاسمانا.

زەردە زیڕەکە وەختەبوو لە ترسا ڕۆحی بچێت، وتی: بۆچی، بۆچی؟!.

منداڵەکە وتی: بۆ خۆت گێل ئەکەیت زەردەزیڕە... تۆ زیرە لە منداڵان هەڵئەسێنی، تۆ ژەهر ئەکەیتە خوێنی ئاڵوجوانی ئێمەوە، ئەزانی ئەڵێم چی، ژەهر... ژەهر...

١٩٧٩/١/٢

# بۆمبا

له فەلەستین منداڵەکان بۆمبایەکیان گرت، کەلەپچەیەکیان کردە هەردوو دەستی، وتیان: دەی فەرموو پێشمانکەوە بۆ حەپسخانە. بۆمباکە وتی: بۆچی؟

منداڵەکان وتیان: تۆ دزیت، دزیت کردووە.

بۆمباکە: دز، دز... دزی چی، من چۆن دزی ئەکەم.

منداڵەکان: دزیشیت و زیاتریش.

بۆمباکە هاواری لە پیاوێکرد: مامەکە بۆ خاتری خوا، وەرە لەدەست ئەم منداڵانە ڕزگارم کە.

پیاوەکە هات: ڕۆڵە ئێوە چیتانە بەسەر ئەم بۆمبایەوە.

منداڵەکان: مامەگیان ئەمە دزە دز.

مامەکە هات گیرفانەکانی بۆمباکە گەڕا، پشتێنەکەی کردەوە، دەستیکرد بە باخەڵیدا، هیچی نەدۆزیەوە، ڕوویکردە منداڵەکان: کوڕەکانم، ئەمە هیچی پێ نیە، هیچی نەدزیوە.

منداڵەکان: مامەگیان چۆن هیچی نەدزیوە، ئەمە دزە دز.

مامە: باشە چیی دزیوە، پێم بڵێن، بۆ قسەناکەن.

منداڵەکان بە یەك دەنگ:

خۆشیی ئێمەی دزیوە، نایەڵێت هیچ خۆشیەك ببینین.

١٩٧٩/١/٣

# هەر دەگەڕێنەوە

پاش نیوەڕۆیەکی درەنگ، سەردار بە تەنیشت کولانەی مریشکەکانیەوە، بە بەرد و چیمەنتۆ دەستیکرد بە دروستکردنی یەك دوو خانووی بچووك، نزیکی ئێوارێ خانووەکانی تەواوکرد. هەردوو دەستی پاك پاك شت و نەختێك هاتە بەر دەرگای خۆیان، (سامان)ی هاوسێیانی دی. (ئێوارە باش) یان لە یەکترکرد و(سامان)ی بانگکرد خانووەکانی پیشاندا. سامان وتی: باشەوا زانیمان گەورەکەیان کولانەی مریشکە، ئەی، ئەم دوو خانوە بچووکە لە بەرد و چیمەنتۆ دروستکراون چین؟.

سەردار: ئەوە ئێستا ئەچم پەیژەیەك دائەنێم چۆلەکەو بێچووی یەك دوو هێلانە دەرئەهێنم و ئەیان خەمە ئەو خانوە تازانەوە!.

سامان: ئینجا بۆچی؟

سەردار: ئاخر کولانەکانی خۆیان پیس و پۆخلە و لە پووش و پەلاش و پەڕ و چیلکەو ڕیقنە دروستکراون.

سامان: ئەی خانوەکانی تۆ؟

سەردار: ئەوەچیە، ئەڵێی گاڵتەمان پێئەکەیت، ئەی نایابینیت چەند ڕێکوجوانن؟

سامان: گاڵتەت پێناکەم، تۆ جارێ قسەکەت تەواوکە.

سەردار: قسەکەم تەواوی چی بکەم؟ ئەیانگوێزمەوە بۆ ئەم خانوانە و هێلانەکانی خۆشیان سواخ ئەدەم بۆ ئەوەی نەگەڕێنەوە.

سامان: یانی ئەگەر سواخیان نەدەی ئەگەڕێنەوە؟

سەردار: ئەی چۆن، بەخوا ئەگەر وانەکەم یەکسەر ئەگەڕێنەوە!

سامان: دەسا بەسەری هەردوکمان هەزار سواخی بدەی، هەر ئەگەڕێنەوە.

سەردار: کەواتە هێلانەکانی خۆیانیان پێ خۆشە.

سامان: بەڵێ!

١٩٧٩/٣/١٥

# چۆلەکە و کرمەسوورە

چۆلەکەیەك بەسەر دار توویەکەوە دەیجریواند، گوڵە باخێکی زل بەرامبەری ملی بۆ لارکردبووەوە، گوێی لێدەگرت. پەپوولەیەکی سپی خاڵ خاڵی ڕەشی پێوەبوو، هات گوڵە باخەکەی ماچکرد، کە گوێی لە جریوە جریوی چۆلەکەبوو، ئەویش گوێی بۆ شلکرد.

شەماڵ هەڵیکرد چڵی دارەکان لەرینەوە، باوەشێنی چۆلەکەکەیان کرد، چۆلەکە کە بە تەواوی فێنکی بووەوە، ئەوەندەی تر هەوەسی هەستا، دەنگی لێ هەڵبڕی، ئەو ناوەی پڕکرد لە جریوە جریو.

باخەوانەکە دارەکانی ئاو ئەدا، بە بێڵەکەی جۆگەکەی بێڵ تەپ ئەکرد، لە پڕێکا بەدەم بێڵەکەوە کرمێکی سوور هاتە دەرەوە، کرمەکە یەك دوو پێچی بە دەوری خۆیدا خواردبوو.

چۆلەکە کە چاوی پێکەوت، پێی وت تۆ چیت؟!

کرمە سوورەکە وتی: من کرمم، کرم... کرمە سوورەم.

چۆلەکە: باشە تائێستا لە کوێ بوویت؟.

کرمەسوورە: لە ژێر عەردا بووم.

چۆلەکە: ئەی ماڵت بەقوڕنەگیرێت، لە ژێر عەردا چ دەکەیت؟! چ دەخۆیت؟! چۆن ئەژیت.

کرمەسوورە: وا دیارە زۆر سەیرە لەلات. ڕەگی دار و گوڵ و سەوزە زۆرە، ئەوانە ئەخۆم، ڕەگ ئەخۆم ڕەگ.

چۆلەکە: ئاخر ڕەگ بخۆیت، دار و درەختەکان سیس ئەبن، سەوزە نامێنێت، ئەو گوڵە جوانانە سیس ئەبن و ئەمرن.

کرمەسوورە: ئینجا ئەمرن کەیفی خۆیانە!.

چۆلەکەکە که گوێی لەم قسەیەبوو وەك هالیکۆپتەر بۆی دابەزی، بە دەنووك کوشتی، ئینجا هەر بەدەنووك قووتی داو خواردی. دەنووکی نا بە جۆگە ئاوەکەوە، تێر تێر ئاویشی کرد بە سەردا.

گوڵە باخەکە بە چۆلەکەکەی وت: نۆشی گیانت بێت.

پەپوولەکە وتی: نۆش، نۆش.

ئیتر لەو ڕۆژەوە تائێستا چۆلەکە لە هەر شوێنێك کرمە سوورەیەك ببینێ بە دەنووك ئەیکوژێت و ئەیخوات.

١٩٨٠/٣/٢

# دار گوێز نافەوتێت

شێرکۆ پەڕۆیەکی هێنا دەستیکرد بە پاککردنەوەی کورسیەکەی، کورسیەکەی زۆرجوان و قایم بوو، چونکە لە داری گوێز دروستکرابوو، دارەکەی خاڵ خاڵاوی بوو، هەر کە پاکی بکردایەوە یەکسەر ئەبریسکایەوە. (شێرکۆ) کورسیەکەی زۆر زۆر خۆش ئەویست، قەت قەت نەی ئەهێشت تۆز بیگرێت، کورسیەکەش زۆر لە(شێرکۆ) ڕازی بوو، هەر کەسێك جگە لە شێرکۆ لەسەری دابنیشتایە زوو جیڕەی لێ هەڵئەسا... جیڕ.. جیڕ...جیڕ... زوو هەستە زوو، وا قاچەکانم شکا. جیڕ جیڕ جیڕ.. پشتم شکا، پەراسووم شکا.. ناچار ئەو کەسە هەڵئەساو ئەیوت: باشە، باش نەمانزانی شێرکۆت ئەوەندە خۆش ئەوێ... باشە، باشە، وا دەچین لە شوێنێکی تر دادەنیشین.

هاوڕێیەتی(شێرکۆ) و(کورسیە دارگوێز)ەکەی بەردەوام بوو، هەر دووکیان یەکتریان زۆر خۆش ئەویست، هاوڕێکانی شێرکۆ هەموو جارێك بە شێرکۆیان دەووت: هاشێرکۆ کورسیە بچکۆلانە جوانەکەت چۆنە، خۆ نەشکاوە؟ شێرکۆ دەیوت: زۆرباشە سوپاستان ئەکەم، ئەوە دارگوێزە، دارگوێز، چۆن ئەشکێت!!.

ڕۆژێك شێرکۆ لە قوتابخانە هاتەوە، سەیریکرد کورسیەکەی ئەگری، سەری سوڕما، چوو بە پەرۆیەك پاکیکردەوە، سەیریکرد هەر ئەگری، هەرئەگری، ژیر نابێتەوە.

(شێرکۆ) دەستی هێنا بە قۆڵەکانیدا وتی: کورسیە جوانەکە پێم بڵێ بۆ ئەگریت، خۆ کەس لە تۆ جوانتر نیە، تۆ لە دارگوێزیت، دارگوێز.

(کورسی)یەکە بەدەم گریانەوە وتی: چۆن ناگریم چۆن؟ من دایکم سووتاوە، دایکم.

(شێرکۆ) دەمی داپچڕی و حەپەسا: دایکت!! دایکت!! کورسیەدارگوێزەکە: ئا، ئا.. دایکم... دایکم. بۆ تۆ وا ئەزانی هەر تۆ دایکت هەیە؟!.

شێرکۆ: با.. با.. باشە تۆ دایکت لە کوێیە؟

کورسیە دارگوێزەکە: دایکم درەختێکی زل زل بوو لەو شاخانە.. من لقێك بووم بەوەوە. ڕۆژێك خاوەنەکەمان بە تەور منی بڕیەوە، منیش گریام، وتم بۆ کوێم دەبەیت، من ناڕۆم، من ئەمەوێ هەر لای دایکم بم. دایکم دەستێکی هێنا بە سەرما و توند توند ماچیکردم. وتی: کۆرپە جوانەکەم مەگری، بڕۆ دارتاش بەچیتدەکات ڕازیبە، بڕۆ خزمەتی بکە، من هەزار لقی ترم لێ دەبێتەوە، لەسەر قسەی دایکم من بووم بەم کورسیەی ئەمبینیت، ئێستا بیستم کە دایکم سووتاوە، سووتاو، کە کورسیەکە قسەکەی تەواوکرد دایەوە پڕمەی گریان، شێرکۆش خۆی بۆ نەگیرا، ئەویش تێر تێر گریا. پاش ماوەیەك شێرکۆ چوو بۆ لای باوکی، قسەکانی کورسیە دارگوێزەکەی هەموو بۆ گێڕایەوە، باوکی هەندێك قسەی بۆ(شێرکۆ)کرد. شێرکۆ بە قسەکانی باوکی ڕەنگی هاتەوە سەرخۆی دڵیخۆش بوو. بەدەم پێکەنینەوە، بەگوڕ ڕایکردەوە بۆ لای کورسیەکەی، پێی وت: باوکم ئەڵێت"هیچ خەفەت نەخوات، درەختی گوێز بشسووتێت ڕەگی هەر دەمێنێت، هەر سەر هەڵدەداتەوە، هەر سەوزدەبێتەوە، ڕەگی دارگوێز لە ناو ناچێت، چونکە چۆتە ناو شاخ و بەردی واوە هەزار ساڵ بۆی بگەڕێن کەس نایدۆزێتەوە".

١٩٨٠/٤/١٩

# پەرژین

دارگوێز  زۆر زۆر گەورەیە، لە هەموو دارە بەردارەکانی کوردستان زلترە، پیرە، دنیای زۆردیوە، حکایەتی خۆش خۆش و سەیر سەیر ئەزانێت.

منداڵانی گوندەکەو دار و درەختی باخەکان هەموو ڕۆژێك سەریان ئەکردە سەری و داوای حکایەتیان لێئەکرد.

ڕۆژێك دار سێوێکی بچکۆلە بە زمانێکی(پس)ەوە پێی وت: "داپیرە، تو سەری خۆت، ئەمرۆ حکایەتێکمان بۆ بکە لەوانەی پێشوو سەیرتر بێت". دارگوێزەکە هەر لەسەر زمانی دارسێوە بچکۆلەکە وتی:"وەی بە سەرچاو!".

هەموو چاویان کردەوە و گوێیان شلکرد

دارگوێز وتی: لەو گوندەی ئەو بەر ئەو چەمەوە دارگوێزێك هەبوو زۆر لە من زلتربوو، ڕۆژێك چەند کەسێك هاتن بڕیانەوە، هێلانەی کۆترە کێویلەیەکی پێوەبوو، چوار پێنج بێچووی هەبوو. کە دار گوێزەکە کەوت بە ئەرزدا، بێچوە کۆترەکان هەریەکە کەوتنە لایەکەوە، لە ترسدا لەشیان دەلەرزی، ڕەشمارێك بەخشکە بۆیانهات و هەموویانی خوارد، سمۆرەکان دارگوێزەکەیان کونکردبوو، لە ناوەوە لانەیان بۆ خۆیان خۆشکردبوو، گوێزیان بۆ زەخیرەی زستان بۆ خۆیان هەڵگرتبوو، لەگەڵ دارگوێزەکە کەوت بە زەویدا، ئەمان لە دەنگەکەی ڕۆحیان چوو، لە ترسدا گوێز و مویزیان جێهێشت و هەڵهاتن. منداڵەکان لە یارمەتیی باب و کاکیان ئەهاتنەوە، هەر وەکو جاران ڕوویانکردە ژێر دارگوێزەکە بۆ ئیسراحەت و خۆفێنك کردنەوە، دارگوێزەکە لە ئەرزەکەدا کەوتبوو، کە منالەکانی دی، فرمێسك بە چاویدا هاتە خوارەوە.

مەڕ و ماڵاتی گوندەکە تاویاندایە خۆیان بۆ کانیی ژێر دارگوێزەکە بۆ ئاو خواردنەوە، کە گەیشتنە سەر کانیەکە سەیریانکرد ڕێگا نیە دەم بنێن بەئاوەکەوە،

بەتینیوێتی گەڕانەوە، سەگی شوانەکە سەیرێکی ئەم لاو ئەولای خۆیکرد تابزانێت خەتای کێیە، لە دوورەوە ئەوانەی دی کە دارگوێزەکەیان بڕییەوە، بەحەپە حەپ بۆیانچوو، یەکێکیان گەڕایەوە، گوللەیەکی نا بە تەپڵی سەری سەگەکەوە، لەجێی خۆی خپیکرد، منداڵێك وتی: حەیف بۆ ئەو مەڕ و ماڵاتە تینووە، خەفەتیان بۆ ئەخۆم.

دارهەڵووژەیەك: دەستی شکاوم بۆ ئەو دارگوێزە.

منداڵێکی تر: ئەی توخوا ئەو بێچووە فەقیرانە، ئاخۆ ئێستا لەسکی مارەکەدا چیبکەن؟!!

دارهەنارێك: ئەی ئەو سمۆرە جوانانە، بەخوا ئەم زستانە بێتەوە ڕەق ئەبنەوە"دارهەنارەکە هەر وایووت و دایە هارەی گریان".

دارگوێزەکە: ئای، ئای، ئەوە ئەگرین و خەفەت ئەخۆن، بمزانیایە وایە حکایەتم بۆ نەئەکردن. نەخەفەت نەگریان، بایی پوولێك کەڵکیان نیە، خەتا، خەتای خاوەنەکانمانە پەرژینمان بۆ ناکەن، پەرژینێك دڕکی درێژ و نووك تیژی پێوەبێت، هەرکەس پەنجەی بۆ هێنایین زوو لە پەنجەی بچەقێت، پەنجە بکات بەدەمیدا، بڵێ: وەی پەنجەم. هەتا باخمان بێ پەرژین بێت، ئەمە حاڵمانە حاڵ، تێگەیشتن. لەبیرتان نەچێت پەرژین... پەرژین.

١٩٨٠/٨/٢٦

# چۆلەکە

منداڵەکان:

ساڵێك لە وڵاتێکدا چۆلەکە زۆر زۆربوو، وتیان ئەم چۆلەکانە بمێنن دەغڵ و دانمان هەمووی ئەخۆن، وتیان باشە چی بکەین، وتیان با لە ناویان بەرین. وتیان باشە هەرکەسێك چەند چۆلەکە بکوژێ، ئەوەندە خەڵاتی بکرێ. هەر کەسە لە کۆڵان و گەڕەك، لە شار ودێ، دەستیکرد بە چۆلەکە کوشتن، تا قڕی چۆلەکەهات. خەڵکەکە لە خۆشیدا دەستیانکرد بەشایی و هەڵپەڕکێ. وتیان ئیتر دەغڵ و دانمان زۆرئەبێ.

ساڵێ داهاتوو وەختی تۆو وەشاندن بەدەم گۆرانیەوە تۆویان وەشاند، لە خۆشیدا پێیان نەئەکەوتە سەر ئەرز.

کە دەغڵ و دانیان نەختێك بەرزبووەوە، سەیریانکرد هەمووی سیس و زەرد هەڵگەڕاوە و هەمیشە کرمەسوورە دەمی تێدایەو لەسەری ئەلەوەڕێت.

هەموو دەستیان دابەدەستداو هاواریانکرد: ئەی هاوارچیمان بەخۆمانکرد؟ ئەگەر چۆلەکە بمایە هەموو ئەم کرمانەی ئەخوارد، نەی ئەهێشت وابە دەغڵ و دانمان بکەن. ئەو ساڵە وایان لێهات گەر گەنم و جۆیان لە وڵاتانی ترەوە نەهێنایە هەموو لە برسدا ئەمردن، ئیتر هەر ئەوساڵە هەستان چوون بۆ وڵاتان، پارەیەکی زۆریان خستەتەنکەی باخەڵیان تا چۆلەکەی پێبکڕن، خەڵکی ئەو وڵاتانە بەزەییان پێیاندا هاتەوە، هەندێکیان بۆگرتن و پێیان فرۆشتن، کە بردیانەوە لە هەر شوێنە خەڵك ئەچوون بە پیریانەوە و ئاهەنگیان ئەگێڕا. ئینجا چۆلەکەکانیان بەر ئەدا. دوای چەند ساڵێك چۆلەکە زۆربوو، دەغڵودان وەکو خۆی لێهاتەوە.

١٩٨٠/١١/٧

# نا.. نا.. نابین بە لم

بەردێکی زل بە چیاکەوە روانیە چەم و ئاوێك وتی: خۆزگە خۆم تلۆر ئەکردەوە، بەگرمەگرم ئەچوومە گوێ ئەو چەم و ئاوە!.

بەردێکی زلتر: بۆچی؟!

- حەزئەکەم گوێ لە هاژەی ئاوبگرم.

- نەکەی، نەخەڵەتێیت، جێگای ئێمە ئەم سەرشاخانەیە، لەگەڵ لێرە ترازاین لە ناو ئەچین.

- چۆن؟.. بۆ هەروا خۆڕاییە.

- نا.. نا، خۆڕایی نیە، گوێ ئەو چەم و ئاوە هەر ئەوەندەی خۆشە تا دەبێتە لافاو، کە بووە لافاو دەتبات، دەتبات، هەزار گرمەگرم و هاوار هاوار بە پوولێك ناچێت. ئەوەندەت ئەدا بە زەویدا تا شەق و پەقت دەکات. وات وردەکات تا نەتکات بە(لم) وازت لێناهێنێ.

- تا نەمکات بەچی؟

- بە(لم) بە(لم).

- ئینجا کە بووم بە(لم)

- کە بووی بە(لم) ئیتر هەزار سوێند بخۆیت، بڵێیت من بەردێکی زلبووم بەو شاخانەوە، کەس بڕوات پێناکات.

- ئەی چار چیە؟

- چار هەر ئەوەیە بەسەر ئەم شاخانەوە بمێنینەوە، نەترازێین، لەق نەکرێین، تالێرە بمێنینەوە نابین بە(لم) نابین بە(لم).

١٩٨١/١/٨

# ویژدانی منداڵێك

ماڵێك لە سەیران بوون، یەكێك لە كوڕانی ماڵەكە داوای لە باوكی كرد بەیەكەوە بچنەسەر ڕووبارەكە تا ڕاوە ماسی بكات، بە باوكی وت:"قولاپی ماسیەكە بەمنە، حەزئەكەم چەند ماسیەكی گەورە ڕاوبكەم، تا هەر لەم سەیرانە ئاگرێكی خۆش بە چیلكەو چەوێڵ و كۆڵكەدار بۆ بكەینەوەو بیبرژێنین. ئەڵڵا ماسیی برژاو چەند خۆشە!، وا دەمم ئاویكرد بۆی".

ئەوەندەی پێنەچوو گەیشتنە سەر ڕووبارەكە، (شوان) بە ئەسپایی قولاپەكەی لە گیرفانی دەرهێنا، وتی نەوەك بچێت بە پەنجەمدا، تۆزقاڵێك كولێرە چەورەی كرد بەسەری قولاپەكەوە، لەگەڵ باوكیدا چوونە سەر گابەردێك كە ئەیڕوانی بەسەر ڕووبارەكەدا، تا هێزی تێدابوو قولاپەكەی هەوادا، لە ناوەڕاستی ڕووبارەكەدا ئاوەكە دووسێ بڵقە بڵقی كرد، (شوان) تێگەیشت كە قولاپەكە لەوێدا وردە وردە چووە خوارەوە. (شوان) چاوی بڕیبوە شوێن قولاپەكە، لە دڵی خۆیدا ئەیوت:

"هەر لەرەیەك لە پەتەكەوەهات، من زوو دەستی خۆم ئەكێشمەدواوە تا قولاپەكە لە ئاوەكە سەردەهێنێت، بزانم ماسیی گرتووە یانا؟ دەی قولاپە ڕەشە سەر دەربێنە، ماسیەكی زل، هەر زۆر زل، بەقەدەر قۆڵی باوكم". باوكیشی هەر چەندە خەیاڵی ئەكردەوە، بە خەیاڵ حەزی ئەكرد مەلە بكات، سێ چوارجار ئەمبەر و ئەوبەری ڕووبارەكە بكات، بەڵام ئەیوت چۆن(شوان) بە تەنیا بەجێ ئەهێڵم.

(شوان) ماوەیەك چاوەڕوانی كرد، ماسی نەبوو، دانی بەخۆیداگرت، وەڕزنەبوو، لە دڵی خۆیدا دەیوت:"ئەمە ڕاوە ڕاو، ڕاو پەلەی ناوێت".

لەپڕ لەرەیەك لەپەتەكەوە هات، (شوان) تا هێزی تێدابوو باڵی كێشایە دواوە، ماسیەكی بچووك بە نووكی قولاپەكەوە دەركەوت، ڕەنگی سپیی ژێر سكی و ڕەنگێكی

زەرد باوی دەوری سکی بەتیشکی خۆرەکە ئەبریسکانەوە. (شوان) وتی:"ئەمە چیە بابەگیان؟. ئینجا ئێمە ئەم ماسیە فەقیرەمان ویست؟. بەخوا بە ناهەق وام لێکرد. ئای کە گوناهە!. خوایە ئێستا من چی بکەم؟!.. بابەگیان بابڕۆینەوە، من تاقەتی ڕاوم نەما". لە گەڕانەوەدا باوکی وتی:"ڕۆڵە، ئەوە تۆ بۆ ماسیەکی بچکۆلە وا خەریکە لە داخدا ئەمریت و پێ لە گوناهت دەنێیت، ئەی ئەوانەی بۆردومانی وڵاتێك و میللەتێك دەکەن و قڕ ئەخەنە منداڵە ڕووخۆشەکانیان، دەیانکەن بە نووکی سونییەکانیانەوە ئەبێ چی بکەن؟!"

شوان: ڕەنگە ئەوانە لە داخدا خۆیان بکوژن!!.

باوکی: نا.. نا.. ناکوڕم نا، خۆ کوشتنی چی؟! نە خۆیان ئەکوژن و نەتەڕەماش!.

١٩٨١/٧/٢٨

# گەڵا ڕێزان و فیسقەگولە

کوێستانێکی کوردستانە، پایزێکی درەنگە، بای خەزان دارێکی ڕووت و قووتکردۆتەوە، هەرچی پێی بڵێیت گەڵا پێوەی نەماوە گەڵایەکی زەردی ژاکاوی لوولخوارد و لە دوو پەلێکدا خۆی گرمۆڵەکردبوو، خۆی لە دەست بای خەزان و گەردەلوولی دەوران قوتارکردبوو، تەنیا فیسقەگولەیەك هەموو ڕۆژێك دەمەو ئێوارە سەرێکی لێئەدا، گوێی لێبوو جاروبار نووزەیەکی لێوەئەهات، ئەیوت: بەم گوزەرانەش ڕازیم، هەر باڕەش ڕاپێچم نەکات بۆ ئەو خوارانە تا بەهاری داهاتوو چرۆی ئەم دار و دارستانانەم ئەدیەوە، تا ئەبوونەوە بەگەڵا، تا ژیان ئەگەڕایەوە ئەم چیاو چۆڵانە، تا لاوان لەسەرکانیاوەکان چوپیان ئەکردەوە، گوندەکان شایی و کۆڕیان دەگێڕایەوە، تا بەچاوی خۆم ڕانە مەڕو بزنم، تا بەرخۆلەو کارژۆڵەم بە باوەشی ساویلەوانەوە ئەدی، تا گوێرەکەم ئەدیەوە مژی لە گوانی مانگای دایکی ئەدا، تا ژنانم ئەدی بەڕێگای کانیەوە، تا شەقەی دارکەم لەوچیایەی ئەو بەرەوە ئەهاتە گوێ، تا جووجەڵەم ئەدی بەبەر مریشکەوە، تا کەڵەشێر لە تاریك و ڕوونی بەیاندا دەنگی لێ هەڵئەبڕی، تا کورگەل ئێواران لەبەردەمی دیواری مزگەوتدا دەستیان ئەکرد بە پشتێنەکانیانداو چاویان لە ڕێگای کانی نەئەتروکان، تا دوکەڵی شێوی دیهاتی ئەوبەر بانگی دەستی ماندووی لەسەرسکی تێر ئەدا بەگوێ ئاسماندا. فیسقەگولەکە بە(با)ی ووت، گوێت لە رازی پیرە گەڵابوو، (با) سەرێکی بۆ لەقان، فیسقەگولە ووتی ها دەنامەردت نەکەن، ئەم ڕاز و ئاه و هەناسەیە بگەیەنە ئەو خەڵکەی لێرەوە ڕاپێچکران بۆ ئەو خوارانە، با چاکی لێبکەن بە لادا و هەڵکشێنەوە بەرەو ژوور، ئەم چیاو کێو و دەشت و دەرە بێ ئەوان وەکو دڵی بێ خۆشەویستی وایە.

١٩٨٢/٥/٢٦

# دوو جۆرە تەیارە

خێزانێکی دەربەدەری کورد لە وڵاتێکی ئەوروپا گیرسایەوە، منداڵەکانی تا نەختێك چاوو گوێیانکرایەوە، کەمێك دڵتەنگبوون، دوایی تۆزێك راهاتن. ڕۆژێکیان دایك و باوکیان بردنیان بۆ سەیرانگایەکی نزیك شار. منداڵەکان تاوێکی باش لەگەڵ منداڵانی تردا کەوتنە یاریکردن و پێکەنین، یەکێکیان بەلای منداڵێکدا ڕۆیشت، سەیریکرد ئەم مناڵە بەدەست سێبەری بۆ چاویکردووە و چاویشی هێناوەتەوە یەك، بۆ ئەوەی باشتر سەیربکات، وەك سەیری شتێك بکات وایە، منداڵە کوردەکەی خۆمان لێی نزیك بووەوە و وتی: کاکە گیان ئەوە سەیری چی ئەکەیت؟ منداڵەخاوەن وڵاتەکە: ئەی نازانیت هەموو .جارێك لەو تەیارەخانەیەی ئەو بەرەوە تەیارەکان هەڵدەسن و بەسەرماندا ئەسووڕێنەوە!.

منداڵە کوردەکە، ڕەنگی هەڵبزڕکا، سەری سوڕما، وایزانی ئەم باش گوێی نەگرتووە، وتی: چیی... تەیارە؟!.

منداڵە خاوەن وڵاتەکە: ئا.. ئا.. تەیارە، تۆ ڕاوەستە ئێستا هەڵدەستن و دێن گوڵبارانمان دەکەن، کاغەزی ڕەنگاوڕەنگمان بۆ هەڵدەدەن، پڕن لە وێنەی جوان جوانی منداڵان، وێنەی منداڵی کۆرپە و مەمکە شووشەی ورچی قەڵەو، کەروێشکی ترزل، پشە سمێڵ، سەگی تووکن، هەنگ، پەپوولە، مەلەکردن، یاری بە لم کردن، ئیتر چووزانم هەرچی منداڵ حەزی لێبکات.

کوڕە کوردەکە تا دەهات چاوی زەقتردەبوو، دەمی زۆرتر دەکرایەوە!!.

کوڕە خاوەن وڵاتەکە: کاکە ئەوە بۆ وا حەپەسای، بۆ تۆ تەیارەت نەدیوە؟!.

کوڕە کوردەکە: با، با، زۆرم دیوە، بەڵام هەر تەیارەیەك من دیومە، هاتووە بەسەرماندا و بۆردومانی کردووین، ماڵی سووتاندووین، بۆتۆ وا ئەزانی من لە خۆشیدا هاتووم بۆ ئەم ووڵاتەی تۆ.. من دەر بە دەری دەستی تەیارەم.

هەر ئەوەندەی وت و ڕایکردەوە بۆ لای دایك و باوکی، کوڕە خاوەن وڵاتەکە لە جێی خۆی وەك بزمار چەقی، دەمی داپچڕی و تا کوڕە کوردەکەی خۆمانی لە چاو ون بوو هەر سەیری کردو چاوی لێنەتروکاند.

١٩٨٣/٥/١٥

# دەرزەنێ ڕزگاری

دنیا هاوین بوو، بەیانیەکی ڕۆژی شەممە، دوو منداڵ لە سێبەری هەورەبانەکەیاندا، خەوتبوون، کۆتره باریکەیەك بەو بەریانەوە، بەسەردار سەرووییەکەوە ئەیخوێند، دەنگی ئەلەرییەوە، هەتاو لێی ئەدا، سوورایی لاملی دیاربوو، حەزی نەدەکرد کەس منداڵەکان لە خەو خەبەر بکاتەوە، مریشکەسووره بیست و یەك ڕۆژبوو لەسەر هێلکەکانی کڕکەوتبوو، ئەو بەیانیە بڕیاری دابوو بە دەنووك هێلکەکان بشکێنێ تا جووجەڵەکان سەریان لە هێلکە بجووقێت.

منداڵەکان لە پڕخەی خەوی خۆیاندابوون، کۆتره باریکەکەش لە گەرمەی خوێندنی خۆیدابوو، لە پڕ هالیکۆپتەرێك لەسەر هەورەبانەکەوە بە ڤڕمەڤڕ و ناڵە ناڵ و بۆڵەبۆڵ، زۆر لە نزمیەوە خۆیکرد بە ئەم دیوی هەورەبانەکەدا!!.. کۆتره باریکەکە خۆشی نەیزانی چۆن لەگەڵ باڵدارەکانی تردا فڕی و پێکەوە لە ئاسمان پۆلیان بەست، منداڵەکان ڕاچڵەکین و هاواریان لێهەستا، دەرگای حەوشە لەسەر یەك تاککرابووەوە و بەردێکی درابووەپاڵ، سەگێکی ڕەش کلکی نووساندبوو بەژێرسکیەوە، گوێچکەکانی شۆڕکردبوونەوە، هەر لە خۆیەوە سەری دانەواند و بەڕاکردن خۆیکرد بەژووردا، خۆیکرد بەناو دار ژاڵەکاندا و لەناو گەڵاکاندا خۆی شاردەوە.

نەختێکی پێچوو، ڤڕمەڤڕی کۆپتەرەکە کەم بووەوە، سەگە ڕەشەکە لە ناو ژاڵەکان هاتەدەرێ، گوێچکەو سەر و کەللەو لەشی هەمووی تۆز و خۆڵبوو، لۆزی کردە ئاسمان و دووسێ جار پێی وەڕی، وەکو بیەوێ بڵێت لە ترسی ئەو تەیارەیە خۆم کردووە بێرەدا، ئەگینا من ئەوەندە نەزانینم، لە خۆمەوە، خۆم بکەم بە ماڵی خەڵکدا، ئیتر دوای وڕە وڕەکەی هەر لە دەرگای حەوشەوە چووە دەرەوە.

منداڵەکانیش لەسەربان هاتنە خوارەوە، باسی وڕە وڕو ڤڕمەڤڕی کۆپتەرەکەیان بۆ دایك و باوکیان دەکرد، ئەوان خەریکی ئەوەبوون، تەلەفۆنەکەیان زرەی لێهەستا، زڕ...

زڕ.. زڕ..زڕ لە چوارەمین زڕەدا یەکێك لە منداڵەکان تەلەفۆنی هەڵگرت، نەختێکی پێچوو، هاواریکرد، پوورە شیرینم کوڕی بووە، ناویان ناوە(ڕزگار). تەلەفۆن دانرایەوە، هەموو بە خۆشیوە هاتنە هەیوانی بەرامبەر دەرگای حەوشە، باسی ئەوەیاندەکرد، کەی هەموویان بە دیارییەکی جوانەوە بچن بۆ ماڵی پوورە شیرین، لەپڕ گوێیان لە قرتە قرتی مریشك و جیوەجیوی جووجەڵەبوو، کە سەیریانکرد مریشکەسوورە بە دەرزەنێك جووجەڵەوە هاتە بەردەمیان، دایکی منداڵان بە گاڵتەوە بە مریشکە سوورەی وت: ها، خانم خان، چۆنی؟! چاکی؟!، ئەوە لە کوێ بوویت، لە دەنگی تەیارەکەش هەر لە کولانە نەهاتیتەدەر.

مریشکەسوورە: کە جووجەڵە سەری لە هێلکە بجووقێت، من گوێ نادەمە فڕەفڕو وڕە وڕی تەیارە!!.

دایکی منداڵەکان: ڕاستئەکەی، دەم خۆش. تۆ ئەزانیت بیرم چوو پێت بڵێم!.

مریشکەسوورە: چی؟!

دایکی منداڵان: ئەمڕۆ شیرینی خۆشکم کوڕی بوو.

مریشکەسوورە: بەخوا پێم خۆشبوو، ناویان نا چی؟!.

دایکی منداڵان: ڕزگار... ڕزگار.

مریشکەسوورە: باشە ئێمەش ئەم دوانزە جووجەڵەیە ناو دەنێین(دەرزەنێ ڕزگاری) منداڵەکان دایانە قاقای پێکەنین، چوارپێنج چۆلەکەش بەسەر دارمێوەکەوە کەوتنە جریوە جریو!.

١٩٨٤/٨/٢٠

# پۆلە کۆترێکی ماڵی

چۆلەکەکان بە جیو، جیو خۆیانکرد بە ماڵە ڕووخاوەکاندا، هیچ نەمابوو، نە دەنکە جۆیەك، نە دەنکە گەنمێك، نە وردە نانێك.

چۆلەکە: جیو، جیو، جیو، وەختە دڵم شەق بەرێت، کەس دیارنیە، کوا مناڵەکان بۆ نەگەڕانەوە.

قەلەڕەشکە: قاخخ.. قاخخ، وامنیش جەرگم بوو بەداخ، هەر نەگەڕانەوە، ئەم شاخ و داخە هەر بەوانەوە جوانە.

کلك هەڵسەنینە: ویس، ویس، ویس. کوا قاقای پێکەنینی منداڵەکان، کوا مام پیرۆت، کوا باجی گوڵچین، کوا مەلا سمایل، کوا مام بارامی مجەور، کوا کاکە حەمەی جوتیار، کوا خاوەن باخەکان، کوان ئەو کچە جوانانەی ئەچوون بۆ کانی، کوا دەنگە خۆشەکەی مام یوسف، بۆ وەکو جاران بانگ نادات، کوا دووکەڵی چێشتی ئێواران، کوا کوڕە گەنجەکانی بەر دیواری مزگەوت، کوا شایی. کوا هەڵپەڕکێ؟!.

کۆترە کێویلە: گم گم گم گم. باق باق بو. باق باق بو.. پۆلە کۆترێکی ماڵی هەندێکیان پەڕ لەپێبوون، هەندێکیان عنوانلی بوون، هاتن بەسەر دێیەکەدا دەورەیەکیان کردو ڕۆیشتن، هیچیان نەووت، چاویان ئاویکردبوو، چۆلەکەکان وایان ئەزانی سەرمایانە، بەڵام قەلە ڕەشەکە وتی ئەوە بۆ منداڵانی دێیەکەئەگرین.

# خاوەنی دارگوێز

دارگوێزێك لای(نۆڕك)ەوە
بە بۆڵەو نرکە نرکەوە
هاواریکرد: پایزەبرا
دیار نەمایت و دەنگت بڕا
بە(شارگڕ) (شارگڕ) وەرەوە
وەرە و بەسەرمان کەرەوە
خاوەنی پاکی ئێمە تۆیت
شەوق و ڕووناکی ئێمە تۆیت
وڵات بۆ پاسەوانی خۆی
کوردستان بۆ کوردانی خۆی
ئاهەنگی دار و ئاو و گوڵ
جریوەکەی مەلی سەرچڵ
کاتێك دەبێت کە بێنەوە
دەبێنەوە، دەبێنەوە

١٩٨١/١٠/٨

# (گورگ و بزنەکە)ی جاران

وەك حکایەتی(گورگ و بزنەکە)
دەئیتر بەسە(تەپە تەپ مەکە)
ئەی گورگە بۆرە پیسە توکنەکە
(کاسەو کەوچکمان پڕ لە خۆڵ مەکە)

- - -

جاران ئەتلووران
(ئەوە منم من منۆکە)
(دوو چاوم پێوەیە بز بزۆکە)
بەڵام ئەمڕۆ منداڵان
پێت ئەڵێن ترسنۆکە
لێت ناترسین هەنوکە

١٩٨٣/٣/١

# کوڕە کوردم بەکارم

کاکە ئالانم ناوە
دایکی کورد و نازدارم
مەمکی لە زارم ناوە
کوڕی وڵاتی جوانم
پڕ چیاو بەفر و ئاوە
بەنازە کوردستانم
تەماحی تێکراوە

١٩٨٣/٢/٢٦

## کارئاسك

کار ئاسکەکەی لای گەرمیان
چاو ڕەشەی ڕەشی قەتران
لەسەر سەر دوو قۆچ ڕواو
سك سپییەی، پشت سوورباو
کلك ڕەشەی لۆز بۆر
هێند خێرایت، پێم ئەدەی بۆڕ
پەل و پا ساف و ناسك
کار مامزی و کار ئاسك
گوێ زلەی وت و وریا
تۆم خۆش ئەوێت، بێ ڕیا

١٩٨٢/١٠/٣٠

# لە دایکبوونی شیعرێک

لە خەیاڵی شاعیرێکدا
شیعرێکی خۆش بۆ منداڵان
لە شارێکی وەکو بەغدا
بە ئەسپایی سەری هەڵدا

...

بولبلێك هات بەلایەوە
بۆی خوێند بەلایە لایەوە
پێی وت، کە هەستای بەرەبەیان
بەستە ئەڵێین بۆ منداڵان
شیعر وتی، نەء کاکی خۆم
من بەیانی شەبەق ئەڕۆم
بۆ ئەو سەرە، بۆ کوردستان
منداڵی کورد بە هەزاران
لە ئەشکەوتا، لە دێهاتا
لە ڕۆژانێکی نەهاتا
چاوەڕوانی شیعرێك ئەکەن
دەرمان بێت بۆ دەردی وەتەن

١٩٨٣/١٠/٢

# بلبل وتی

کاکەی منالٚ
بە هەزارحالٚ
یەکێکی وەك تۆم دەسکەوێ
خۆشی بوێم، خۆشم بوێ
قسەی دلٚمی لەلابکەم
کە تێم بگات و تێی بگەم
کاکەی منالٚ
گولٚی ناومالٚ
من حەز ناکەم هیچ کەس بمگرێ
هەرچی بمگرێ، خوا ئەیگرێ
چونکە من بێ فڕوفێلٚم
چونکە من بۆ چاکە وێلٚم
کاکەی منالٚ
شنەی شەمالٚ
من بلبلم، بلبل، بلبل
بەلەش بچووك، بە ئەقلٚ زل
من بلبلم، بلبل، بلبل
دێم بۆ لای تۆ بە خلە خل
تا بە هەوەس، بە ئاسانی
دنیا بکەین بە گۆرانی
.....

# چلەی مامۆستا فەرەیدوون ڕۆژی ١٩٩٢/١/١٢
# بەغداد

## ئەو بابەتانەی بۆ چلەی مامۆستا نوسراون
## یاخود لە چلەکەیدا خوێندراونەتەوە

# ئەستێرە، گەر وردوو خاشیش بێت، هەر دەگەشێتەوە

**ئاسۆ فەرەیدون عەلی ئەمین**

لە ژیاندا هەندێ کەس هەن بۆ سامان پێکەوەنان هەڵپەدەکەن و دەتوانن سامانێکی زۆر پێکەوەبنێن. کەچی هەر لەپاش مردنیان ئەو سامانە دەبێتە هۆی دووبەرەکی و دەستەو یەخە لە نێوان نەوەی و بەدناوی بۆخۆی بەجێدێڵێت. هەندێکیش هەن لە مەیدانی دەستەڵاتداریدا بۆ جێگایەکی دیار و بەرزدەگەڕێن. بۆ ئەم مەبەستە ناچاردەبن سەر بۆ گەلێك کەس شۆڕبکەن، لە پاش نەمانی دەستەڵاتدارییان کەس چاکەیان ناڵێت. هەندێکش نەبۆ سامان و نەیش بۆ پایەبەرزی، بەڵکو خۆیان دەخزێننە کونجێکی خەڵوەتکێشییەوە و خەرێکی خواپەرستیدەبن.

ئەمانە لەپاش کۆچیان خەڵقی چاکەیان دەڵێت. بەڵام لەگەڵ کوێربوونەوەی کێلی گورستانیان، وردە وردە ناویشیان کوێردەبێتەوە. هەندێکیش وەکو داری بەردار، هەم بەرو هەم سێبەریان هەیە. لە ژیاندا نە بۆ سامان و نە بۆ دەستەڵات تەقەلا نادەن، بەشوێنی(ڕاستی)دا دەگەڕێن. لەم ڕێگایەدا تووشی گەلێك ئەشکەنجەو دەردی سەری دەبن. بەڵام چرای ڕۆشنبیری دەکەنە پێشڕەو، بۆ ڕاستی، بۆ ڕۆشنبیری، بۆ پەروەردەی نەوەی نوێ، هەموو بیرو هۆشیان تەرخاندەکەن. سامان لەناو دەچێت، دەستەڵات کزدەبێت، بەڵام تاکو لە کەوندا ژیان مابێت(ڕاستی)یش هەردەمێنێت. وەکو زێڕی ناو تێزاب، لە پاش خۆی، گەر ساڵەها لەناو خاکوخۆڵدا بمێنێتەوە، ئەوانەی بە شوێنی(ڕاستی)دا دەگەڕێن هەر دەیدۆزنەوە، وەکو ملوانکی زێڕین، ژیانی پێدەڕازێننەوە خوالێخۆشبوو، فەرەیدونی باوکمان، لەو مرۆڤانەبوو کە بە شوێنی ڕاستیدا دەگەڕا گوێیی نەدایە سامان، بەشوێن دەستەڵاتدا نەگەڕا بیرو هۆشی بۆ پەروەردەکردنی ڕۆڵەکانی میللەتەکەی تەرخانکرد، کە ئەوانیش چرای ڕۆشنبیری هەڵکەن و بەشوێن(ڕاستی)دا بگەڕێن.

ئێمەیشی بەو بیرە پەرەووەردەکرد، خۆشەویستی زانستی و ڕۆشنبیری کردە عەشقێك وەکو ئاگر لە دڵماندا بڵێسە بسێنێت و بەهیچ شتێك خامۆش نەبێت. ئەو چرایە ڕێگامان

بۆ رووندەکاتەوە رێگا ونناکەین. لە تۆێی لاپەڕەکانی گەنجینەی ڕۆشنبیریی باوکی نەمرمان ئەو ڕاستییانە دەدۆزینەوە. لەم کارەدا، هاوڕێکانی لەئێمە بەجەختتر ئەو بەرهەمانەی کۆدەکەنەوەو بە سوود وەرگرتن، لەم کتێبەدا، وەکو ملوانکی زێڕین دەیهۆننەوە. ئەمانە جێگای سوپاسن. بەتایبەتی مامۆستا عەبدولرەزاق بیمار کە ئەم ئەرکە قورسەی خستەسەر شانی خۆی و مامۆستا د. عەبدولسەتار تاهیر شەریف کە لەبارەی نرخی پەروەردەوە بیرەکانی باوکی نەمرمانی لە بەردی مەحەکداو جوانی و ڕاستی بۆ مامۆستایان و قوتابیانی پەروەردە ڕوونکردەوە.

ئەمە هەموو ئەو سامانەیە کە بۆی بەجێهێشتووین و ئەم سامانەیش نرخی قەد کۆتایی نایێت. ئەو ڕۆڵانەی کە بەم بیروڕایانە پەروەردە دەبن، دەچنە سەر ئەو سامانە و نرخی پتردەکەن. وەکوو ئەستارە کە ورد و خاشیش بێت. هەر دەگەشێتەوە.

بابە گیان، تۆ بووی یەکەم مامۆستای لێهاتووی پایە بڵندی ژیانم، ئەو مامۆستا هەمیشە پەرۆشەی بەهەستی خاوێنی خۆشەویستیی گەل و نیشتمان و ڕێزلێنانی گەورە و بچووك و زمان و دەست و دەروون و داوێن پاکی و ڕەوشت و نەفس بەرزی گۆشت کردم و ڕاتهێنام و ژیان و ڕەفتار و هەڵسوکەوتی خودی خۆت بوونە پەندو ڕێنیشاندەرم.

بابە گیان، تۆ ئەو کەڵەی وەك لوتکە سەر بەرز هەمیشە لە ناخی دەروونماندا نەمر و زیندوویت، بێوچان شانازیت پێوەدەکەین و بەدەستی قەدر و ڕێزو نەوازشەوە وا ئەم بەرهەمە نوێیەت پێشکەش بە خوێندەوارانی کورد دەکەین، ئەوانەی بە درێژایی ژیانت دەتویست بە بیری خاوێن و بەرزت زاخاوی مێشکیان بدەیت و بەرەو ئاسۆی سەرفرازی ڕاستەقینە دەستیانبگریت.

لە کۆتاییدا زۆر سوپاسی مامۆستا د. بەدرخان سندی و کارگێڕانی دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردیدەکەین بۆ ئەو ئەرکە زۆرەی لەچلەی ماتەمین و لە چاپ و بڵاوکردنەوەی ئەم کتێبەدا کێشایان.

هەروەها زۆر سوپاسی دکتۆر وریا عومەردەکەم کە بەتێر و تەسەلی لە ئێزگەی کوردی بەغدا رووناکی خستبووە سەر ژیان و بەرهەمی ئەدەبی خوالێخۆشبووی باوکم.

# وتاری بەڕێز بەڕێوەبەری گشتیی دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی

**مامۆستا دکتۆر بەدرخان سندی**

بەڕێزێکی بێپایانەوە بەناوی خۆم و کارگێڕانی دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردییەوە ستایشی سەرپەرشتیی بەڕێز وەزیری ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن دەکەم بۆ چلەی ماتەمینی مامۆستا و ئەدیبی کۆچکردووی کورد فەرەیدون عەلی ئەمین.

ناسیاویم لەگەڵ مامۆستا فەرەیدون دەگەڕێتەوە بۆ نزیکەی چارەکە سەدەیەك.. کاتێك لە نێو ئۆتۆمبیلدا لە گەشتێکدا یەکمان گرتەوەو گفتوگۆمان کرد، ئەو کاتە زانیم کە لە تەنیشتی مرۆڤێکەوە دادەنیشم گیانی پڕ لە ڕاستگۆیی و پیاوەتییە بەرامبەر بە میللەتەکەی.. هەر لەوێ هەستم کرد لەگەڵ ڕۆشنبیرێکدا قسەدەکەم کەوا تەواوەتی سوورە لەسەر ئەوەی میللەتان بە ئاواتەخوازی هیواکانیان نایەتەدی، تەنیا بەکاری بێ وچان نەبێت. پیرۆزترین کار کە لەلای مامۆستا فەرەیدون بینیم هەوڵی ڕۆشنبیری کردن و هۆشیارکردنەوەبوو، بەوەی کە گەلەکەمان پێویستی بە زۆر زۆر هەیە و(نەزانینیش) چەپەڵترین دوژمنانی گەلە.

مامۆستا ئەوینداری ئەدەب و مێژووی کوردبوو، هەرچی شتێك پێوەندیی بە کەلەپورمانەوە هەبووایە خۆشی دەویست و زۆرجار وادەبوو لە بابەتی شیعری کوردی قۆناغی بابان و شێخ مەحمود پرسم پێدەکرد ئەویش لە وەڵامدانەوەکانیدا زۆر بەتوانابوو. تەنانەت زۆر جار بە تەلەفۆن قسەم لەگەڵ دەکردوو بەدرێژی باسی بابەتی ئەدەبیمان دەکرد.

جارێکی دی ژیان پێکەوەی کۆکردینەوە، ئەم جارەیان لە کۆلێژی پەروەردە هەر کاتێك دەمبینی هەنگاوە قورسەکانی لەسەر پێپلیکانەی کۆلێژەکەی بەرەو هۆڵی وانەوتنەوە لەبەر نەخۆشیەکەی کێشیاندەکرد، خەمێکی گەورە دڵی ئەگوشیم، ئەو

لاوەی پێش چارەکە سەدەیەك بینیم و نموونەی بە توانایی و ڕێکوپێکی بوو نەخۆشی ئاواکاری لێکردووەو پێش کاتی خۆی پیربووەو هەروا بەبێ وادەش کۆچی کرد، بەڵام کەس دەتوانێت ڕێ لە فەرمانی خوابگرێت؟

خوشك و برایان...

کاتێك ڕۆشنبیرێکی کوردمان لێدەمرێت هەست بە زیانێکی گەورە و بێ وێنەدەکەین لەوەی کەسێکی دیمان لێبمرێت چونکە ئێستا ڕۆشنبیر لە کۆمەڵگاکەی ئێمەدا کەسێکی بە دەگمەن و دانسقەیە چونکە ئێمە کۆمەڵێکین باری ڕامیاریی ئەم چاخە زۆربەی هەلی فێربوون و ڕۆشنبیری لێزەوتکردین لەبەرئەوە ئێمە پێویستمان بە دوو قاتی ڕۆشنبیر و هەر ئەدیب و مامۆستایەك هەیە.

هەر لێرەشەوە کاتێك ڕۆشنبیرێکمان بە دڵسۆزی و پێنووسەکەیەوە تیا هەڵئەکەوێت و بەخێراییش ماڵئاواییمان لێدەکات ئەوا ژان و مەرگەساتەکەمان بە ئاسانی لەبیرناچێتەوە.

بەڵام ئەوەی بەڕاستی هەستی پێدەکەین ئەوەیە کە لاوانی ئێستای گەلی کورد خەریکە ئەوەی ڕابردووە جێی بگرێتەوە، هەروا ئێمە لەبەردەم بووژانەوەیەکی ڕاستەقینەی ڕۆشنبیرین و لە نێو نەوەیەکدا مامەڵەدەکەین هەوڵدەدات ڕۆشنبیرییەکی پتەو بهێنێتەکایەوە، وە لەم جێگایەوە بە خوالێخۆشبووی ئازیز دەڵێم: بنوو لە جێگا پیرۆزەکەت، ئێمە لەسەر ڕێڕەوەکەت بەردەوامین و خەونە سەوزەکانت وەدی دەهێنین. لە پاشەڕۆژدا ڕۆڵەکانت دەبینی لەسەر ڕێگای ڕۆشنبیریدا یەکن.

سڵاو بۆ خێزانی خوالێخۆشبوو و ڕۆڵەکانی. وە لەخوا دەپاڕێمەوە سەریان بخات و بەچاکترین جێگری باوکیان لە کۆمەڵگای کوردەواریمان جێی خۆیان بکەنەوە.

# وتاری مامۆستا د. عەبدولستار تاهر شەریف

بەڕێزان:

ڕۆژی چوارشەممە ڕێکەوتی١٩٩١/١١/٢٥ دڵە گەورەکەی خوالێخۆشبوو مامۆستا فەرەیدون عەلی ئەمین لە لێدان کەوت... پێش ئەوەی ماڵاواییمان لێبکات، لەگەڵ مامۆستا شوکر مستەفا پێکەوە چووینە نەخۆشخانە بۆ سەردانی، وادیاربوو نەخۆشیی(فەقەرات) ماندووی کردبوو، لەگەڵ ئەوەشدا هۆشی لای خۆی مابوو، هەرچەندە لە جووڵەی خستبوو بەڵام بە دەنگێکی نەرم و لەبن لێوەوە بەخێرهاتنمانی کرد.. قەد باوەڕم نەدەکرد وازوو بەجێمانبهێڵێ، خۆباوەڕم نەدەکرد کاك فەرەیدونی خۆشەویست، خۆشەویستی هەموو کوردێکی دڵسۆزو نیشتمان پەروەر، خۆشەویستی سەدان منداڵی قوتابیی کورد کە مێشکیانی بە خۆشەویستی ووشەی کوردی و خۆشەویستیی نەتەوەکەیان و نیشتمانەکەیان زاخاودابوو، وا بە پەلە بەجێمانبهێڵێ، خۆ هەمووی دوو حەفتەی بەسەر تێپەڕنەبوو بوو هاتە لام بۆ ماڵەوەمان و باسی گەڵ پرۆژەی پەروەردە و زانستمان پێکەوەکرد، بە تەمای ئەنجامدانی کۆمەڵێ پرۆژەی نووسین بوو بۆ نەوەی تازەی گەلەکەی، وادیارە زۆریانی بردە ژێر گڵەوەو هەندێ هیوای گەورەشی هەبوو بەداخەوە مەرگ ماوەی نەدا فریایان بکەوێ.

بۆ ڕۆژی دوای سەردانەکەمان هەواڵی کۆچی دواییی مامۆستا فەرەیدونم بیست.. باوەڕبکەم یان نا؟! بەهەر حاڵ مرۆڤ کاتی خۆشەویستێکی بەجێی دەهێڵێ، سەرسام دەمێنێ و دەکەوێتە گێژاوێکەوە وای بەسەردێنێ قینی لە ژیان و لەمردن پێکەوە بەجووتە ببێتەوە.. ژیان دەبێ چیبێ ئەگەر مردنی لەدواوە بێ؟!

بەڵێ دڵە گەورەکەی مامۆستا فەرەیدون لەلێدان کەوت، ئەم هەواڵە هەموو مامۆستایان و ئەدیبان و نووسەران و تێکۆشەرانی کوردی دڵتەزێن کرد. هێشتان زووبوو، هەموو چاوەڕوانی بەرهەمی زیاترمان لێدەکرد، بەرهەمی ئەدەبی و پەروەردەیی، پەروەردەکردنی منداڵی کورد و زاخاودانی مێشکیان بە چیرۆکە کورتە

جوان و نایابەکانی و شیعرەکانی بۆیان، ووشەکانی چیرۆکەکانی بۆ منداڵان ئێستاش لە گوێچکەم دەزرینگێتەوە. وای لە منداڵی کورد دەکرد حەزیان لە ئاشتی بێو قینیان لە شەڕبییتەوەو رسوای بکەن، فێری پاکی و خاوێنی بن، پاك و خاوێنیی دەست و دەروون. مامۆستا فەرەیدون دڵی گەورەبوو، کوردی خۆش دەویست، لەوانەیە ئەوی نەیناسیبێ لێم تێنەگا، کێ هەیە کوردی خۆشنەوێ و خۆی کوردبێ؟. بەڵی ڕێبازی تایبەتی خۆی هەبوو بۆ ئەم خۆشەویستییە، پێوەری تایبەتی خۆی هەبوو، پێوەری بۆ هەر کەسێك هەڵوێستی ئەو کەسەبوو بەرامبەر بە کورد، ئەگەر ئەو کەسە هاوڕێیەتی نەیارێکی کوردی بکردایا، ئەو کەسەی خۆشنەدەویست، بەرەو ڕوو بەوپەڕی جورئەتەوە پێی دەوت تۆچۆن کوردی؟! چۆن دەست دەخەیتە ناو دەستی نەیارێکی کورد؟ نموونەمان بۆ پێوەری خوالێخۆشبوو زۆرە... مامۆستایانی کۆلێجی پەروەردەی زانکۆی بەغدا- بەشی کوردی لەم ڕووەوە مامۆستا فەرەیدونیان باش دەناسی.

برایانی بەڕێز:

مامۆستا فەرەیدون کۆچی دواییکرد و بەجێمانی هێشت، بەڵام لە دڵی هەموو کوردێکی ڕۆشنبیردا دەژی و دەمێنێ و نەمرە. گەلێ ئاواتی لەگەڵ خۆیدا بردە ژێرخاکەوەو بەتەمای بینینی گەلێ ئاواتبوو بۆ نەتەوەکەی.. یەکێتیی ڕیزەکانی گەلەکەی ئاواتی هەرە بەرزی بوو. ئەم ئاواتەشت لە گەشانەوەی دەموچاوی و پێکەنینەکانی سەر لێوەکانی دەخوێندەوە کاتێ کە دەهاتە سەر باسی مافە ڕەواکانی نەتەوەکەی. بەڵێ یەکێتیی کورد و گەشەکردنی ووشەی کوردی لە هەموو کەس‌و شتێکی تر خۆشەویستربوون لەلای.

مامۆستا فەرەیدون ماڵئاوایی لێکردین، بەڵام هەمیشە زیندوو نەمرە، دوارۆژ لاپەڕە زێڕینەکانی مێژوو ئەم شایەدییەی بۆ دەدەن، کە چۆن جێگای خۆی کردوەتەوە لەسەر ئەو لاپەڕانەدا، ئەویش بە پەرەوەردەکردنی سەدان منداڵی کورد و زاخاودانی مێشکیان بە خۆشەویستیی ووشەی کوردی و نیشتمانەکەیان: کوردستانی خۆشەویست.

بەڵێ.. دوای کۆچکردنی دوایی، یەکێ لە قوتابییەکانی لەسەر لاپەڕەی ڕۆژنامەی هاوکاری یادی مامۆستا خۆشەویستەکەی دەکاتەوە، کە لە ساڵی١٩٥٤دا مامۆستای بووە، هەواڵی مردنەکەی وای لێدەکا دەستداتە خامەکەی و بنووسێ:

"بەڵێ رایچڵەکانم، هەناسەم سواربوو، هێزم لەبەربڕا، جەستەم شلبوو، بەرچاوم تاریکبوو، وەك شریتی تۆمارکەر بیرم گەڕانمیەوە بۆ پۆلی پێنجەمی قوتابخانەی(ئەییوبیە)ی ساڵی ١٩٥٤. بەیانی بوو مامۆستایەکی بەژن قەشەنگو ڕووخۆش خۆی کرد بە پۆلەکەماندا، دوای ڕۆژباش خۆی ناساندپێمان. کەوتە قسەی خۆشو بەتام، سەرنجی هەمووومانی ڕاکێشا بۆ لای خۆی، ئەمجا وتی من مامۆستای وانەکانی کۆمەڵایەتیی ئێوەم...".

پاشان دەڵێ:

"وای لێهات بە ماوەیەکی کەم مامۆستای دڵسۆز کەوتە سەر زاری هەمووومان چونکە پێشەکیی وانەکانی کردبووە ئامۆژگاری بۆمان و ڕابەری دەکردین بۆ خوێندنەوە، بۆ بەتینکردنی بیروباوەڕ، بۆ یەکگرتن و پتەوکردنی ڕیزەکان، بۆ ئەمەکداری لە خاك، بۆ دڵسۆزی و نیشتمانپەروەری.

دەیفەرموو: ڕۆڵە جگەرگۆشەکان! نیشتمان چاوەڕوانی هیممەت و هێزی بازووی ئێوەیە، دڵپاکبن لەگەڵ یەك، دووربن لە کینەو دژایەتی، هەوڵدەن و پێبگەن و ببنە پێشڕەو..."

پاشان ئەم قوتابییەی دەڵێ:

"ووشەکانی هەمیشە لەبەر گوێماندا دەزرنگایەوە، ئامۆژگارییەکانی بوونە دروشمی هەمیشەیی ڕێگەی ژیانمان. هەتا ئێستاش هەر ڕێگەی ئەومان گرتووەو بە ئاماژەی ئەو کارمانکردووە".

بەڵێ.. مامۆستا فەرەیدون لە دڵی(صلاح حامد)ی قوتابیی خاوەن ئەم ووشانەی سەرەوە نەمردووەو هەر زیندووە... چۆن دەمرێ ئەمانە ووشەو ڕەوشت و ئاکاری یەکێ لە قوتابییەکانی بێ؟!

بەڕێزان:

لاپەڕەکانی ڕۆژنامەو گۆڤار و کتێبە کوردییەکان بخوێننەوەو بزانن مامۆستا فەرەیدون چەند خۆی ماندوو کردووە بە زاخاودانی مێشکی منداڵانی کورد و نەوەی تازەی گەلەکەمان، لە چیرۆکە کورتەکەی(سێ تاڵە تیشکی خۆری خۆشەویستیی منداڵان) کە هەستی هەر سێ تاڵە تیشکەکە هەڵبژاردەی ژیانی کۆمەڵایەتیی کوردەوارییە، ئەو کوردەوارییەی مامۆستا فەرەیدون تا دوا هەناسەی ژیانی شۆڕەسواری مەیدانو ڕێبازە دوورو درێژو سەختەکەی بوو، کەم شۆڕەسواری کوردمان هەبوو لە ڕیزی مامۆستایان و ڕۆشنبیرانی نەتەوەکەمان بەم جۆرە بە پەرۆشی دوا ڕۆژی بن. کە خوالێخۆشبوو ئەو دواڕۆژەی لە چاوە گەشەکانی منداڵانی چەوساوەی کورددەبینی. یان ئەو دواڕۆژەی لە پێدەشتی گەرمیان و زۆرگ و تەلان و قەدپاڵە سەختەکانی کوێستان دەبینی لەساڵی شەستەکاندا، کاتێ بینی تەنها بە قەڵەم و نووسین ناگاتە ئامانجی مەبەست. بەڵێ تەنها یەك سەعات دوانەکەوت لە خەبات و کۆششی چەکدارانە کاتێ کە سەیریکرد چەکهەلگرتن ئەرکێکی مێژووییەو ئەویش دەبێ یەکێ لە شۆڕەسوارەکانی ئەو قۆناغەبێ.

ئەم قسەیەم سیی ساڵی ڕەبەقی بەسەرداتێپەڕبووە.. بەڵێ دوای سی ساڵ فەرەیدونی مامۆستا و فەرەیدونی تێکۆشەر کاتێ لە شەقەی باڵدەدا و خواحافیزییمان لێدەکا، نەك هەر دڵی قوتابییەکانی دوێنێ و مامۆستایانی ئەمڕۆ دەهەژێنێ، بەڵکو لقوپۆپی درەختەکانی چەمی ڕێزان و دۆڵی سورداش و بازیانیش دەهەژێنێ.

دەئەی گردی سەیوان چۆن باوەشت بۆ ئەم شۆڕەسوارەی قەڵەم و چاك کردەوە، بەو جۆرەش ڕێزو حورمەتی بگرە وەك لە هەموو ژیانیداو لەو ڕۆژەوەی خۆی ناسیوەتەوە خاکی نیشتمانەکەی لە هەمووشت لا پیرۆزتربوو، تۆش بەشێك بووی لەو خاکەو لەو خۆشەویستییە.

١٩٩٢/١/١٢

# وتاری مامۆستا د. وریا عومەر ئەمین

لەدوا شەستەکاندا بوو، کە هێشتا قوتابی بووین لە بەشە کوردییەکەی ئادابی بەغدا.. لە گفتوگۆ و دانیشتنە ئەدەبییەکانماندا ناوی خوالێخۆشبوو"فەرەیدون عەلی ئەمین" وەك نووسەر و ئەدیب بەرگوێدەکەوت.

- لە ساڵی ١٩٧١دا بوو کە یەکەمجار چاوم پێیکەوت لە کۆڕێکی ئەدەبیی کۆمەڵەی ڕۆشنبیریی کوردیدابوو.. خوالێخۆشبوو لەم کۆڕەدا قسەیکردو شیعرێکی تەڕو ناسکی خووساوە بەخەم و بیری فەلسەفیی خۆی خوێندەوە- بەناوی نوقڵێ – دوا دێڕەکانی دەڵێ:

**نوقڵێ واچرای شەو کوژایەوە**

**کەچی ڕەحمی تۆ نەتلیسایەوە**

**قەیناکا ئەوە با گلەیی بێ**

**با ئەو دڵەی تۆ بێبەزەیی بێ**

**با نەتپرسیبێ حاڵی ئەم ونە**

**کە غەرقی دەریای خەمی بێ بنە**

بەمە خۆی وەك شاعیرێکی ڕەسەن و لێهاتوو و بەهرەدار ناساند. بیرمە کە کۆڕەکە نەواوبوو چۆن گەنجان و قوتابییانی بەشی کوردی و ئەدەب دۆستان دەور و خولیاندا، هەر یەکە دەیەویست لە نزیکەوە ئەم گەوهەر چییە بناسێ و زیاتر شیعر و قسە خۆشەکانی ببیستێ.

دوای ئەمە هەر دوور بە دووری دەمناسی. ڕێکەوت نەبا کۆی نەدەکردینەوە، تا ساڵی١٩٨٥ داواملێکرد بێ لە بەشی کوردیدا ببێ بە(محاضر)، داواکەی ڕەتنەکردمەوە، تا ساڵی١٩٨٨/ ١٩٨٩ مایەوە... لەبەر ئازاری قاچەکانی داوای لێبوردنی کرد. ئەو ماوەیەی لە بەشی کوردیدا مایەوە دەرفەتی بۆ ڕەخساندم خوالێخۆشبوو فەرەیدون عەلی ئەمین لە

نزیکەوە بناسم: ڕاو بۆچوونەکانی لەبارەی گەلێ کێشەی ئەدەبی و زمانەوانییەوە ووردو بەجێبوون...

قوتابییەکان خۆشیان دەویست و ڕێزیان لێدەگرت...

هیچ باسی خۆی و نووسینی خۆی نەدەکرد، بەڵام لە قسەکانییەوە تێدەگەیشتم کە زۆرشتی بەدەستەوەیە.

ئاگادارم زۆر بەرهەمی چاك و ڕەسەنی هەبوو..ساڵەهای ساڵیشی بەسەرا تێپەڕیوە بڵاوی نەکردوونەتەوە.. هیوادارم بنەماڵەو دام و دەزگا ڕۆشنبیرییەکان ئەم بەرهەمانەی ئازادبکەن و گوڵدانی ئەدەب و ڕۆشنبیریی کوردیی پێبڕازێننەوە.

مامۆستا فەرەیدوون مرۆڤێکی پاك و دەروون ڕوون و بێگرێ بوو. دەرەوەی وەك ناوەوەی، ناوەوەی وەك دەرەوەی. بڕوایەکی پتەوی بەخۆهەبوو، دڵخۆش و گەشبین بوو.. چونکە خاوەنی خۆی بوو... دڵسۆز و شەیدای گەل و نیشتمانەکەی بوو.. زمانی پاراو و ناسك بوو.. کەم قسەی دەکرد و دەیزانی چۆن ووشەکانی هەڵبژێرێ. قسەخۆش و شارەزابوو.. سینەی بە دەنگوباسی ئەدەبی پونگابووەوە، ئەو ماوەیەی لە بەشی کوردی مایەوە، (بەشی) ئاوەدان کردبووەوە.. دانیشتنەکانمانی گەرموگوڕ و دەوڵەمەند کردبوو.

ئەم مردنە کتوپڕە ناوەختەی خوالێخۆشبوو زیانێکی گەورەی بە جیهانی ڕۆشنبیری و ئەدەب و پەروەردەی کوردی گەیاند. لە ئاست ئەم کارەساتە کۆست خەرە هەر ئەوەندە ئەتوانم بڵێم هەزار ڕەحمەتی لێ بێ.. خوا سەبووری بدا بە کەس و کارو دۆستانی..

# فرمێسکی گەش بۆ یادی مامۆستا فەرەیدونی نەمر.

د. حەسەن جاف

داخەکەم! خۆزگا وتارێکی ئاوا لەم شێوەم لەم یادە دڵتەزێن و ماتەمییەدا نەخۆندایەتەوە! خۆزگا کۆڕێك بوایە بۆ هەڵسەنگاندنی بەرهەم و هەڵوێست و پیاوەتیی ئەو مرۆڤە دڵ گەورە دڵسۆزەی نەتەوەکەمان و خۆیشی تەشریفی هەبووایە! هەمدیسان داخەکەم!

دەمێك بوو ناونیشانی دۆستی لەدەس دەرچووم بیستبوو، بەڵام ناسیاوی و ئاشنایەتیمان لە شەستەکانەوە دەستپێدەکات، ڕاستتر بڵێم پێش یەکتربینین، بە نامە گۆڕینەوە و دڵسۆزایەتی بۆ بیروباوەڕ یەکترمان ناسیو دیارە ئیتر قەدەر و ڕێکەوتیش دەستی تێداهەبوو کە یەکتربینینمان زوو بەدیهات و لە کوردستان پێك شادبووین. ئەتوانم بڵێم دۆستایەتیمان لە هەشتاکاندا بەتەواوەتی گوڵی کرد.

ئەم مرۆڤە نەمرە، نەتەوە پەروەرە، هەمیشە بەتەنگ هەموو لایەنەکانی ژیانی کوردەوەبوو، هەر کات لە هەر جێگاو ڕێگایەکدا بۆی دەستبدایە لە خزمەت گوزاریی هیچ کەسدا کەمتەرخەمی نەئەکرد، بە دەست و بەزمان و بەدڵ تەنانەت بە خەیاڵیش هەر بیری لە سوودو بەرژەوەندی نەتەوەکەی ئەکردەوە، هەر لەو تێڕوانینەوە وەك کوردێك سوود بە ئەدەب و ڕۆشنبیریی نەتەوەکەی بگەیەنێ منی زۆر هاندەدا کە بەهرەی خۆم لە مەیدانی خزمەتی ئەدەب و ڕۆشنبیریی کورد و کوردایەتیدا بەبەربهێنم، بنوسم، بخوێنمەوە، هەنگاوی گەورەتربنێم.

بەڕاستی ئادەمیزاد لە ژیانیدا تووشی ناخۆشی و کارەساتی ئەوتۆ دەبێ توانای بەرەنگاربوونی نامێنێ و چارەیەکی لەبارشك نابا بۆ ئەوەی خۆی پێ ئارام بکاتەوە. ئایا لە مەرگی خۆشەویستی، کارەساتێ ناخۆشتر هەیە کە مرۆڤ فرمێسکی بۆ برێژێ؟ بۆ کۆچی دوایی مامۆستا فەرەیدونی ئازیز لە فرمێسك ڕژین بەولاوە هیچ دەسەڵاتێکی ترم نییە، چارەیەکی تر نادۆزمەوە خۆمی پێ ئارامکەمەوە. بۆیە ناونیشانی ئەم

وتارەشم فرمێسکی گەشە بۆ یادو سەرگۆڕی ئەو پیاوە نەمرەی که ئەگەر بمانەوێ ژیانی لە بەندو فەسڵی باسو لێکۆڵینەوەدا جێبکەینەوە، ئەوە ئەبێ بە ووردی تۆماربکرێ و نووسینی شاکاری بۆ تەرخان بکرێت، ڕێبازی پاکو خاوێنی کوردایەتیی مامۆستا فەرەیدون لە هەموو بەرهەم و ڕەوشتیا ئەدرەوشایەوە، بەڕاستی کوردێکی ڕاستەقینەی خاوەن بیرو باوەڕی پتەوی کوردایەتی بوو، هەرگیز لە ڕێباز و بیروباوەڕی خۆی لای نەداوە. سەرکەوتنی ئاوات بوو، هەموو ژیانی تەرخان کردبوو بۆ ئەم مەبەستە.

مامۆستا فەرەیدوون مامۆستابوو، شاعیربوو، ڕەخنەگربوو، تەنانەت کوردایەتییەکەی لەو شیعرانەیدا کە زۆربەی بۆ پەروەردەی جگەرگۆشەو نەوەکانی داهاتووی کورد وتووە، بەئاشکرا دیارو ڕەنگاوڕەنگ و ڕەسەنن، زۆر بەگڕوتینن، هەر چییەکی نووسیوە هەر هەمووی لەبەرخاتری کورد و کوردستان بووە. ئەم کەڵە پیاوە نەمرە بەبێ کورد هەڵی نەدەکرد، بەبێ هەوای کوردایەتی پشووی بۆ نەئەدرا.

لەگەڵ ئەمانەدا مامۆستا فەرەیدوون پیاوێکی ئازاو چاونەترسبوو، تابڵێی قسەلەڕوو ئاشکرا وێژبوو، خاوەنی هەڵوێستی تایبەتی خۆیبوو، لە پێناوی هەقیانەتدا با لە سەریشی بکەوتایە قسەی خۆی هەردەکرد، بەڵام زۆر بە ئاقڵانەو بە ویژدانانە بڕیاری ئەدا، لە ئاستی دۆستایەتیدا دڵناسك بوو، هەستێکی تایبەتی خۆی هەبوو، هەڵوێستی ئیجابی و سەلبی بەرامبەر هەر مەسەلەیەك هەبووایە، ئیتر هیچ نەیئەگۆڕی، هەر شتێك قەناعەتی سەد دەرسەدی پێنەبووایە بڕوای پێنەئەکرد، حەزی لە مجامەلەی ووشکو پاساوی ڕووپامایی نەئەکرد.

خوشکو برایانی بەڕێز:

ئەم پیاوە، ئەم مرۆڤە دڵسۆزەی ئێمە هەتاهەتایە لە دڵی هەموو کوردێکی خاوێندا هەر دەمێنێ و یادی پیرۆزی لەبیر ناچێتەوە.. هەزار ڕەحمەت بۆ گیانی پاکت... گۆڕت پڕنوور و جێگات بەهەشتی بەرین بێ..

خواسەبووریی هەموو نەتەوەی کورد بەگشتی و خاوو خێزانی بەتایبەتی بدات و هیوادارین ڕۆڵەکانی جێگاو ڕێگای باوکیان چۆڵ نەکەن، سوپاس بۆ هەموو لایەك.

# ئەدیبێکی دڵ ناسکو سەر بڵندمان لە دەست چوو

**وتاری مامۆستا مستەفا نەریمان**

تەمەنی ئادەمیزاد وەك دەست پێکردنی هەیە ئاوابوونیشی لەدوایە، هەر ئەدیب و نووسەرێکیش بەپێی بەرهەمەکانی پێوانەئەکرێت.

ناسینم لەگەڵ خوالێخۆشبوو فەرەیدون عەلی ئەمیندا ئەگەڕێتەوە بۆ نیوەی یەکەمی پەنجاکان، ئەوسا بەندە مامۆستابووم ئەویش لە کەرکوك خوێندکاربوو، سەرەتای نووسینیشی لە پەنجاکانەوە دەستی پێکردووە، کە بوو بە مامۆستا لەگەڵ عومەر عەبدئەلرەحیم قۆڵیانکرد بە قۆڵی یەکتردا و بڕیاریاندا زنجیرە کتێبێك پێشکەش منداڵانی کورد بکەن، ئەوەبوو لە ساڵی١٩٥٨دا(پاڵەوانی دوارۆژ)یان پێکەوە پێشکەش کرد، پاش ئەوە مامۆستا کۆستی کەوت و فەریدونیش لەگەڵ تەوژمی کوردایەتیدا دای بە شاخا.

پاش بڵاوبوونەوەی بەیانی١١ی ئازاری١٩٧٠ هاتە بەغداو بڕیاریدا لە سێبەری ژیانێکی ئاسوودەییدا خزمەت بکات، بوو بە فەرمانبەر لە وەزارەتی(کاروباری ژووروو) ئینجا نەقڵبوو بۆ(بەڕێوەبەرێتی گشتی خوێندنی کوردی)و لەوێ لە دانان و وەرگێڕانی حەوت کتێبی قوتابخانەدا بەشداریی کردووە.

لەو ساڵانەدا سکرتێری گۆڤاری(بەیان)بووم، هەمیشە چاومان بە یەك ئەکەوت و لە گەڕەکیشدا بووین بەدراوسێ، لەو ماوەیەدا کەرەستەی ئەدەبیی نایابی بۆ هێنام کە لە ژمارەکانی ساڵانی١٩٧٢ تا ١٩٧٤دا بڵاوکرایەوە وەك(حەمە مینەکەی گەڕەکی خۆمان، خۆزگەی کوێرێکی زگماك، مناڵ و خەنجەر و خوێن، عەلیی عارف ئاغا مناڵ و مەمك و بنێشتە تاڵ، سێ تاڵەتیشکی خۆشەویستیی مناڵان... هتد).

هەروەها دە نووسینیشی لە ڕۆشنبیریی نوێی ئەو حەلەدابڵاوکردەوە، هەر لەو ساڵانەی کە لە بەڕێوەبەرێتی گشتی خوێندنی کوردیدا بوو ئەم کتێبانەی پێشکەش منداڵانکرد.

- پیاوە بچکۆلەکە.
- کارژۆڵە.
- سێو.
- گەنمەشامی.

پاش ئەوەش(پیرێکی ڕیش درێژ)ی لەچاپدا.

ئەگەر بە شێوەیەکی گشتی بڕوانیتە بەرهەمەکانی خوالێ خۆشبوو ئەبینین زۆربەی نووسینەکانی بۆ منداڵانە. چونکە منداڵی بەم شێوەیە ئەهاتە بەرچاو کە فەرموویەتی:

"نازانم چ بەهرەیەکی خوایی و چ هێزێکی نادیار و تەلیسماویتان پێیە؟ هەر چەندە سەیرتان ئەکەم هێمنی و دڵنیایی و بێخەتایی و ئێسك سووکی و جوانکیلەیی و ساکاری و خۆشی و گەشی و ڕووناکی و هیواو زەردەخەنە ئەبینم.

ئێوە بەو منالییەوە وەك ئەستێرەیەکی جریوەدار پرشنگی ئەو هەموو شتانە بەدەوری خۆتاندا ئەپرژێنن، بۆیە بەرامبەر بەوە بەخۆمدا ڕائەپەرمووم کە ئەم دیارییە بچکۆلانەیەتان پێشکەش بکەم. هیوادارم بەدڵتان بێت".

- نامیلکەی پیاوە بچکۆلەکە، پێشەکییەکەی نووسینی خوالێخۆشبوو بۆ منداڵان لەگەڵ ئەوانەی پێشخۆی جیاوازی لەوەدابوو فەرەیدون پسپۆڕێکی پەروەردەبوو، لەناو منداڵاندا ژیابوو، فێری ئەکردن و لە هەست و نەستیان ئاگاداربوو، جگەلەوەی ئەدیبێکی کورد پەروەربوو. فەرموون بزانن چۆن وەستایانە بە هەستی کوردایەتی گۆشی منداڵی ئەدا:

**کوڕە کوردم، شەش ساڵم ‎‎ وردیلەو ڕوومەت ئاڵم**

**بۆ تامی خوێندن هاتووم ‎‎ مامۆستا دەستەدە باڵم**

**من هەنگوینی ناو شانەم ‎‎ یان بێچوولەی هێلانەم**

**خوێڕی ناسووڕێمەوە ‎‎ مەکتەبە ماڵ و لا نەم**

- نامیلکەی(پیاوە بچکۆلەکە، ل٤٦)

یاخود ئەڵێت:

**ئەوا ئیتر بەهارە** **خۆشیی دێهات و شارە**

**خۆشیی لە بولبول و مەل** **خۆشیی لە شوانی بەرغەل**

**خۆشیی لە بولبول و مەل** **خۆشیی لە منی منالّ**

خۆشیی لەم کوردستانە کە وەك نووری چاومانە

ـ نامیلکەی(کارژۆلە، ل١٦)

فەرەیدونی ڕەحمەتی ئەدیبێکی قەلّەم پاراوی بەوەفابوو، لە نزیکەوە پیرەمێردی بینیبوو و ئاگای لەشاکارە ئەدەبییەکانی بوو، سەدان شیعری ئەوی لەبەربوو کە لەم لاوە قسەو قسەلۆکەی دەربارەی ئەو نەمرە بیست بەرپەرچی ئەوانەی بە نامبلکەی(چەند سەرنجێك لە پیرەمێردی نەمر)ەوە دایەوەو کە لە ساڵی١٩٧١دا لە چاپیدابوو.

خوالێخۆشبوو نووسینی پوختی لە ماوەی چل ساڵدا لە ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردییەکاندا بلاّوکراوەتەوە شایانی ئەوەن ببنە سەرمەشق بۆ نووسەرانی ئەم ڕۆژگارەمان.

بریا خاوەن هیمەتێك هەمووی کۆئەکردەوەو بلاّوئەکرایەوە!. لێرەدا و لەم جێو مەقامە لەوەندە زیاتر بەدرێژ خایەنی ئەدرێتە قەلّەم ئەگینا باسو لێکۆڵینەوەی لەمە زیاتری بەدەمەوەیە.

هەزار ڕەحمەت لە خاوەن ئەو دڵە ناسکە، ئەو ئەدیبە سەربلّندە، ئەو پیاوە خاوەن عیزەت نەفسە، ئەو ئەدیبە، ئەو فەرەیدونە.

١٩٩١/١/٥

# سەفەرێکی کتوپڕ

عەبدوڵا عەباس

دواجار کە دیدەنیم کرد

وتم مامۆستا گیان.. سەفەرنەکەی!

هێشتا زووە..

زۆر قوتابی دی هەن هێشتا

پێویستیان بە تۆ هەیە..

سەفەرنەکەی.. جارێ زووە

هێشتا نەوەی ئەم سەردەمە

زۆر لە تۆو.. ڕابەر و مامۆستای وەك تۆ

بۆ توێشووی ڕێی سبەی..

دوو سبەی ئەخوازن..

سەفەر مەکە..

جارێ زووە...

بە زەردەخەنە دڵسۆزانەکەی ووتی:

دڵم خۆشە، هەڵئەسمەوەو

جارێکی دی ئەخوێنمەوەو

ئەنووسمەوەو.. لە زۆر مەیدانی

ووشەی جوانی کوردیی پاکا

هەموو بەیەك ئەگەینەوە.

کە بەجێم هێشت... وتم سبەی

نەء .. دوو سبەی ئەچمەوە لای

کەچی وتیان: بەگوێی هیچ کەسمانی نەکرد
سەفەرێکی لەپڕی کرد
ئێستا زمانم گۆ ناکا.. قەڵەمەکەم لەمەزیاتر
بۆ نووسینەوەی بڕناکا...
بۆچی.. ئەی مامۆستای گەورە؟
بۆچی ئەوەن بە پەلە بووی؟ زۆری مابوو
ئێستا.. لێم ببوورە.. مامۆستا
دڵ پڕ لە خەمە.. ڕووخۆشەکەم
لەمە زیاتر نانووسم
هەنسك و فرمێسك نایەڵن.
لێم ببوورە.

# یادی فەرەیدون عەلی ئەمین

عەبدولرەزاق بێمار

یادی ئەم پیاوە چاکە، ئەم دۆستە دڵسۆزە. ئەم نووسەرە هێژایە. ئەم پەروەردەکارە وردە. ئەم خەباتگێڕە کوردە. ئەم کوردە بێگەردە، ئەم مرۆڤە پاکە، ئەم برا بەجەرگە. ئەم گیانە بێفیێڵۆ ڕاستگۆیە ئەم هەڤاڵەی کاروانە. ئەم چرای ڕێگەی دوورە، ئەم سوارچاکەی مەیدانە ئەم کوڕەی ڕۆژی تەنگانە. ئەم خۆشەویستە و ئەم ڕووناك بیرەزانین دۆستە. یادی فەرەیدون لە لاپەڕەکانی بیرو ئەندێشەمدا بە دێڕی بریسکەدار تۆمارکراوە.

لە ڕۆژی کۆچی دواییدا ئەگەرچی شایانە فرمێسکی گەرمی بۆ برێژین بەڵام خۆزگە دەمانتوانی لەباتی ئەوە ئەڵقەیەکی لیکۆڵینەوەی بەپێز بۆ بەرهەمەکانی ڕێك بخەین تا بە پشووی قووڵ لێیان بکۆڵینەوەو گەوهەرە بەنرخەکانیان بخەینە ڕوو. من دەستوور دەخوازم کە تەنیا باسی چەند سەرنجێکی گشتی بکەم کە لە کەسێتی و بەرهەمەکانی خوالێخۆشبووم هەلگرتووەتەوە. ئەوسەرنجانەش مایەی چەند یادگارێکن کە هەر چەندە بیرم دەکەونەوە زیاتر دەستی ڕێزو قەدرزانی بۆ برای نووسەر فەرەیدوون عەلی ئەمین لەسەر سنگ دادەنێم.

پاش ساڵانی حەفتا. لەوەزارەتی کاروباری ژوور و فەرمیدوونم ناسی، پاشان لە بەڕێوەبەرێتی خوێندنی کوردی پێکەوە فەرمانبەربووین.

لە نزیکەوە ئەو پیاوەم ناسی و گەلێ سەرنجی ووردم لە جۆری کەسێتی هەلگرت و بۆم دەرکەوت کە زۆر ڕەوشتی بەرز و نایابی وای هەیە شایانە نەك هەر بە شانازییەوە باس بکرێن بەڵکو ببن بە نموونەی ڕەوشتی جوان.

لەنزیکەوە ناسیم کە نەك هەر حەزبە زانین و ڕۆشنبیری دەکات بەڵکو بەڕێزەوە سەیریان دەکات و بەچاوی ڕیزیش سەیری نووسەران و ڕۆشنبیران دەکات. هەوڵیش دەدا زیاتر خۆی ڕۆشنبیربکات و ئەوەی نەیزانیوە بیزانێت و ئەوەی زانیویەتی و باوەڕی پێ هێناوە بەرگری لێ بکات. لەگەڵ ئەوەش کە بەخۆی ڕادەپەرمو و بەرگری لە زانینی خۆی

دەکرد. هێشتا خۆی بە زلنەدەزانی و لافی فرەزانی لێ نەدەدا. خۆیشی دەمێك بوو ماموٚستای قوتابخانە بوو. نووسین و هەڵبەستی بڵاوکراوەی هەبوو..

ئەگەر گیانی کاکی برا نەڕەنجێنم، لە کەسێتی ئەودا(رەقی)بوو. کەوا لەسەربیروباوەڕ و مافیڕەوا بەردەوام بوو، بێ ئەم لاوئەولاکردن و بێلادان.. تا ڕادەی ڕەقی لە کۆڕی کارکردندا. لەگەڵ بەردەست و سەرۆك ئیش و لەگەڵ هاوکار و هاوقەڵەماندا فرِوفێڵی نەدەزانی، یەکێك دارشتنی کوردی باش نەبوایە. دەیگوت باش نیت، نەك هەر ئەوە بەڵکو نابێ پاداشت وەربگرێت وەك من هاوڕێیەك تەرجەمەی باش نەکردایە دەیگوت باش نییە. کارێك چەوت بوایە دەیگوت چەوتە. وازی لە مافی ڕەوا نەدەهێناو پێی لێدادەگرت تا بەنیاز دەگەیشت.

بەڵێ لەسەر بیروباوەڕی خۆی سوور بوو بەڵام ئامادەبوو گوێ لە بۆچوون و بەڵگەو شیکردنەوەی بیرو ڕای تریش بگرێت و هەر خۆی بەدوا ئەو بیرو باوەڕانە بگەڕێت تا تێیان بگات.. نەرم و نیان سەودایان لەگەڵ بکات. لەم لایەنەشەوە ڕێزی دەنا لە هەڵوێستی چاکو بیری بە فەڕو ئەوەی بەرژەوەندی گەلەکەی تێدا بوایە. بەڵێ لەسەر بیروباوەڕ سووربوو، ڕەقبوو. بەڵام دەمارگیرێکی کوێرانە نەبوو.

لەگەڵ خەڵکیشدا سەرەڕای دەست و دەمپاکی، هەواداری ڕەوشتی سوارچاکانەبوو، هەر وەکو سەردەمی سوارچاکێتیی ئەورووپا، چۆن ئەگەر سوارچاك قسەی کابرایەکی بەدڵنەبا یان بۆنی سووکایەتی لە قسەکەی بکردبایە، دەستەوانەکەی لە دەست خۆی هەڵدەکێشاو بە دەموچاوی کابرای دادەداو داوای شیربازی لێدەکرد.. ئا .. ئەوها فەرەیدون هەندێجار لەو جۆرە هەڵوێستانەدا ئامادەی مەیدانخوازی دەبوو.

من کە ئەم ڕەوشتە نموونەییانە باسدەکەم، تکام وایە وێنەی یەکێکی گرژی ڕووقایم و بەرچاو تاریك لە خەیاڵدا نەکێشن.. نا.. ئەو ڕەقییەی کە مەبدەئیانە بوو پێویستی بەشان تەکاندن و کوردی گوتەنی ماستاو ساردکردنەوە نەبوو، پێویستی بە زمان شیرینی ڕووگەشانە نەبوو. دەنافەرەیدوون.. هەر وەکو لە شیعر و چیرۆکەکانیدا دیارە مرۆڤێکی ڕووخۆش و بەڕێز و قسە خۆش و ئارام و بەڕێزبوو، هەستی بەزەیی لە دڵی پڕ لە سۆزیدا دەکوڵاو بەرامبەر بە گەل و نیشتمانەکەی دەبوو بە تنۆکە ئاوێك.

ڕەنگدانەوەی دەروونی پاکی لەو ڕستەو ووشە جوانانەدا خۆی دەنوێنێ کە بەنووکی قەڵەم دەیهۆندنەوە. بزانە چۆن ڕووی دەمدەکاتە منداڵانی نیشتمانەکەی:

"نازانم چ بەهرەیەکی خوایی و چ هێزێکی نادیار و تەلیسماویتان پێیە؟ هەر چەندە سەیرتان ئەکەم، هێمنی و دڵنیایی و بێخەتایی و ئێسك سووکی و جوانکیلەیی و ساکاری و خۆشی و گەشی و ڕووناکی و هیواو زەردەخەنە ئەبینم. ئێوە بەو منداڵییە وەك ئەستێرەیەکی جریوەدار، پرشنگی ئەو هەموو شتانە بەدەوری خۆتاندا ئەپژێنن، بۆیە بەرامبەر بەوە بە خۆمدا ڕائەپەرمووم کە ئەم دیارییە بچکۆلانەیەتان پێشکەش بکەم.. هیوادارم بە دڵتان بێت".

بەڵێ بەم هەستە ناسکە لەگەڵ منداڵان دەکەوتە ئاخاوتن و هەرجارە چەپکێك هەڵبەست و چیرۆکی ڕەنگاوڕەنگی پێشکەش دەکردن. کە ئەگەر هەر تاکێکیان بکەیت بە نموونە. شعوری باوکایەتی و هەستی ناسکی و دڵسۆزیی مامۆستاو کارامەیی پەروەردەکاری پێوە دەدرەوشێتەوە..

کاك فەرەیدوون سەرەڕای هەستی ناسکی شاعیرانە. ڕەوشت جوان و سەرنج وردیش بوو، لەلایەن کۆمەڵایەتی دەکۆڵییەوەو کردەوەی چاکو دەستووری پیاوەتیی ناو کۆمەڵی پەیڕەودەکرد.

گەلێ یادگاری تری مامۆستام لە خەیاڵە. هەریەکەیان نموونەیەکی جوانی ڕەوشت و کەسایەتیی خوالێخۆشبوو فەرەیدوون عەلی ئەمین پێشان دەدەن. کە بەڕاستی مرۆڤێکی پاك و نووسەرێکی هێژاو پەروەردەکارێکی مایەداربوو.

چرایەك بوو لەو چرایانەی ڕێگەی دووری کاروانی کوردەوارییان ڕووناك کردەوە.

مامۆستا هەر ئەوە نەبوو بۆ ژیان بژی. بەڵکو بۆ دوای خۆیشی ئەوەندە یادگار جوان و بەرهەمی بەکەڵکی بۆ بەجێهێشتووین کە بە درێژایی ڕۆژگار مامۆستایان و نەوەکانی دواڕۆژ بە چاوی ڕێز سەیریان دەکەن. منداڵانی کورد بە تام و کام دەم پڕدەکەن لە وشە شیرینەکانی هەڵبەست و چیرۆکەکانی مامۆستایان. بەرهەمەکانی دەکەنەبەر قەڵەمی لێکۆڵەرەوەو زانایان و ڕەخنەگرانی ئەدەبی کوردی بەگشتی و ئەدەبی منداڵان بەتایبەتی.

ئەدەبی منداڵانیش نرخ و پایەیەکی ئێجگار بەرزی هەیە و گۆڕەپانێکە هەموو کەس حەزدەکاو لای وایە ئاسانە ئەسپی خۆی لێتاوبدا، بەڵام لە ڕاستیدا شارەزا و کارامەو پەرەوەردەکار و بەهرەدارێکی هاو وێنەی فەرمیدون نەبێ کەس نابێ بەسوارچاکی ئەم مەیدانە.

مامۆستا هەروەکو لە پێشەکیی نامیلکەی(پیرێکی ڕیش درێژبوو)دا نووسیویەتی:"ئەوەی ڕاستی بێت بەرهەمێکی زۆرم بۆ منداڵان نووسیوە بەڵام هەر جارە ئەمەندەی بۆ ڕۆژگاری ئەمڕۆ بشێت بەسە" بەڵێ زۆری نووسیوەو دەمێکە خەریکی نووسینە، خۆتەرخان کردنیشی بۆ ئەدەبی منداڵان بەڕای من دەگەڕێتەوە سەرئەوەی کە خۆی نووسەر و خاوەن بەهرەی داڕشتن و هۆندنەوەی هەڵبەستبوو، لەلایەکی تریشەوە مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی بوو. لە نزیکەوە شارەزای جیهانی منداڵان بوو سەرەڕای خوێندنەوەو موتاڵاکردن و خوێندنی لە بەشی پەروەردە و دەروونناسی زانکۆدا کاری دایەرەی لە بەڕێوەبەرێتی خوێندنی کوردی و پشکنەر و سەرپەرشتی پەروەردەیی قوتابخانەکان بوو، ئەمانەش بەندیوارییان تەواو بەکتێب و پڕۆگرامی خوێندنی منداڵانەوە هەبوو بۆیە کۆبوونەوەی هەموو ئەو بنەمایانە بێگومان ڕێك هەستانی بینای ئەدەبی منداڵان ئاساندەکەن و دەبنە بەڵگە بۆ شارەزایی نووسەر لەلایەنی کردار و تیۆرییەوە.

ئیتر بەم لێهاتووییەوە کە هاتە کۆڕی نووسینی ئەدەبی منداڵان، ئامانجێکی بەرزی پەروەردەیی و مرۆڤانەشی لەبەرچاو خۆی داناو کردییە بەرنامە. بەرنامەیەك وەك کانی بیرو ناوەڕۆکی ئەدەبەکەی لێ هەڵدەهێنجا. زۆر نووسەر و دامودەزگای ڕۆژنامەگەری و تەلەفزیۆن و سینەما قازانجی بازرگانی دەکەنە ئامانج و بەرهەمێکی زۆری ڕەنگاورەنگی بە بریقوباق و دەنگو هەرا پێشکەش منداڵانی جیهان دەکەن گەلێکیشیان لە سەدا سەد بەخەم ناوەڕۆکی مرۆڤانەی بەرهەمەکانەوە نین. بەڵام مامۆستا فەرمیدوون بە ئامانجێکی بەرچاو ڕوونی مرۆڤ دۆستی و نیشتمانپەروەرییەوە ڕوو دەکاتە منداڵان.. کام منداڵ؟ منداڵانی ناو بەرد و دار و کۆلیت و زنجەکانی لادێ و منداڵانی دەربەدەر و بێبەش لە مافە سروشتیەکانی منداڵانی گەلانی سەربەست.

ئەمەتا لە پێشەکیی نامیلکەی(پیاوە بچکۆلەکە)دا پەنجە ڕادەکێشێ بۆ ئاگانامەی نەتەوە یەکگرتووەکان کە لە٢٠ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٥٩ بۆ پشتگیریی مافی منداڵانی جیهان بڕیاردراوە و بەندوبڕگەکانی باس دەکات و ئاوڕێك لە منداڵانی کورد دەداتەوە و دەڵێ:

"ئێمەی گەورە و لەخەم ڕەخسیو ئەگەر بە باشی لەم بەندانە ووردبینەوە هەر زوو ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە هیچێکی ئەوتۆمان بۆ منداڵانی کورد نەکردووە کە شایانی باس بێت و بگرە قەرزار باریشیانین. دەبارێگای دانەوەی ئەو قەرزەبگرین" دەزانێ بۆکێ دەنووسێ و دەزانێ منداڵانی ئەمرۆبەرەی ئومێدی دوا ڕۆژن و بنچینەی بینای کۆمەڵی کوردەوارین. ئەو بە ئاواتێکی ڕەوای مرۆڤ پەروەرانە دەنووسێ. بەو هیوایە کە لە دواڕۆژ:

"لەسەرمانا هەڵنە لەرزێن و سەری کوڵمەکانیان خوێنی تێنەزێت و سنگ و بەرۆکیان دانەچەکێت و خیزە خیزی نەیەت، با پێخاوس نەبن قاچ و قولیان زامدار نەبێت. با لە چڵکدا گەڕنەبن و لە برساندا زکیان بە پشتیانەوە نەنووسێت و چاویان بە قووڵدا نەچێت، با لە نەزانین و نەخوێندەواریدا کوێرییان دانەیەت و لەوە زیاتر بە قوڕدا نەچنە خوارەوە باژەنگی زۆرداری و ژێردەستی و بێخزمەتی لەسەر لەش و ڕوویان بتەکێنین و ڕەنگو ڕووە ڕاستەقینەکەی خۆیان دەربکەوێت ئەوسا بزانن چۆن وەك گوڵ ئەگەشێتـەوەو چۆن ئەدەنە قەد و باڵاو تواناو داناو خزمەت گوزارئەبن".

بەرهەمەکانی مامۆستا فەرەیدوون شایانی هەڵسەنگاندن و خوێندن و لێکۆڵینەوەن. نامیلکەکانی: کارژۆڵە. پیاوە بچکۆلەکەو پیرێکی ریش درێژبوو. نموونەیەکی جوانی ئەدەبی منداڵانن.

هیوادارم لەمەولا لێکۆڵینەوەیان دەربارە بنووسرێت.

لەدواییدا دڵی خاتوونی میهرەبان، ناهیدەخانی هاوسەری دەدەینەوە کە چۆن لە ژیاندا پەریی بەختو ئەستێرەی رێ نیشاندەری بوو، لە کۆچ کردنیدا گیانی ئەو وەکو فریشتە، بەشاباڵی، سێبەر لەوو لە منداڵانی نەتەوەکەی و لە خەڵکی کوردستان دەکات.

١٩٩١/١٢/٢٦

# وشەییێکی پڕسۆز

جەمال خەزنەدار

خوشکینە، براییینە:

میوانە بەڕێزەکان، هەلگرانی ووشەی پاکی کوردی... بەخێربێن! پێشەکی سوپاسی بەڕێوەبەرانی دەزگای ڕۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی دەکەین، بەگێڕان و ڕێزگرتن لەم کۆڕە پڕ سۆزەی ماتەمینی جوانەمەرگی ئەدەبی کوردی مامۆستا فەرەیدون عەلی ئەمین.

دیسان فەلەك ئەم داخە چ بوو نای بەجگەردا؟. ئەم ئاگرە چیبوو لە دلی عالەمی بەردا؟. من دیومە بەهار گول دێتەدەرێ، غونچە دەپشکوێ، بۆچی گولی من غەرقە لە ژێری گلو بەردا؟.

بەڕێزان:

دیارە ئێمە بۆ ئەوە کوبووینەتەوە کە بیرەومریی یادی چلەی کۆچی دوایی یەکێك بکەین کە خودی ژیانی بۆ خزمەتی پیرۆزی وشەی کوردی بردەسەر... وا بزانم لە سەرانسەری کوردستان کەس نییە فەرەیدونی خزمەتگوزار نەناسێ، کەس نییە فەرەیدونی نووسەر.. فەرەیدونی زمانزان... فەرەیدونی مامۆستا نەناسێ.

کۆچی دوایی مامۆستا فەرەیدون ماتەمی خستە دلی هەموو دلسۆزێکەوەو لەگەل خوالێخۆشبووان گۆران، دلدار، بێکەس، پیرەمێرد، ڕەفیق حیلمی، عەبدولخالق مەعروف و مارف بەرزنجی.. لەگەل سەدەها بلیمەتی ترمان چوونە ڕیزی ئەو رابەرە نەمرانەی کە هەرگیز لەبیرناکرێن.

کاکە فەرەیدون!

بنووە.. دلنیابە.. هەر چەندە هێشتا زوو بوو، کاتی مالئاوایی نەبوو، بەلام لەگەل کاری یەزدان چ دەکرێ و کێ بۆی هەیە وزە لە فەرمانی یەزداندا بکا؟! هەزاران هەزار سالە هەر وابووەو هەروا ملکەچین بەرامبەر بەم فەرمانە یەزدانییە.

کاکە فەرەیدون!

بنووە و دلنیابە.. خۆزگەم سەد خۆزگەم! ئەم کارەساتەمان وازوو تووش نەدەبوو!

کاکە فەرەیدون!

دڵم شکاوە نازانم چۆنت بلاوێنمەوەو بە چ دەست پێبکەم؟ بەو حەسرەتە نهێنیانەی بردتە ژێرخاکەوە؟ یان تەنانەت بەو(ئۆخە)یەی کە دوو سێ ڕۆژپێش هەناسەی دوایی بەرەو ڕووی منت کردەوە هۆی پتر دڵسووتانمە... بەڕاستی کاکە فەرەیدون ئەو ئۆخەیە پڕ مانایەی تۆ منی خستە ناو دوو ئەشکەنجەی جیاوازەوە... یەکەمیان خۆشیی بەدڵو گیانم بەخشی و دووەمیان خستمیە سەر ئەوەی کە زانایێك و مامۆستاییێکی وەك تۆ بگرە ئاگاداری ئەوەش هەیە کە فەرمانی یەزدان دەرچووەو بەکەس ناگەڕێتەوە. هەر چەندە ئێمە بە جیاوازیی تۆوە کە چاومان پێتکەوت لەو بڕوایەدا بووین کە تەندروستیت بەرەو باشی دەڕواو بەم زووانە دێینەوە سەریادکردنی ئەو قسە خۆشانەی پڕ شانازین بۆ ئێمەی ڕۆشنبیرو دەبنە سەرچاوەی مێژووی ئەدەبی کوردی.

کاکە فەرەیدون، بنووەو دڵنیابە!

بەو(کۆخەیە) پڕ مانایەی لەکاتی یەکتر ماچکردندا دات بەڕووماو هێنامتەوە سەر دۆخی جارانی خۆمان و فرمێسك لەچاومدا قەتیسماو خۆی پێنەگیرا، وەك باران دایڕشت و... بەڵام پاش چی؟!

کاکە فەرەیدون، بنووە و دڵنیابە!

بیر لە چ مەکەرەوە. دۆست و برادەرانت لەسەر پەیمانن... هەر چەندە شوێن و جێگات دیارەو بەکەس پڕنابێتەوە بەتایبەتی لە بواری ئەدەب و زمان و پەروەردەی منداڵدا.. کارەکانت جێگای شانازی و سەربڵندیی هەمووانە. هەتا هەتا یە هەر وێردی سەر زمانی نەوەی ئێستاو دواڕۆژمانە.

کاکە فەرەیدون بنووەو دڵنیابە ئەو دوو نەمامەی کە هێشتا نەگەیشتوونەتە هیواو ئامانج بەدەست ڕەزەوان و کەسانێکن جێگای شانازیی هەمووانن و هەر بەو ڕێگایە پیرۆزەدا دەیانبەن کە بۆیانت دەست نیشان کردبوو.

جارێکی دی سوپاس بۆ هەموو ئەوانەی بەشدارییان لەم کۆڕەپڕ سۆزەی جوانەمەرگی ئەدەبی کوردی، مامۆستا فەرەیدون عەلی ئەمین کرد، چ بە ئامادەبوون و چ بەوتار خوێندنەوە.. سەر بەرزی بۆ حەق پەرستان و بۆ وشەی پاکی کوردی و .. خواتان لەگەڵ.

# یادی مامۆستا فەرەیدون

**نوری عەلی ئەمین**

بەڕێزینە:

لەم ڕۆژانەدا مامۆستاییێکی بەوەفا بۆ گەلەکەی و دڵسۆز بە وشەی کوردی و گیان لەسەر دەست بۆ خزمەتی کوردەواری.. دۆست بە چیرۆك و هۆنراوەی بەپێزی پڕ لە سوود بۆ منداڵانی کورد، شۆڕە سوارێکی پەروەردەو جوامێرێکی حەق پەرست، کۆچی دواییکرد و بۆ هەتا هەتایە. بەجێی هێشتین، بەڵام گیانی پاکی.. کردەوە جوانەکانی.. بەرهەمە ڕەنگینەکانی.. وتە بەنرخەکانی.. نامرن و هەر لەناو دڵو دەروونمان دان. بۆیە بە شانازییەوە چەپکێ گوڵی ڕەنگاوڕەنگ پێشکەش بەو خێزانەدەکەین، کە ڕۆڵەی نەبەزی وەهای بۆ گەلەکەی خستۆتەوە.

مامۆستا فەرەیدون.. لەبنەماڵەییێکی دیار و هێژای شاری سلێمانییە، چەند ساڵێکی تەمەنی لاویمان پێکەوە لەو شارەدا بەسەربرد، هەردووکمان مامۆستای قوتابخانە بووین. مامۆستا ئەدیبێکی هونەرمەندو مۆمێکی داگیرساوی سەرەڕێی پەروەردە و خوێندن بوو.. پیاوێکی ڕەوشت بەرزو نیشتمان پەروەربوو، بە کردەوەی جوان و ناسکبێژی لە گفتوگۆدا ناوی دەرکردبوو.

لە یادمە هەموو جارێ کە دادەنیشتین دەیگوت:"گەلەکەمان هەر بە خوێندن لە دەست کوێرەوەری و نەبوونی و نەخوێندەواری و براکوژی رزگاری دەبێت و ڕێی ڕاست و سەرکەوتن بەدیدەکات و، تامی بەختیاری و سەرفرازی دەچێژێت" بۆیە هەمیشە دەیگوت:

ئاخ! خوێندەواری داخ خوێندەواری!

بۆ کورد دەبێتە مایەی بەختیاری.

مامۆستا فەرەیدوون هەمیشە بەتەنگ پەروەردەکردن و نەهێشتنی نەخوێندەوارییەوە بوو لەناو کوردەواریدا، ئاواتەخوازی ئەوەبوو منداڵانی کوردیش لە سایەی پەروەردە و خوێندن و زانستدا وەك منداڵانی جیهان گەشاوە و سەرفرازبن.. بۆیە لە هەموو هەلو دەرفەتێکدا تێدەکۆشا بە چیرۆکی جوان، هۆنراوەی پڕ لە پەندو ئامۆژگاری دڵی منداڵانی کورد خۆش بکات، بۆ ئەم مەبەستە چەندین هۆنراوەی بەنرخ و وتاری بەسوود و چیرۆکی منداڵانی وەك سامانێك بۆ گەلەکەی بەجێهێشتووە.

بەرێزینە:

مامۆستا فەرەیدوون وەك من بیناسم و چەند ساڵێ لە تەکیا ژیابم پیاوێکی حەق پەرستبوو، هەمیشە لەڕووی ناحەقدا هەڵدەچوو. بۆ کاری ناڕەوا هەرگیز سەری دانەنەواندووە.. لە هەمانکاتدا پیاوێکی هێمن و ڕاستگۆبووە، سەری بۆ کاری ڕەواو حەق و واتەی بەجێ دانەواندووە.

لە کۆتاییدا دەڵێم:

کاکە فەرەیدون! لێم ببوورە نەگەیشتمە سەر تەرمەکەت و تێر تێر فرمێسکی برایەتیت بەسەردا هەڵڕێژم و بەرێت بکەم، چونکە هەرگیز بە یادما نەدەهات کە شاڵاوی مەرگ وازوو دەتگاتێ بە پەلە بەجێمان دەهێڵی.. هەر چەند دوو سێ ڕۆژپێش ئەوەی دەستی مەرگ بتگاتێ لەماڵەوە سەرم لێدایت و پێکەوە ماوەیەك دانیشتین دوای هەندێ وتووێژ فەرموت:"کاکە نووری لێم نزیك بکەوەرەوە" کە لێت نزیك کەوتمەوە فەرمووت بەم زووانە بەجێتان دەهێڵم.

وتم: شتی وەها مەڵێ! لە سایەی خواوە ڕوو لە چاکیت. فەرمووت: خۆم دەزانم کارم کراوە.. بەم زووانە بەجێتان دەهێڵم!. کاکە خۆت من دەناسیت لە مەرگ ناترسم، بەڵام داخم هەر ئەوەیە نەخۆشی نەیهێشت لە تەك کاروانی سەرفرازیدا بژیم.

ئیتر خۆشیتان.

# فەرەیدون بەرەو نەمری کۆچی کرد

محەمەد بەدری

- وا ئەستێرەیەکی تری گەشاوەو پرشنگدار ئاسمانی ئەدەب و ڕۆشنبیری کوردیی بەجێهێشت و بەرە و بەهەشتە خۆش و فراوانەکەی نەمری کۆچیکرد.

ئەزانن کە نووسەرێکی لێهاتوو و خاوەن خامە لە جیهانی نووسین و داهێنان دوور ئەکەوێتەوەو ئەڕوا چ کارەسات و واوەیلایەك دروست ئەبێ؟

خامە تووشی مانگرتن ئەبێ. داهێنان ئەکەوێتە گێژاوی بێزاری و نامۆیی و ئاوارەیی. لاپەڕەکان هەروا بەکپی و خامۆشی ئەمێننەوە و ئەکەونە ناڵەناڵ و دونیا لەبەر چاویاندا گیرۆدەی خێوەتە ڕەشەکەی پەژارەیی ئەبێ.

- هۆ دونیای بێوەفا، هۆ جیهانی مەرگ و فەوتان و لەناوچوون! دوێنێ دیلان و کامەران و کاکەی فەلاح و کامیل بەسیر و ئەمڕۆش فەرەیدون و بەیانیش من و تۆ و ئەو. بەڵام نەء ! چونکە مرۆڤی خاوەن خامەو ووشەی پاکو بەسوود و ڕەسەن هەرگیزا و هەرگیز نامرێ، بەڵێ نامرێ، بەڵکو ئەیداتە شەقەی باڵو بەرەو فراوانییەکەی نەمری ئەفڕێ، ئەگەر واشنەبێ بۆچی تا ڕۆژی ئەمڕۆمان لەگەڵ کەڵە نووسەر و داهێنەرەکاندا ئەژین؟! کەس هەیە لەگەڵ بابە تاهیری عوریان و ئەحمەدی خانی و حاجی قادری کۆیی و نالیو وەفایی و گۆران و هەژار و هێمندا ئاشنایی نەبێ؟ بۆچی هەر ئێوەی کە ئا لێرەدا نە کەستان هەیە بڕوای بەوەبێ کە ئەوانە نەماون؟!

ئەوانە- ڕاستە- وەکو جەستە خواحافیزییان لەم دونیایە کورتە کردووە، بەڵام وەک ڕۆح، وەکو ناو، وەکو یاداشت، وەکو بەرهەم، وەکو کردەوە، وەکو جۆگەو ڕووبار و دەریا، وەکو کێوو بەفر و گوڵاڵە، وەکو هۆنراوەیەکی ڕەسەن و بێگەرد وەکو گەرمایی ڕۆژ، وەکو تەزووی بەفرەکەی کوێستان هەر ماون.. چونکە هەر ئەوانەن کە بەردەوامی بە کۆشش و بەختیاریی میللەتەکەیان ئەبەخشن.

- هەواڵ دایە شەقەی باڵ و بەرەو سەیوان، پێش تەرمەکەی کاکە فەرەیدون ڕۆیی، نەمران لەوێ وەئاگاهاتنەوە، کۆڕ و زەماوەند سازکرا، ونیاری بەخێرهاتنیان ئامادەکرد،

داره سەوزەکانیش بوونە مەشخەڵ و بووە چراخان، دونیای سەیوان کە پیاوە نەمر و داهێنەرو بلیمەتەکانی گرتووەتە خۆی بەگشتی رازایەوە.

**هۆ شێخی نەمر... خاوەنی بەردە قارەمان!**

**هۆ پیرەمێردەکەی مامەیارە هەڵگری مەشخەڵەکەی نەورۆز.**

**هۆ کامەرانی بلیمەت، داواکەری کاروانەکەی کە بەرە و رێگا نەتویست هەنگاو بنێ.**

**هۆ(گۆران)ی نوێخواز و بلیمەت!.**

**هۆ داهێنەران، بلیمەتان، نەمرەکانی دانیشتووی سەیوان.**

**ئەوەتا فەرەیدون، ئێمەی بەجێهێشت و بەرە و لای ئێوە کەوتەرێ.**

**ئەوەتا فەرەیدون دونیای ئێمەی رەفزکرد، بوونی ئێمەی**

**رەفزکرد، ژیانی ئێمەی بەدڵ نەبوو، بۆیە بەرە و لای**

**ئێوە، بەرە و دونیای نەمری کۆچیکرد.**

**منیش ئەڵێم: کاکە فەرەیدون! سلاو بۆ تۆ. سلاو**

**بۆ هەموو ئەوانەی لە جیهانی نەمریدا لە گەڵتا ئەژین.**

# ڕیشۆڵەی گیانێ فڕی بۆ بەهەشت

**وتاری مامۆستا عەبدالرحمان مفتی شێرۆ**

بەناوی خوای گەورە و میهرەبان

(كل نفس ذائقة الموت) صدق الله العظيم

خوشك و برای ئازیزان

زاناو دانا و شاعیران

ئەدیب و ڕۆشنبیران

سلاوتان لێ بێ:

لە زۆر كۆنەوە بۆ ئەوەی بزانرێ مێژووی كۆچی زاناو بلیمەتان و ئەدیب و شاعیران‌و ڕۆشنبیرانی زەمانە یەك لەدوای یەك، بە پێویستێكی گرنگیان زانیوە كە هۆیەكی بۆ بدۆزنەوە هەر لەبیر نەچی، هاتوون ژمارەی ئەبجەدییان كردووە بە بنەما بۆ ئەو كارە گرنگە بەتایبەتی لە زمانی عارەبی و فارسی و كوردیدا. منیش هەر لە كۆنەوە كردوومە بە خوو بە گوێرەی توانا بۆ كۆچی گەورە پیاوانی خۆمان بە هەموو جۆرێكیان كە خەباتیان هەبووە و هەیە بۆ گەل و نیشتمان. بە گوێرەی توانا و ڕۆژ و زەمان، بە وشەی جوان جوان، یان هۆنراوە بۆ لێدوان.. شتێكم بۆ وتوون كە لە یاددا هەر بمێنێ و لەبیرنەچن. وا لێرانەشدا بە دوو مێژووی كۆچی و زایینی بە ژمارەی ئەبجەد كۆچی دوایی مامۆستای نەمرم دیاریكردووە یەكێكیان وا ئێستا لێرانە وەكو پێشەكیەك بۆ وتارەكە(تاكە هۆنراوەیەكە) نرخی پیتە خاڵدارەكانی بە ژمارەی ئەبجەد ساڵی كۆچیەتی وەكوو:

ڕیشۆڵەی گیانی فەرەیدون عەلی =٥٤٠

فڕی بۆ بەهەشت جوان چوو بە سەهلی =٨٧٢

هەمووی =١٤١٢ كۆچی

هەر دووبارە(دوا ڕستی وتارەکەش) نرخی پیتەکانی بە ژمارەی ئەبجەد ئەکاتە ساڵی مردنی بە(زایین) واتا ١٩٩١.

ئیتر نازانم بە چ جۆرێ ئەوەی کە لە دڵمایە بیخەمە ڕوو دەریببڕم، وا گلۆڵە و لوولی خواردووە لە ناخ و دەروونم بەهۆی کۆچی ناوەختی ئەدیب و شاعیری ناوداری کورد مامۆستا فەرەیدون عەلی ئەمینەوە، کە کەلێنێکی زۆر گەورەی خستە ناو کۆشکی ئەدەبەوە، گڕی بەردایە دەروونی هەموو خوشك و برای خوێنەران و ڕۆشنبیرانەوە. خوێنی دڵی هەموانی هێنایە جۆش و هەڵچوو پژایە سەر ڕوو، لە جیاتی فرمێسکی سوێر هاژەی کرد دەموچاو و سینەی هەموو سووربوو.

لە داخاندا بە هاوار دەستمان کرد بە ڕۆڕۆ. خۆشم بە دەنگێکی بەرز بە ئاهونالەی گەرمەوە براڕۆشم ئەکرد، چونکە یادی ساڵەهای ساڵ و ساڵانی حەفتاکانم ئەهاتەوە بیر کە(یەکیەتیی نووسەرانی کورد) مان پێکهێنا- لقی بەغدا- لەگەڵ برادەرانی تریشدا هەر بەیەکەوەبووین کارمان هەر وتار و نووسینبوو.

حەفتەی دووجار کۆڕمان ئەگێڕا و هۆنراوە و وتاری جوان جوانمان ئەخستە ڕوو. هەتا تۆماربێ بۆ دواڕۆژ و بۆ مێژوو.

ئەگەر بێم هەوڵ و خەباتی مامۆستای نەمر ژمارەکەم وەختێکی زۆری ئەوێ، لە کۆڕێکی واکەم کاتیدا ناکرێ و ناووترێ.

هەر ئەوەندە ئەڵێم گیانی پاکی بە بەهەشت شادبێ جارێ.

گومانیشی تێدا نییە خوێنەران و ڕۆشنبیران، لە خوشك و برایان. لە یادیان ناچێت هەتا دێرزەمان.

ڕێڕەوی نەمر ئەگرن بە هەست و بەگیان.

تۆماری ئەکەن لەسەر پەڕەی سینە بە خامەی تیژیان.

چونکە نیشانەیەکی جوان و گەش و گرنگبوو بۆ گەل و نیشتمان. وا بەو هۆیەشەوە ڕستی دوای چوارینەکەی خوارەوەم کردبە مێژووی کۆچی بە ژمارەی ئەبجەد پیتەکانی کۆبکرێتەوە وەکوو نووسراوە ساڵی کۆچی دواییەتی بە زاینی(١٩٩١) هەروەکوو لە پێشەوە وتمان.

ئیتر داوای لێبووردن ئەکەم، هەر ئەوەندەم لە توانادایە ئێستا لەبەر کەمکاتی.

فەرەیدون عەلی هاوڕێی کۆچکردوو

بە گیان زیندوویی گەر بەلەش مردوو

(شێرۆ) بۆی نووسیت مێژووی کۆچەکەت

بەم ڕستەی وادێ ئەیلێم ڕوو بە ڕوو:-

"ئەستێرە گەشەی ڕەنگین و جوانەی فەرەیدون عەلی زوو بوو ئاوا بووی"

٦٨١ + ٣٤٠ + ٣٤٨ + ٧٥ + ٣٦٦

+ ١١٥ + ٣٢ + ٣٣ = ١٩٩١ زایینی

# مامۆستا فەرەیدون لە ناكاو ڕۆیشت

**ئەحمەد زرنگ**

لە هەموو كاتێكدا، لە هەموو وولات و شوێنێكدا كۆبوونەوە پێكدێنرێت و ئاهەنگ ڕێك ئەخرێت بۆ یادكردنەوەو ڕێزلێنانی پیاو ماقوولان و تێكۆشەران و ئەوانەی كە لە ئاستی خۆیانەوە ڕێگای خزمەتیان گرتووە لە ژیانیاندا. ئیتر ئەو خزمەتە لەبارەی زانستیـیەوە بێت یان نیشتمانی یان پەروەردە و كۆمەلایەتی و نووسین و شیعرو هونەرەوە بێت.

هەر خزمەتێك بێت كە سوودی بۆ گەل هەبێت و پلەی ئەو گەلە بەرە و پێشەوەبەرێت لەو بوارەدا. ئەمڕۆش ئێمە كۆبووینەتەوە بۆ یادكردنەوە و ڕێزلێنانی یەكێك لەوانەی كە لە بواری خۆیدا هەتا دوا ڕۆژی خزمەتێكی ئەوتۆی كردووە لەبارەی نووسین و ئەدەب و بەتایبەتی لە ڕێگای پەروەردە و زانستەوە. هەموو كۆبووینەتەوە لە چلەی مامۆستا فەرەیدوندا كە یەكێك بوو لە(مسەقەفە)كانی گەلەكەمان بە پاكی و خاوێنی و ڕەوشتی بەرزەوە ئەو پێویستییانەی كە لەسەر شانی بوو یان ئەخرایە سەر شانی جێبەجێی ئەكرد. لە بارەی پەروەردە و زانستەوە چ بە نووسین و چ بە هەولدان و بێ كۆلدان هەتا نەخۆشی كتوپڕ هێرشی هێنایە سەری و دوا هەناسەیدا هەر لە جوولانەوە و هەولّ و تێكۆشاندا بووە لەوبارەوە بەشێوەیەكی هێمن، بەبێ ئەوەی بەتەمای هیچ بێت لە ژیانیدا.. وەئاساری ئەو نووسین و كردەوانەی دیارە چ بۆ قوتابیان و مندالان، چ بۆ نووسین و نووسەران.

بەلام بێ ئەوەی كاتی كۆچكردنی دوایی هاتبێ، لەپڕ هێرشی نەخۆشی كتوپڕی ڕێگای بە كاكە فەرەیدون(كەهێشتا توانای تیا مابوو بۆ خزمەت) گرتوە دەستەكانی لە ئیش خست و زمانی لە قسەكردن كەوت، وەچاوی لێكنا تائەبەد. بەلام هەر وەكو وتمان كاكە فەرەیدون هەروەك هەموو خزمەتگوزارێك ناوی لەسەردەمی هەموو دلسۆزێكە، خزمەت و هەولّ و تێكۆشانی هەر لەبیرە. هەر چییەكی كردبێت لە

خزمەتکردن لە باری نووسیندا و لەپێشخستنی پەروەردە و زانستدا هەرگیز دیارە و دیارنەبێت و بیرناچێتەوە.

سوپاسێکی زۆر بۆ دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی کە ئەم کۆبوونەوەی پێکهێنا بۆ چلەی مامۆستا فەرەیدون. ئەم ئیشەو پێکهێنانی ئەم چەشنە کۆبوونەوانەش ئیشێکی باڵاو بەرزە و هەستکردنە بە مەسئولیەت وەخزمەتکردنە لە ڕێگای خزمەتکردنی هەموو دڵسۆزێکی گەلدا. منیش بەناوی یانەی(سەلاحەدین)ەوە کە مامۆستا فەرەیدون یەکێکبوو لە ئەندامانی، زۆرم پێخۆشبوو کە بەشداری بکەین لەم کۆبوونەوەیەدا و بەهەر چۆنێك بێت هەستی خۆم و دەستەی بەڕێوەبەرانی یانەو هەموو ئەندامان دەربڕم بەرامبەر بەیادکردنەوەی چلەی کاکە فەرەیدون و خستنەڕووی هەندێ لە خزمەتەکانی.

ئەو کاتانەی کە ئەهات بۆ یانە لەگەڵ برادەرانیایان میوانەکانیدا دانیشتنەکەیان ئەبوو بە کۆڕی باسکردنی ئەدەب و وتنی شیعر و لێکۆڵینەوەی باری ئەدەبیات و ئەدیبان و لە زۆربەی ئەو دانیشتنانەدا بەشدارئەبووم. بە کورتی مامۆستا فەرەیدون کاتی دانیشتنیشی و ئیسراحەتکردنیشی هەر ئەهاتەوە سەرباسی زانیاری و ئەدەب و چۆنیەتیی برەوپێدانی.

هیوامان وایە کە هەرگیز دڵسۆزانی میللەت و گەلەکەمان لەبیر نەچێت و یادیان بکەینەوە و ڕۆڵەکانیان لەسەر ڕێڕەوی ئەوان بڕۆن. و خۆشیتان.

# وتەی ئیستگەی ڕادیۆی کوردیی بەغدا

نازم کەریم

لەم ڕۆژەدا کە دەزگای گشتیی بڵاوکردنەوەی کوردی ئەرکی گێڕانی ئەم کۆڕە ماتەمینە بەبۆنەی چلەی کۆچی دوایی مامۆستا فەرەیدون بەڕێوەدەبات ئێزگەی کوردی بەغدا بەدڵێکی پڕ لە تاسەو غەمەوە بەشداریی غەم و پەژارەی خێزان و بنەماڵەو دۆست و هاوڕێیەکانی دەکات، هەزار هەزار درووود لە گیانی پاکی بێ‌و پشت بە یەزدان جێگای بەهەشتە.

ئێستگەی کوردی بەغدا لە هەموو بۆنەو یادکردنەوەیەکدا هەمیشە یادی ئەو کەڵە پیاوانەی کردۆتەوە کە هەردەم دەنگیان وەکو بڵێسەی ئاگر بووە بۆ ڕۆشن کردنەوەی ڕێگای ئاوات، هەر بۆ ئەم مەبەستەش لە کۆنەوە تا ئێستا شاکارەکانی ئەم نەمرانە لە گوێی گوێگراندا دەزرنگێنەوە.

مامۆستا فەرەیدون بەڕاستی مامۆستا بوو، قوتابخانە بوو، شاعیربوو، لە کۆڕەکانی خوێندن و فێرگەکاندا پێی دەوتین: ڕۆڵەکانم بخوێنن، هەر بە خوێندن و شارەزایی پەیداکردن ڕێگای دووری ئاوات نزیك دەکەنەوە.. بۆیە هەمیشە خۆی چرا هەڵگری مەشخەڵی ڕووناکی بوو، دەبا هەمووومان لەم ڕۆژەدا، ڕۆژی چلەی خوالێخۆشبوودا یادی ئەو گیانە دڵسۆزەی بکەینەوە کە هەموو ڕۆژانی ژیانی لەپێناوی چرای ئازادی‌و ڕووناکی‌دا بۆ کۆمەڵ هەڵدەکرد.

هەزارەها سڵاو لە گیانی پاکی مامۆستا فەرەیدوون‌و پشت بەخوای مەزن جێگای بەهەشتە.

# وتاری کۆتایی

بەناوی کەسوکاری کۆچکردووەوە

مامۆستا د. موکەڕەم تاڵەبانی

خوشك و برایانی بەڕێز،

لە سەرەتای ژیانم دا، لە لادێیەکی دێمەکاڵی گەرمیانی کوردستان دەژیام. کاروباری کشتوکاڵی ئەو سەردەمە زۆر قورس بوو. لەقرچەی گەرمای چلەی هاویندا —وەرزێر- هەر لە دەرچوونی گزنگی ڕۆژەوە تا ڕۆژئاوا پشتی دادەچەماندەوە، بە دەست و بەداس دەشتێکی فراوانی بێ پایانی گەنمو جۆی درەودەکرد. هەموو ڕۆژێك پاش ماندوبوون و عەرەق ڕشتنێکی زۆر ئاوڕێکی لە بەرهەمی ئەو ڕۆژەی دەدایەوە سەیرێکی ئەو ئەرکە قورسەی، کە هێشتا ماوەتەوە، دەکرد، ئاواتی ئەوەی دەخواست کە خوا هێزو تەمەنی بداتێ بۆ جێبەجێ کردنی هەموو ئەرکی ئەو ساڵەی.

هەندێك ئەرکیان دەبردە سەرو هەندێکیش پشتی لە ژێرباری قورسی ژیاندا دەچەمایەوەو ئەو ئەرکەی بۆ کوڕو براو هاوڕێی بەجێدەهێشت.

ئەمە ئەوەمان تێ دەگەیەنێت کە تەمەنی ژیانی ڕۆشنبیرێك بە زۆریو کەمیی ساڵانی ژیانی نییە، بەڵکو بەو بەرهەمە ڕۆشنبیرییەیە کە لە ساڵانی کورت یان درێژی ژیانی بەجێیهێناوەو خستوونیەتە بەردەستی هاووڵاتیانیەوە.

مردن دوا پلەی ژیانە. هەمووومان هەنگاو هەنگاو بۆی دەچین. ئەو ترسەمان لە مردن بۆ ئەوە نییە کە ساڵانی تەمەن کۆتایی دێت. گەلێك هەن، هەر لە سەرەتای ژیانیانەوە بە مردوو دەژمێردرێن، کەچی لەپێش ئەوەی بە خاکی بسپێرن ساڵەها دەمێنن، بەڵام بۆ کێو بۆچی؟! زۆریش هەن ژیانیان لە پاش مردنیش هەر بەردەوامەو بەرهەم و کردەوەکانی بۆ سوودێکی فراوان بەکاردێت. ئەم جۆرەکە ئەگەر ترسی لە مردن هەبێت بۆ ئەوەیە کە هێشتا پرۆگرامی خزمەتگوزاری و بەرهەمی ڕۆشنبیریی

خۆی بۆ پێش خستنی وڵات و میللەتەکەی نەبردووەتە سەر، بۆیە دەڵێن فلان هێشتا کاتی مردنی نەبوو!

کاک فەرەیدونی نەمر، یەکێك بوو لەو لاوانەی کە ساڵەهای تەمەنی بۆ پەروەردەکردنی ڕۆڵەکانی کوردستان تەرخانکردو لەگەڵ لاوە خۆبەخت کەرەکانی کورد بە ساڵەها گەرماو سەرماو برسێتی کێشاو زۆربەی ژیانی بۆ ئەو ئەرکە قورسانە بەخت کرد. بۆیە وەکو ئەو وەرزێرەی کە لە سەرەتاوە باسم کرد، زوو بە زوو پشتی لەژێر باری قورسی ژیاندا چەمایەوەو ئێمەش داخی ئەوەی بۆ دەخۆین کە هێشتا بە تەواوەتی ئەرکی سەر شانی کۆتایی پێنەهێنراو پاشماوەی بۆ ڕۆڵەکان و دۆست و هاوڕێیەکانی بەجێهێشت.

ئەم کۆبوونەوەی ئەم هەموو ڕۆشنبیرە بەڕێزانەی ئێوە ئەوە دەگەیەنێت کە ڕۆشنبیرانی کورد بە هەمەچەشنە بیروباوەڕیانەوە لە کاتێکدا کە بیرەوەریی کۆچی دوایی هاوڕێیەکی خەباتکەری وەکو خوالێخۆش بوو کاک فەرەیدون عەلی ئەمین تازە ئەکەنەوە، لەو نیازەدان کە ئەو ئەرکە بەجێماوەی دەبەنەسەر، بەمەیش داخی دەروونی کەسوکاری و هاوڕێ و هاوولاتی بۆ تەمەنکورتی زووتر سارێژبێت و ئاواتی ژیانی جێبەجێ دەکەن و ئاڵای زانستی و پەروەردەیی و ڕۆشنبیری دەستاودەست بەرەو ژیانێکی ڕوونتر و فراوانتر بەرن. ئەمەیش ئەرکی سەر شانی لاوە ڕۆشنبیرەکانە. ئێمەش کە لە تەمەنی پایزی ژیاندا دەژین، بەو بەرهەمانەی ئێوە دڵمان ڕوون دەبێتەوەو پاشماوەی ژیانمان وەکو ئێوارەی ڕۆژێکی خۆشی بەهار دێتە پێش چاو.

کاک فەرەیدون دوو ڕۆڵەی بە یادگاری بۆ بەجێهێشتین، ئێمەیش دڵنیای ئەکەین وەکو نەمامێکی نوێ بە عەرەقی تەوێڵمان ئاویان دەدەین تا دەبنە درەختێکی گەورە و بەرداری ئەم میللەتە. بەمە ئەرکێکی بچووکی سەر شانمان دێنینەجێ و لە بەرهەمە ڕۆشنبیرێکانی ئەویشدا بیرەوەریی سالانی خەباتی شۆڕشگێڕانەی نوێدەکەینەوەو هەمیشە لە دڵماندا و لە ویژدانماندا هەر بە زیندوو دەمێنێتەوە.

بە ناوی خێزان و کوڕەکانییەوە سوپاسی هەموو بەڕێزتان دەکەم و خوا لە ئێمەتان نەسەنێ.

# ئەو بابەتانەی دوای کۆچ و چلەی
# مامۆستا فەرەیدوون
# لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا بڵاوکرانەوە

# کۆچی دوایی مامۆستای ئەدیب و ڕابەری پەروەردە فەرەیدون عەلی ئەمین

ڕۆژی ١٩٩١/١١/٢٥ بەدەم ئازار و ژانی نەخۆشییەوە، مامۆستاو ئەدیب و ڕابەری پەروەردەی ناسراومان فەرەیدون عەلی ئەمین دڵی لە لێدان وەستاو ماڵ ئاوایی لێکردین..

مامۆستا فەرەیدون ڕۆشنبیرێکی کوردی بەتواناو شارەزایەکی هۆشیاری پەروەردە و فێرکردن بوو، سەرەڕای ئەوەی لەمەیدانی داهێنانی ئەدەبی: شیعر و چیرۆك جێ دەستی لەڕەوتی ئەدەبی گەلەکەماندا دیارە بە کۆچی دوایی، بنەماڵەی پەروەردە و فێرکردن و بزوتنەوەی ڕۆشنبیریمان سوارچاکێکی بەتوانای لە دەست چوو.

بە ناوی دەستەی نووسەرانی ڕۆژنامەی(هاوکاری)یەوە دڵنەوای دڵسۆزانەمان بۆ بنەماڵەی خوالێخۆشبوو خوا سەبووریان بدات و جێی کۆچکردوش بەهەشت بێ‌و یادو بەرهەمەکانی و ڕێزی لامان نەمرو بەهادار دەمێنێتەوە.

ڕۆژنامەی هاوکاری ١٩٩١/١١/٢٧

# لەکۆچی پڕ لەناسۆری مامۆستا فەرەیدون عەلی ئەمیندا

# مژدەی دوای ماتەم

**حلمی عەلی شەریف**

چاوی پڕ لەفرمێسك، دڵی پڕ لەزوخاو، دەروونی پڕ لە ئاگر... بەدەست لە خێڵ بەجێمان و لە کاروان دواکەوتنەوە.

مافی ڕەوا پلیشاوەو خاکی پیرۆز شێلراوو، لاوی دڵسۆز لەژیان نائومێدکراو.. لەناو گەلێکدا کە بەهۆش و بیرو زرنگی و چالاکی و ڕەسەنی.. شایستەی ڕیزەکانی پێشەوەی ناو گەلان بێ.. کەچی هەرچەندە دوا ڕۆژی ڕووناکی لێوە دیار و دەرکەوتوو بوو... بەڵام نەهامەتی.. ئاسۆی لێ زەرد کردبوو.

هەڤاڵ کەمی گەلەکەی داخی نابوو بەپەڕەی جگەرەییەوە.. بۆیە کڵپەی دەروون و هەناسەی ساردو ماتەمی بووبوون بەخێوت بەسەریەوە.

نەهەست و نەگیان و نەقەوارەی بەژنو باڵاو نەچوارچێوەی بەخەیاڵ نەخشە کێشراوی دەروونی، بەرگەی ئەم کارەساتە جگەر دارزێنەیان گرت.

بۆیە لەناکاو، بێ ئەوەی لەبەری شادی و سەرفرازی دوا ڕۆژێکی نزیکی گەلەکەی بخوات و چاوی بەئاسۆی لەزەردایی رزگاربوو ڕوون بکاتەوەو خەمو مەینەتی دەیان ساڵی رابوردوو لەخۆی داماڵێو دڵ بە ئەنجامی شیعرو پەخشان و چیرۆك و نووسینە بایەخدارەکانی خۆی خۆشکات.

داخی گران، هەزارجار داخی گران مامۆستا فەرەیدون عەلی ئەمین لە بەیانی ڕۆژی ١٩٩١/١١/٢٥ لە بەغدا بەنەخۆشی ئیفلیجی، هەروەکو دەستی ڕەشی شەوە ماوەیەکی زۆرە ئاواتی دەروونی ئیفلیج کردووە. سەری نایەوەو هەر لەئێوارەی ئەم ڕۆژەدا تەرمەکەی لەسەر خواستی خۆی بەرەو شارە دڵێرە تێکۆشەرەکەی سلەیمانی کەوتەڕێ.

تا لەگردی سەیوان دەست بکاتە ملی هەزاران هاوخەباتی هەمە بیرو باوەڕ و کردەوەی خاوێن و جوانەمەرگ کراو...

هەزاران سڵاوی پاکی بەدەم شەماڵی لە بەهەشتەوە هاتوو لە گیانی پاکی هەموویان.

سەر هەڵبڕن، چاو بکەنەوەو لە جێگای خۆتانا ڕاست ببنەوە.. مژدەی بەدی هێنانی ئاوات و ئامانجەکانتان بەدەم پەپولە نەخشینەکانی کوردستانەوە بەپیرتانەوە دێ..

ڕۆژنامەی پاشکۆی عێراق ڕۆژی ١٩٩١/١٢/٦

ڕۆژنامەی هاوکاری ڕۆژی ١٩٩١/١١/٢٧

# مامۆستا فەرەیدون و... یادێك

**سەلاح حامد ئەسعەد**

هەموو بیرو هۆشم لای ئەو گیرو گرفتانە بوو کە ڕۆژانە دووچاری دەبین و پێوەی دەناڵێنین، بیرم لە زیانەکانی دەکردەوە، ئاخۆ چیمان بە سەردا دێنێ، کەچی لە ناکاو کەوتە بەرگوێم مامۆستا فەرەیدوون.. بەڵێ ڕاپچڵەکانم، هەناسەم سواربوو، هێزم لەبەربڕا، جەستەم شلبوو، بەرچاوم تاریك بوو، وەك شریتی تۆمارکەر بیرم گەڕانمیەوە بۆ پۆلی پێنجەمی قوتابخانەی ئەیوبیەی ساڵی ١٩٥٤ بەیانی بوو مامۆستایەکی بەژن قەشەنگ و ڕووخۆش خۆی کرد بە پۆلەکەماندا دوای ڕۆژباش خۆی ناساند پێمان، کەوتە قسەی خۆش و بەتام، سەرنجی هەموومانی ڕاکێشا بۆ لای خۆی، ئەمجا وتی من مامۆستای وانەکانی کۆمەڵایەتی ئێوەم، ئێمەش زۆر پێخۆشحاڵ بووین لەگەڵ ئەوەی وانەکان لەخۆیدا وشك بوو، بەڵام ئەو وەك فریشتە هەر لە سەرەتاوە خۆی خستە دڵ و دەروونمانەوە، مامۆستا فەرەیدوون ڕۆژ بە ڕۆژ هەفتە بە هەفتە زیاتر خۆی دەچەسپاندو وای لێ هات بە ماوەیەکی کەم مامۆستای دڵسۆز کەوتە سەر زاری هەموومان چونکە پێشەکی وانەکانی کردبووە ئامۆژگاری بۆمان و ڕابەری دەکردین بۆ خوێندنەوە بۆ بەتین کردنی بیرو باوەڕ بۆ یەکگرتن و پتەو کردنی ڕیزەکان بۆ ئەمەك داری لە خاك بۆ دڵسۆزی و نیشتمان پەروەری، دەیفەرموو ڕۆڵە جگەر گۆشەکان نیشتمان چاوەڕوانی هیمەت و هێزی بازووی ئێوەیە، دڵ پاك بن لەگەڵ یەك، دوور بن لە کینە و دژایەتی، هەوڵدەن و پێبگەن و ببنە پێشڕەو، ئێمەش چاومان دەبڕییە چاوانی و گوێمان لە وتەکانی دەگرت و بەخێرایی وشەکانیمان وەك گەوهەر لە دەمی بێتە خوارێ هەڵدەگرتەوە بەڵێ ئەوەندە هۆگری بووین هەرگیز نەمان دەویست لێی جیاببینەوە، بە شێوەیەك لەکاتی پشووی نێوان وانەکانیشدا ماوەمان نەئەدا بچێتە ژووری مامۆستایان بەڵکو دەمان برد بۆیاری تۆپی مێزو زۆرکاتیش یاری تۆپی باڵەی لەگەڵ دەکردین و ئارەقی لەگەڵمان دەڕشت و دوای یارییەکە ساردی و سیفۆنی بۆ بانگدەکردین. مامۆستا فەرەیدوون خۆی کردبووە گوڵی بەرۆکی هەموومان، هەر

هەست و نەستی دڵمان هەبوو، ماندایە، کردبوومانە پێنووس و پەرتووکی خۆمان بەیانیان چاوەڕوانی مامۆستا فەرەیدوون بووین، سەیری ژووری مامۆستایانمان دەکرد کەی دێتە لامان و هەواڵ و دەنگوباسی نوێمان پێ دەگەیەنێت چونکە وای ڕاهێنابووین بۆ زاخاوی مێشك وەك خۆراکی بەیانیان بوو...

بەڵێ ماوەی چەند مانگێك بەم شێوەیە ڕۆیشت بەبێ ئەوەی هەست بە تەواوبوونی ڕۆژەکانی بکەین.

هەروەك ڕۆژان بەیانی چاوەڕوانی مامۆستا فەرەیدوونمان دەکرد بەڵام دیارنەبوو، کەوتینە جموجۆڵ و هاتوچۆ، بۆ دیارنەبوو! زەنگی ژوورەوەی لێدا، هەر دیارنەبوو، یەکەم وانە جوغرافیەی مامۆستا فەرەیدوونمان هەیە، کەوتینە سەرەتاتکێ ئۆخەی هات، خۆی کرد بە پۆلدا، بەڵام مامۆستامان ئەمڕۆ ماتە هیچ نادوێت، ڕوخساری وەك جاران نیە، بە حەسرەتەوە دەیڕوانیە ئێمە، دەیوست لەگەڵمان بدوێت، بەڵام وەك دەستیان لەبین نابێت وابو، قورگی گریانی دەداو چاوە گەشەکانی پڕ فرمێسك بوون، بە چەشنی مرواری دەرژانە خوارێ ئێمەش واقمان وورمابوو، حەپەسابووین چاومان تێ بڕی بوو نەمان دەزانی چ باسە... دوای ماوەیەك مامۆستا هەناسەیەکی دوور و درێژی هەڵکێشاو بە زۆر زەردەخەنەی خستە سەر ڕووی و بە چەند وشەیەکی بچڕ بچڕ و نیوە دیارتێی گەیاندین گوێزراوەتەوە بۆ قوتابخانەیەکی کە... ئیتر ئێمەش خۆمان بۆ ڕانەگیرا دەستمان کردبە گریان، وانەو قوتابخانەمان لە بیر چووەوە، بەڕۆیشتی مامۆستا فەرەیدوون پەردەیەکی ماتەمی کشا بەسەر خوێندنگاکەدا. یاری خۆشمان لێ تێك چوو، وشەکانی هەمیشە لەبەر گوێماندا دەزرنگایەوە، ئامۆژگاریەکانی بوونە دروشمی هەمیشەیی ڕێگەی ژیانمان، هەتا ئێستاش هەر ڕێگەی ئەومان گرتووە و بە ئاماژەی ئەو کارمان کردوە.

مامۆستای خۆش ووتە، بۆوا زوومالٚ ئاوایت کردئەی نەتدەزانی هێشتا پێویستمان پێتە؟ کۆرپەو کوڕو کاڵی گەلەکەت چاوەڕێتن بۆ ڕێ نماییان بە بیری پاکی خۆت؟

دەتوش ئەی دایکی نیشتمان ئامێزتی بۆ خۆش کە لە گردەکەی سەیوان لەڕێك ئارامگای بێ کەس بۆ ڕۆڵەی کورد پەروەرت، چونکە لای ئێمە، هەمیشە جەستەی بە

ئازاربوو ئەشکەنجە میوانی بوو کۆڵنەدەر بوو بواری بە خۆی نەئەدا لە خزمەت و کاردا زۆر ماندووە، با چاوەکانی لێك بنێت و پشووی هەتا هەتایی بدات و بحەوێتەوە، توخوا شوێنەکەی بۆ نەرم کە با هەر لە خەوە خۆشەکەی دابێت هەتا ئێمەش دەگەینە لای و هەواڵی بەدیهاتنی ئامانجەکانی پێ دەگەیەنین.

هاوکاری ژمارە(١٣٤٩) ڕۆژی ١٩٩٢/١/٨

# مامۆستا فەرمیدوون عەلی ئەمین و چەپکێ گوڵ بۆ سەرمەزاری

لەتیف غەریب ئەحمەد

مامۆستای زاناو دواندەر و زمانزان و خاوەن پێنووسم، کۆچت کردو دنیای ئەدەب و ژیانت جێهێلا، تۆی بەئەمەکو بەوەفا بۆ خزمەتی ڕوخساری وشەی پاکی ڕەسەنی کوردی و کوردایەتی، ڕەنجێکی درێژخایەن و شەوانی ڕابوردووتم لەیادە کە دیدەکانت خەویان لەبیرچو بۆوە..

پێنج سالی تەمەنم بەلێ... پێنج سالی تەمەن لەیەك گوندبووین بێ لە یەکدابڕان، کاتێ دەهاتە سەرئەوەی دەریای وشەکانی دەدرکان بەهەستێکی کامڵ و بیرێکی وردەوە گەوهەری نهێنیەکانی پرشانازی دەروونی پێدەبەخشیم.. ئەو پرسیارەی هەموودەم لە ویژدانیان دەژیاو بۆ گەیشتن بەئامانجی پیرۆز... بووەدرەختێکی بەهرەو بەخشینی بەرهەمێکی زیندوو، کە هەرگیزاو هەرگیز بزربوون و ئاوابوونی بۆنیە، ئەگەر پەروەردگارم دەرفەتبدا بیرەوەریە نەمرەکانی چەپکە چەپکە، دەخەینە پێش چاوی خوێنەری کوردی ئازیزمان... لە کۆتایدا پرسە لە هاوڕێیان و هاوبیران و سەرەخۆشی لەخۆم و دڵسۆزانی دەکەم... مامۆستا ماڵ ئاواو مەزارت پربێ لە گوڵزاری بەرین.. هۆنراوەیەکو ماڵ ئاوایی...

**مامۆستامان**

**بۆ کۆچی تۆ نیگای ماندووم**

**لە دەریای غەم**

**یادی شەوەکانت ئەبڕێ**

**سکڵی دیارو ئاخریمان**

**لەناو دەروونا ئەگرێ**

**کێ دەڵێ تۆ..**

**لەناو دڵا، لەناوچاوا**

**ئەسڕێنەوە**

**وشەکانت سەر دەمێك نین**

**لەوەرزێکدا بکوژێنەوە**

**کەشکۆڵی پڕ یادگاری**

**بیرەوەریت**

**هەموو ڕۆژێ گوڵی مێژووت**

**ئەکاتەوە**

**پلەی بەرزی شانازییەکەت**

**دەریای هۆشم ئەخواتەوە...**

ـ هاوکاری ژمارە(١٣٤٥) ڕۆژی ١٩٩٢/١/٤

# ساڵڕۆژی کۆچی دوایی مامۆستای نەمر فەرەیدوون عەلی ئەمین

عەبدوڵڵا عەباس

ئەوا ساڵێك ڕابوورد بەسەر ماڵئاوایی کوتوپڕو ناوەختی شۆڕە سوارێکی بەهرەی داهێنان و شارەزای پەروەردە و ئەدەب و ڕۆشنبیری گەلەکەماندا مامۆستای نەمر فەرەیدون عەلی ئەمین..

کۆچێکی کوتوپڕ و ناوەخت، چونکە ئێمە زۆرمان پێویست بوو وا پەلە جێمان نەهێڵێو ئەویش زۆر ئاواتی گەورەی هەبوو... حەزی دەکرد بەشی هەبێ لەبەدی هێنانیاو..

ئاخ.. مامۆستای گەورەم.. ئەم دنیایە چەند بچووکەو.. تۆ چەندە گەورەی.... دیارە لەبەر ئەوەی خواستەکانت.. هیوای ئەمڕۆ پاشە ڕۆژت جێی لەم پاڵەپەستو تەسکەدا نەبووە.. بۆیە... بەبێ ئەوەی بەهیچ ئازیزێکت بڵێی ماڵئاوایت کرد..!

لەو ڕۆژەوەی دەستی ڕاست و چەپی خۆم ناسیوە ژمارەیەکی دیار، لە مامۆستایان و ئەدیب و ڕۆشنبیرانم ناسیوە. هەیانە دەرسیان پێوتووم، هەیانە لە دەرەوەی قوتابخانە فێری زۆر شتیانکردوم. خۆم بە قەرزاری هەریەکەیان ئەزانم.. ئەوەیان یەك وشەی فێرکردم و ئەوەیان زیاتریان خستە مێشکی ئێستا هیلاکمەوە.. بەڵام تۆ پایەو شوێنت لەدڵما. لەویژدانما.. تایبەتیەو باڵا.. چونکە تۆ کاتێ سەرنجت بۆ ڕاستیو ویژدان و پەروەردە و خۆشەویستی و ئیتر هەموو شتێکی جوان و بەهاداری پێ گەیاندن فێرکردم.. من و دەیان قوتابی هەژار، لە(چوارتا) هەناسەمان لە(پیرالك)دەبوو بە گۆرانی چۆلەکەکانی ئەو دارستانە... کاتێ منداڵ بووین. وە.. یەکەم هەنگاوی پەروەردەی ڕاست لەوێوە دەست پێدەکاو... تۆ.. دەستتگرتین بۆ ئەو یەکەم هەنگاوە.. زۆر ئامۆژگاریتم لە بیرە، زۆر لە سرودەکانتم بۆ منداڵان لە بیرە..(یەك و دوو.. داری

سێوو داری تووەکەی.. سێ و چوار هاتم بۆ مەکتەب بە غار.. هتد ..).. بۆ یەکەم ڕاهێنانە بۆ هەنگاوی فێربوونی یەکەم وانە...

بەڵام، ئەوەی تائێستاش هاندەرمە بۆ توانای بەرەنگاربوونەوەی هەموو سەختیەکی ئەم دنیا جەنجاڵەی کە. تۆ یەکێك بووی ژیرانە لە مانای ئەگەیشتی، هاندەرمە بەرگەبگرم بمێنمەوە.. ئامۆژگاری یە هەرە بەهادارەکەی تۆیە بۆ من و.. ئەو چرۆیانەی ئەوسا دەستی دڵسۆزی باوکانەت دەهێنا بە سەرماناو ئەتوت!

بەهادارترین شت پێویستە فێری ببین ئەوەیە(ڕێزی خۆمان بگرین). لەم دنیایەدا ڕێزی خۆت نەپارێزی کەسیەدی ئامادەنیەیە بۆت بپارێزی.. کەرێزی خۆت پاراست رێزت ئەگرن.. گەر خوا نە خواستە لەدەستدا ئەبێ چاوەڕێی ئەوەبێت(بەسووکی سەیرت بکەن) ئەوەیشی بەسووکی گلۆریانکردەوە، بەزەحمەت یەتەوەسەرەوە.. ڕێزی خۆتان. بگرن.. ڕێزی یەکتری بگرن خۆشەویستەکانم.

مامۆستای گەورەم

لە ساڵڕۆژی ماڵئاوایتداو ئیستەلە باوەشی خاکی شاری جەربەزەی سلێمانیدا چاوت لێکناوە.. بەڵام لای قوتابیەکانت چاوکراوە... باڵا شەنگ.. باوەڕپتەو.. پەروەردە زانێکی بە ئەمەك هێشتا دەست بەسەرمانا ئەهێنێ و فێرمان ئەکەی.. زیندوی لە دڵمانای.. لەویژدان و باوڕمانا مامۆستایەکی نەمرو.. گەورەو.. هەرەبەڕێزی...

<u>هاوکاری ژمارە(١٥٩٥) ڕۆژی ١٩٩٢/١١/٢٥</u>

# بەبۆنەی چلەی خوالێخۆشبوو مامۆستای ئەدیب و ڕابەری پەروەردەو ڕۆشنبیری کورد فەرمیدەوون عەلی ئەمین

**عومەر ئیبراهیم عەزیز**

لە ڕۆژی ١٩٩١/١١/٢٥ دڵی مامۆستای ئەدیب و ڕابەری پەروەردەو ڕۆشنبیری کورد(فەرەیدون عەلی ئەمین) لەدوای ئەوەی کە بەدەم ئێش‌و ئازاری نەخۆشیو بەدڵێکی پڕ لەژان‌و ململانێیەکی دوورو درێژ لەگەڵ نەخۆشیدا لە لێدانکەوت و ماڵ ئاوایی لە جیهانی ئەدەب و هەموو لایەکماکرد.

مامۆستا فەرەیدوون ڕۆشنبیرێکی کوردی بەتواناو شارەزاو هێمن‌و ناسك‌و لەسەرخۆ و مامۆستایەکی پەروەردەو فێرکردن‌و ئەدیبێکی دیاری داهێنانی ئەدەبی چیرۆك و نووسینی(تری) ئەدەبی کوردیمان بوو.

مرۆیەکی دڵپاك و بەدرێژایی ژیانی قۆڵی هەوڵدان‌و تێکۆشانی لێ هەڵماڵیبوو لەپێناوی خزمەتکردنی بزوتنەوەی ئەدەبی‌و ڕۆشنبیری‌و پەروەردەیی کوردیدا.

هەر لە ساڵی(١٩٥٤)زدا کە یەکەم نووسینی لە ڕۆژنامەی(ژین)دا بڵاوکردبووەوە تاکو کۆچی دوایی ڕۆڵێکی دیارو باڵای لە دەوڵەمەنکردنی کتێبخانەی کوردی هەبووە بەهۆی بەرهەمە ڕەنگینەکانی لە بواری ئەدەبی منداڵان و پەروەردەکردنیاندا، چ بە نووسین‌و وتارو چیرۆك لە گۆڤارەکاندا و بە بڵاوکردنەوەی نامیلکەی خنجیلانە.

بێجگە لە نووسینی وتاری ئەدەبی تر، لەوانە: کۆمەڵە وتارێکی لە مەیدانی ڕەخنەو ڕەخنەکاریدا بڵاوکردۆتەوە لە گۆڤارو ڕۆژنامەکاندا. کە بریتی‌بوون لە ڕەخنەو هەڵسەنگاندنی چەندان چیرۆك و شیعر و بەرهەمی تر، جارو باریش شیعریشی ووتوە.

بە کۆچی دوایی‌کردنی مامۆستای رابەری پەروەردەو فێرکردن، مەیدانی ئەدەبی کوردی ڕۆشنبیریمان سوارچاکێکی بەتواناو لێهاتووی لەدەستچوو، کەجێ پەنجەی ڕەنگینی کاریگەری هەتاهەتایە دیارە لە بواری پەروەردەو فێرکردنی منداڵان‌و ئەو بەرهەم‌و داهێنانە ئەدەبی‌یانەی کە بۆمانی بەجێهێشتووە.

# مامۆستا فەرەیدوون و جەژنی نەورۆز

مامۆستای نەمرمان چوار وتاری بەنرخی بە نازناوی مامۆستا - ف — ەوە بلاوکردۆتەوە لە ژمارەکانی ڕۆژنامەی ژیندا. وتارێکیان ناونیشانی(جەژنی نەورۆزم چۆنکرد)بوو لە ژمارە(١٣٣٨)ی ١٩٥٧/٣/٢٨دا بلاوکرایەوە.

دوای سالێك هەمان وتاری پێشوو لە ژینی ژمارە(١٣٨٥)ی ١٩٥٨/٣/١٣دا بلاوکرایەوە. هەلسوورێنەرانی ڕۆژنامەکە وایان نووسیوە:"لەژمارە ١٣٣٨ی ژیندا، واتە چەند ڕۆژێ دوای جەژنی نەورۆزی سالی پار مامۆستا - ف — وتارێکی لە ژێر ناوی(جەژنی نەورۆزم چۆنکرد؟)دا بلاوکردبۆوە، لەبەرئەوەی کە وتارەکەی چەند پێشنیارێکی پەسندی تیابوو کە ئەبێتە هۆی ئەوەی جەژنی نەورۆز خۆی کوتێتە ناو هەموو خێزانێکەوەو ڕەگێکی ئەوتو داکوتێ کە بەرگەی ئەم ژیانە کولەمەرگییەی ئێستامان بگرێ، بە پێویستمان زانی کە ئەمسال لەپێش جەژنی نەورۆزدا هەر هەمان وتار وەکو خۆی بخەینە پێش چاو بە نیازی ئەوەی هەموو برایەکی کورد پەیرەوی بکا." بەلام ئەوە مامۆستا(فەرەیدوون) کۆچیدوایی‌کردو... ئەوە مردنە...... چی ئەکەی!

هەر ئەوەندە دەلێم: دلنەوایی دلسۆزی بۆ بنەمالەی خوالێخۆشبوومان لە یەزدانی گەورەو بەخشندەو میهرەبان داواکارین کە جێی مامۆستای خوالێخۆشبوو بە بەهەشتی پانوبەرین شادبکات.

گیانی نەمری خۆشیی لەلای هەموولایەکمانەوە هەردەمێنێو نامرێو دەژی بەهۆی بەرهەمە بەنرخە نەمرەکانی.

- دەبا هەر نەمرتر بێ یادی ئەم مرۆڤە دلپاکە.

# چیرۆکی منداڵان لای فەرەیدوون عەلی ئەمین

د. عەبدولستار تاهیر شەریف

ڕووداوەکان و بەسەرهاتەکانی تەمەنی منداڵی لە قۆناغەکانی کۆرپایەتیو ساوایەتیدا، شوێنەوارێکی گەورەو کاریگەر لە ژیانی منداڵدا جێدەهێڵن. ئەم شوێنەوارە بە درێژایی تەمەنیان دەمێنێتەوەو کاردەکاتە سەر ڕەوشتیان، ئەویش بە مانەوەی – واتە شوێنەوارەکە – بە حەشاردراوی لە نەستی(اللاشعور) منداڵەکەدا. ئنجا ئەو کارکردنانە هەمواربن یان ناهەموار، ئەوە پەیوەندی بە جۆری ڕووداوەکانەوە هەیە، بەتایبەتی بەسەرهاتەکانی پێنج شەش ساڵی یەکەمی تەمەنی کە کارێکی گەورە دەکەنە سەر دوارۆژی منداڵەکە.

لەم ڕوانگەیەوەبوو، مامۆستا فەرەیدوونی پەروەردەناس و باوك، نووکی خامەکەی خستەکار بۆ نووسینی چیرۆکی منداڵانو درێغینەکرد لە زاخاودانی مێشکیان بە چیرۆکە کورتو پڕ واتاکانیەوە کە بەپێی بارو دۆخ و دەرفەتەکانی بۆیانی دەنووسیەوەو دەورێکی باڵایان هەبو لە پێگەیاندنی وەچەی تازەی نەتەوەکەمان.

فەرەیدوونی پەروەردەناس لەبەر تیشکی ڕۆشنایی وتەێیکی پەروەردەناس بایەخی بە منداڵ دەدا کە دەڵێ:"منداڵ پێوەری سامانو سەرمایەی نەتەوەیە، ئەو نەتەوەیە دەوڵەمەندە کە منداڵانی بە جوانی پەروەردەکراون." لە بواری پەروەردەکردنی منداڵ و دەوری چیرۆك لەم بوارەدا هەوڵدەدەین چەند تیشکێك بخەینە سەر چیرۆکە کورتەکانی مامۆستا فەریدوون کە بۆ منداڵانی کوردی نووسیوە، ئەم چیرۆکانە هەڵبسەنگێنینو بیان نرخێنین بە شێوەیێکی بابەتییانەو زانستییانە.

مامۆستا فەرەیدوون یەکێ لە نووسەرە پێشڕەوەکانی ئەدەبی منداڵ بوو بە تایبەتی لە بواری نووسینی چیرۆك و هەڵبەست، بەڵام زیاتر بایەخی بە چیرۆك دابوو، هۆی سەرەکی ئەم بایەخدانەشی جگەلەوەی نووسەرو ئەدیب بو، دەگەڕێتەوە بۆ کەسێتی مامۆستا فەریدوون وەك باوك و مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی کە زۆربەی کاتی بە

پەروەردەکردنی منداڵانی کوردەوە دەبردەسەر لەو سەردەمەی مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی بو لە ساڵانی پەنجاکاندا، کەواتە لە بواری عەمەلی و مەیدانیدا زۆر لە نزیکەوە شارەزای جیهانی منداڵ بووە، خۆ لە بواری دیمانەیی‌و زانستی‌یەوە ئەوا دەرچوی کۆلیجی پەروەردەو دەروونناسی بوو... بە هەر حاڵ ئەوی لە نزیکەوە شارەزای مامۆستا فەرەیدون بووبێ دەزانێ تا چ ڕادەیێك منداڵی خۆش دەویست.

لە نووسینەکانی لە بواری چیرۆکدا دوای خۆی ئەم چیرۆکانەی بۆ منداڵی کورد جێهێشتووە:

پیاوەپچکۆلە ١٩٧٢. پیاوە پچکۆلە بریتی‌یە لە هەشت چیرۆك‌و نۆ هەڵبەست. چیرۆکەکان ئەمانەی لای خوارەوەن:

- بەرخۆلەو کۆترە کێویلەو مناڵ.
- پیاوە پچکۆلەکە.
- جووجەڵەو ڕێوی.
- چۆلەکە بۆر ڕزگاری بوو.
- کاکە ئالان مار هات، ماری ژەنگوژار هات.
- تامی تامی گەنمەشامی
- پشکۆو شێرکۆ شەڕیانە لەسەر دەنکێ زەنگیانە.
- زەنگۆڵە.

هەڵبەستەکانیش ئەمانەی لای خوارەوەن:

- باخ، بۆق، دراوسێ، کۆتری پەڕلەپێ، ناوماڵ، خووی خراپ، بۆڕبۆڕین، من مناڵم، باخی جانەوەران.

نرخاندنی هەڵبەستەکانم بۆ مامۆستا عەبدوالرەزاق بیمار جێهێشت، بەو باوەڕەی وەك شاعیرێك لەم ڕووەوە لە من شارەزاترە.

بێینەوە سەر چیرۆکەکانی(پیاوەپچکۆلە)... چیرۆکنووس هەوڵی‌داوە بەهاکانی (ئاشتی‌و هاریکاری‌و خۆشەویستی‌و ئاسایش‌و پاك‌و تەمیزی‌و چاکە لە مێشکی مناڵانی کورد بڕوێنێ و بەهاکانی(شەڕو پەلاماردان(العدوان)و خەراپەو کینەو بوغز) ڕسوابکاو نەفرەتی لێ‌بکەن.

پێشەکییەکی بۆ ئەم کۆمەڵە چیرۆکە نووسیوە، لەم پێشەکییەدا زۆر مەبەستی بووە ئاماژە بۆ ئاگادارییەکەی نەتەوە یەکگرتووەکان بکا دەربارەی مافی منداڵ کە لە ٢٠ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٥٩دا بڵاوکراوەتەوەو بریتییە لە(١٠)بەند، کە هەر دە بەندەکە پشتگیری لە مافی منداڵ دەکا.

لە ڕوانگەی دە بەندەکانی مافی منداڵ مامۆستا فەرەیدون عەلی ئەمین دەڵێ:"ئێمەی کورد هیچی ئەوتۆمان بۆ منداڵانی کورد نەکردووە کە شایانی باس بێت و بگرە قەرزارباریشیانین... پاشان وەك پەروەردەناسێك و مامۆستاو باوك دەست دەداتە خامەکەی‌و خەریکی دانەوەی ئەم قەرزانە دەبێ بە منداڵانی کوردو دەڵێ:"دەبا لە سەرمانا هەڵ نەلەرزێن‌و سەری کوڵمەکانیان خوێنی تێنەزێت‌و سنگ‌و بەرۆکیان دانەچەکێت‌و خیزەخیزی نەیەت، باپێخاوس نەبن‌و قاچ‌و قولیان زامدار نەبێت".

با لە چڵکدا گەڕنەبن و لە برساندا سکیان بەپشتیانەوە نەنووسێت‌و چاویان بەقووڵدا نەچێت، با لە نەزانین‌و نەخوێندەواریدا کوێرایی‌یان دانەیەت‌و لەوە زیاتر بە قوڕدا نەچنە خوارەوە. با ژەنگی زورداری‌و ژێردەستی‌و بێخزمەتی لەسەر لەش‌و ڕوویان بتەکێنین‌و ڕەنگ‌و ڕووە ڕاستەقینەکەی خۆیان دەربکەوێت‌و ئەوسا بزانن چۆن وەك گوڵ ئەگەشێنەوەو چۆن ئەدەنە قەدو باڵاو تواناو داناو خزمەت گوزارئەبن.. لە چیرۆکی (بەرخۆڵەو کۆترە کێویلەو منداڵ) چیرۆکنووس هەوڵیداوە بە چەند دێڕێك مێشکی منداڵی کورد بە بەهای(ئاشتی) زاخاوبداو بەهای(شەڕ)یش ڕسوابکا. کاتێ کە باسی دێیەکی خنجیلانە دەکا بەقەد پاڵی شاخێکەوە... فڕۆکەیەك دێیەکە بۆمباباران دەکا... منداڵانی دێیەکە ڕادەکەن و ڕادەکەنە ژێر درەختێك، لەوێ کۆترە کێویلەیەك بەلقێکی درەختەکەوە خۆی ماتکردبوو، وادیار بو کۆترەکەش لە ترس هەلۆیەکی دڵڕەق خۆی لەوێ شاردبووەوە... هتد.

گومانی تێدا نییە ئەم چیرۆکە کورتە کارتێکردنێکی هەمواری(ایجابی) کردۆتە سەر منداڵانی کورد و وای لێیان کردووە هەمیشە عەوداڵی ئاشتی بن نەك(شەڕ).

لەم ڕووەوە(ماك ئەلند) دراسەتی هۆیەکانی لایەنگیری لاوە ئەڵمانییەکانی کردووە، لە سەردەمی(هیتلەردا) بۆی دەرکەوت کەوا ئەو لاوانەی دوای تەواوبوونی شەڕی

جیهانی یەکەم لە تەمەنی منداڵێتی بوونە، مێشکیان بە جۆرە وێژەیێك زاخاو درابوو. پڕبو لە هاندان بەشێوەیێکی نەستی(لاشعوری) لەسەر تۆڵەسەندنو پێویستی سەرلەنوێ دروستکردنەوەی ئەڵمانیای باڵا کە دەبێ هەمو دونیا ببەزێنێ. ئەم دراسەتەی لەسەر ئەو لاوانە کردبو کە لە ساڵی ١٩٣٣دا لایەنگیری هیتلەریان دەکرد بە هۆی کارتێکردنی شیعرو سرودو چیرۆك و جۆری پەروەردەکردنی ئەو سەردەمەیان کە لایەنگیری بیروباوەڕی نازیەتیان دەکرد.

مامۆستا فەرەیدون لەم ڕووەوە زۆر شارەزاو پسپۆڕبووە، بۆیە دەبینین بەهای ئاشتیو خۆشەویستی لە زۆربەی زۆری چیرۆکەکانی ڕەنگدەدەنەوە، بەتایبەتی کە چیرۆکەکانی لە بارودۆخێکی زۆر سەختو دژواردا نووسیویەتیو منداڵانی کورد بەڕاستی لە بارودۆخی منداڵانی چیرۆکی(بەرخۆڵە)کەدا دەژیان.

هەروەها چیرۆکنووس چیرۆکەکانی، هەر هەموو چیرۆکەکانی بە زمانێکی سادەو بێگەرد نووسیوەو وشەکانی جگەلەوەی زۆر جوانن لای منداڵانی کوردیش نامۆنیین. لەلایێکی ترەوە لەسەر زمانی باڵندەو گیانلەبەر نووسیوەتەوە کەواتە شێوەی(حیوار) لە نێوان منداڵانو گیانلەبەرەکان، کە لە تەمەنی منداڵێتیدا ئەمە جوانترینو گونجاوترین شێوەی نووسینی چیرۆکە.

لە چیرۆکی(پیاوە پچکۆلەکە)، لەم چیرۆکەدا چیرۆکنووس هەوڵیداوە منداڵان فێری هەندێ دابو نەریت بکا وەك چۆنێتی پەڕینەوە لە شەقامەکاندا لەگەڵ چەسپاندنی بەهای(هاریکاری) کردن لەگەڵ یەکتردا.

مامۆستا فەرەیدون ئەم چیرۆکەی بۆ منداڵانی کورد لە ساڵی ١٩٧٢دا نووسیوە، ئێستا دوای تێپەڕبوونی زیاتر لە بیست ساڵ بەسەر نووسینیدا جێگای داخە زۆربەی زۆری گەورەکان نەك منداڵان دابو نەرێتی پەڕانەوەی سەر شەقامەکانیان نەك لە کوردستاندا بەڵکو لە گشتی عێراقداو لە شارە گەورەکانیش خستۆتە پشت گوێ، ئەمەش بێگومان هۆیەکانی دەگەڕێتەوە بۆ جۆری پەروەردەکردنی منداڵ لە قوتابخانەو لەناو خێزانەکانیاندا هەروەها کارتێکردنی ڕۆژانەی ژینگەکەیان کە تیایا دەژین.

لە چیرۆکی(جووجەڵەو ڕێوی) چیرۆکنووس شێوەی دەمەتەقێی بەکارهێناوە لە نێوان جووجەڵەکانو دایکیاندا، هەروەها لە نێوان جووڵەکانو (هیوای) خاوەندیان و لە نێوان هیواو مام ڕێوی فێڵباز. بەم شێوەیە توانیویەتی زیاتر سەرنجی منداڵان بەرەو ناوەڕۆکی چیرۆکەکە ڕابکێشێو بەهای(ئاسایش) لە مێشکیان بنێژێو بایەخ بە ئاسایشو دەوری ئاسایش بدا لە پاراستنی خێزانو کۆمەڵ، بەتایبەتی خێزانێکی بە ئارامو بێ وەیی وەك(مریشکە کونجە)و جووجەڵەکانی، لەگەڵ ڕسواکردنی بەهای(شەڕ)و پەلاماردان(العدوان) کە لە پیشەکانی مام ڕێوی فێلبازە... لەگەڵ بایەخدان بە بەهای(بەزەیی هاتنەوە) بە گیاندار و زیندەوەرەکان.

لە چیرۆکی(چۆلەکەبۆر ڕزگاربو) لەم چیرۆکە چیرۆکنووس زیاتر بایەخی بە بەهای(بەزەیی هاتنەوە)داوە بە گیانداران لەلایەن منداڵانەوە لەگەڵ ڕسواکردنی بەهای(پەلاماردان)و ئازاردانی گیانلەبەران... چیرۆکنووس لەم چیرۆکەیدا منداڵانی کردۆتە دوو بەشەوە دوو(تاقم)، بەشێکیان کە زۆربەی منداڵنن لەگەڵ ئەوەن فێڵ لە(ئاسۆ)ی هاوڕێیان بکەن کە چۆلەکەییێکی گرتبو، توند توند بە دەستی دەیگوشی و ئازاری دەدا، بۆ ئەوەی لە چنگی قورتاری بکەن.

ئەمەش ئەوە ڕووندەکاتەوە کەوا هەندێ لە خێزانەکان بە جوانیو باشی منداڵەکانیان پەروەردە نەکردووەو بەرەڵلایان دەکەن بە بێ چاوەدێری کردنیان.

لە چیرۆکی(کاکە ئالان مار هات، ماری ژەنگوژار هات) لەم چیرۆکەدا، چیرۆکنووس بە شێوەی دەمەتەقێ لەنێوان دوو منداڵدا، (داراو ئالان) نووسیوە، کە هەردوکیان هاریکاریان لەگەڵ یەکترد دەکرد بۆ چوونە گیان هێلانە چۆلەکەو دەرهێنانی جوجەڵەکانیان.. کەواتە هەردووکیان شەڕفرۆشو پەلاماردەربون.. ئەنجامەکەشیی لە یەکێ لە کونە هێلانەکان مارێك دەدا بەدەستی ئالانەوە.. بەم جۆرە چیرۆکنووس هەوڵیداوە بەهای شەڕو پەلاماردان ڕسوابکا.

لە چیرۆکی(تامی تامی گەنمە شامی) دەبینین چیرۆکنووس چەند بایەخی بە چەسپاندنی بەهای (پاکوتەمیزی)داوە، ئەویش بە نەکڕینی خواردەمەنیو خواردنەوەی پیسو بێ کەڵك لە دەرەوەی قوتابخانەو کڕینیان لە کۆگای قوتابخانە، کە

جگە لە پاکوتەمیزی بەهای هاریکەریشی تیا بەدیدەکریْ. لەچیرۆکی(پشکۆو شێرکۆ شەڕیانە) دەبینین مامۆستا فەرەیدون ئەم چیرۆکەی لەسەر شێوەی(شانۆ) نووسیوەو کردویەتی بە سێ پەردەو هەوڵیداوە بە ڕێگای شانۆگەرییەوە ڕەوشتی خەراپەو دەماری شەڕفرۆشی لە مێشکی منداڵاندا بسڕێتەوەو ڕەوشتی چاکەو ئاشتی خوازانەو هاریکاری لەنێوان هاوڕێیانی قوتابخانە ئامانج بدا.

لە چیرۆکی(زەنگۆڵە)، کە ئەمە دوا چیرۆکی پیاوە پچکۆلەیە چیرۆکنووس تیایدا چارەسەری یەکێ لە خووە خەراپەکانی منداڵی کردووە، ئەویش درەنگ هەستانە لە خەوی بەیانیان... لێرەدا چاومان بە دەمەتەقێ دەکەوێ لە نێوان(کاروان)و ئەو زەنگۆڵەی باوکی بۆی دابنابو بەیانیان لە خەوی هەڵدەساند... واتە حیواری نێوان کاروان و بێ گیانێك.. کە زەنگۆڵەکەیە.. لێرەدا دەبینین چۆن مامۆستا فەرەیدوون چۆتە ناخی زانستی پەروەردەو دەروونناسییەوە بەتایبەتی لە قۆناغەکانی منداڵێتیدا.

لە بەشی دووەمی چیرۆکەکانی بۆ منداڵانی کورد مامۆستا فەرەیدوون لە زنجیرەکانی(١، ٢، ٤، ٥)دا، وەزارەتی پەروەردەو کاروباری ژووروو- بەڕێوەبەرێتیی گشتیی خوێندنی کوردی- بەشی هۆی فێرکردن ئەم چیرۆکانەی بۆ لە چاپداوەو بڵاویکردۆتەوە:

لەم چیرۆکانەدا چیرۆکنووس دووبارەی هەوڵی چەسپاندنی بەهاکانی هاریکاری و پاکوتەمیزی و ئاشت بوونەوە... هتد). ئەم چوار زنجیرەیە بە وێنەی ڕەنگاوڕەنگ ڕازاندراونەتەوەو سرنجی منداڵ ڕادەکێشن و زەوق و لەزەتی خوێندنەوەیان لا پەیدادەکا جگە لە زاخاودانی مێشکیان بەو بەهایانەی لەسەرەوە ئاماژەمان بۆ کردووە... هەر چەندە چیرۆکی(گەنمەشامی) هەمان چیرۆکی(تامی تامی گەنمەشامی) کۆمەڵە چیرۆکەکانی پیاوە پچکۆڵەیە، بەلام هەندێ گۆڕانکاری تیاداکردووە سەرەڕای جوانیو نایابی چاپکردنەکەیو ڕازاندنەوەی بە کۆمەڵێ وێنەی ڕەنگاوڕەنگو نایاب.

چیرۆکی پیرێکی ڕیش درێژبوو لەبەر ئەوەی وەرگێڕاوە هەڵمنەسەنگاند، چونکە چیرۆکەکە، چیرۆکی مامۆستا فەرەیدوون نییە.. جە لەم چیرۆکانەی کە چاپکراون و بڵاوبوونەتەوە مامۆستا فەرەیدوون کۆمەڵێ هەڵبەست و چیرۆکی تری هەیە بۆ

منداڵانی کورد کە بەداخەوە تائێستا ڕووناکیان نەدییوەو چاپ نەکراون‌و هەر بەدەست خەت ماوەنەتەوە، لەو چیرۆکانەی من چاوم پێیان کەوتووە ئەمانەی لای خوارەوەن:

١ـ بۆچی کوندەبوو نابرێت بۆ سەیران. ٢/١/؟

٢. دەرزەنیٚ ڕزگاری ١٩٨٤/٨/٢٠

٣. دوو جۆر تەیارە ١٩٨٣/٥/١٥

٤ـ گەڵاڕێزان‌و فیسقەگولە ١٩٨٢/٥/٢٦

٥ـ باخەوان ١٩٧٨/١٢/١٢

٦ـ ڕەسمکردن- ئەمە دێیەکەی خۆمانە ١٩٧٨/٩/٢٦

٧ـ چۆلەکەو کرمەسوورە ١٩٨٠/٣/٢

٨ـ نا... نا.. نابین بە لم ١٩٨١/١/٨

٩ـ سەعاتە گوڵ ١٩٧٨/١٢/١

١٠ـ پەرژین ١٩٨٠/٨/٢٦

١١ـ دارگوێز نافەوتێت ١٩٨٠/٤/١٩

١٢ـ بۆمبا ١٩٧٩/١/١٣

١٣ـ پۆلە کۆترێکی ماڵی —شانۆگەری

١٤ـ هەر دەگەڕێینەوە ١٩٧٨/٣/١٨

١٥ـ چار هەر ئەوەیە ١٩٧٨/١١/١٨

١٦ـ چۆلەکە ١٩٨٠/١١/٧

١٧ـ وێژدانی منداڵێك ١٩٨١/٧/٢٨

ئەم چیرۆکانەی کە چاپ نەکراون زۆربەی زۆریان چیرۆکی سیاسین و بارودۆخی کوردستانی دوای سالانی ١٩٧٠ی بە زەقی پێوەدیارەو بەهاکانی پەلاماردان‌و شەڕو زوڵم‌و زۆر ڕسوادەکەن. ئومێدەوارین لە زروفێکی لەباردا لە چاپقبدرێن‌و بگەنە دەست منداڵانی کورد.

١٩٩٣/٣/١١

# هەڵبەستی منداڵان لای فەرەیدوون عەلی ئەمین

**عبدالرزاق بێمار**

مامۆستا فەرەیدوون عەلی ئەمین یەکێکە لە نووسەرە پێشڕەوەکانی ئەدەبیاتی منداڵان[1]. زۆربەی بایەخی ئەدەبیانەی خۆی بۆ جیهانی منداڵان تەرخانکردووە، ئەم کارەشی هەر لە ئەنجامی ئارەزوویەکی سەرپێییدا نەکردووە، بەڵکو بە دلگەرمیو خۆشەویستییەوە لە ڕووی بەهرەداریو شارەزاییەوە چووەتە ناو ئەم جیهانەوە. بێگومان خۆی نووسەربوو، لە دوادوای سالانی پەنجاکانەوە بەرهەمی کەم تا زۆری هەبوو، لە لایەکی ترەوە چونکە مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی بوو لە نزیکەوە شارەزای جیهانی منداڵان بوو، سەرەڕای خوێندنەوەو موتالاکردنیشی پاشان بەشی پەروەردەو دەروونناسی لە زانکۆی(مستنصریە) تەواوکرد ماوەریەکیش سەرپەرشتی پەروەردەیی بوو، هەروەها لە بەشی بەرنامەو کتێبی بەڕێوەبەرێتی خوێندنی کوردی لە بەغدا کاریکرد کە هەڵسوکەوتی لەگەڵ بابەتە پەروەردەییو ئەدەبییەکانی کتێبی قوتابخانەکان بوو.

هەڵبەستەکانی مامۆستا فەرەیدون بەگشتی لەلایەن پەروەردەو پەسندنو بابەتەکانیان ئەو بابەتانەن کە بۆ منداڵان بەتایبەتی قوتابیانی قۆناغی سەرەتایی دەست دەدەن.

ئەمانە بەگشتی نرخە جوانەکانی کۆمەڵایەتی دووپاتدەکەنەوە، لەم ڕووەوە ڕەوشت و خووی جوان، جوانیناسی، خۆشەویستی، هاوکاری، پاکوخاوێنی، کارکردنو چالاکیو هەوڵدان بۆ خوێندن، ئەنجا خۆشەویستیی نیشتمانو نەتەوەو بەئاوات گرتنی ژیانی

---

(1) بڕوانە گۆڤاری بەیانی ژمارە(١٦٩). ئەمە بەشێکی وتارەکەیە دوای کەمێ دەستکاری و لابردنی بەشی هەڵسەنگاندنی چیرۆك و زیادکردنی چەند لاپەڕەیەك دەربارەی نامیلکەی(کارژۆلە)و هەڵبەستە بلاونەکراوەکانی مامۆستا فەرەیدوون، لەسەر داخوازیی مامۆستا د. عبدالستار لێرەدا بلاوکرایەوە.

سەربەستی پڕ لە بەختیاریو ئاشتی بۆ کوردستانو دوژمنایەتیی کردنی شەڕو دەستدرێژیو لاساریو تاد... بەڕوونو ڕەوانی لە چوارچێوەی هەڵبەستەکاندا خودەنوێنن.

لەلایەن هەڵبژاردنی کێشو دارشتن و جێ کردنەوەی وشەی جوانو ناسکو ڕستەی سادەو چڕوپڕەوە، لە ڕۆژگاری خۆیاندا نموونەیەکی دیارو گەشاوەبوون.. لەو بڕوایەدام منداڵانو ڕابەرانی منداڵانیش چ باوکو چ مامۆستا پەسندیان کردوون. ئەوەتا چەند هەڵبەستێکی لە کتێبەکانی قوتابخانەدا دەخوێندرێنو هەندێکیشیان منداڵان لەبەریان دەکەنو بە دەنگی بەرز دەیانخوێننەوە.[٢]

مامۆستا فەرەیدون کۆمەڵێ هەڵبەستی بۆ منداڵان داناوەو زۆربەشیان بڵاوکراونەتەوە، وەکو خۆی نووسیویەتی چەند شیعرێکی لە نامیلکەی(پاڵەوانی دوارۆژ)دا بڵاوکردوەتەوە کە ساڵی ١٩٥٩ لەگەڵ مامۆستا عومەر عەبدولڕەحیمدا پێکەوە دەریانکردووە.. پاشان چوار پێنجێکی ئەم شیعرانەو چەند شیعرێکی دیکەی لە نامێلکەی(کارژۆڵە- ١٩٧٢)دا بڵاوکردووتەوە، هەر هەمان ساڵ لە نامیلکەی(پیاوە بچکۆلەکە)دا دە پارچە هەڵبەستی بڵاوکردۆتەوە.. هەشت پارچە شیعریشی لە پاش بەجێ ماوە. حەزدەکەم وەکو خوێنەرێکی تامەزرۆی ئەدەبیاتی منداڵان ئەو بەرهەمانە هەڵسەنگێنم، یان هەستی سەر پێییانەی خۆم دەربڕم.

کارژۆڵە

ئەم نامیلکەیە ١٣ پارچە هەڵبەستو ١٣ وێنەی ڕەنگینی دەستکردی بەدیع بابەجانی تێدایە. هەڵبەستەکان لە دڵێکی بەجۆشی خۆشەویستیی دوو شت، یەکەم منداڵو دووەم کوردستان وەکو کانی هەڵقوڵیون. بەڕای من یەکە نیشانەی سەرکەوتنیان کورت بڕیو چڕوپڕیەیە، لە ٤ دێڕ تا ٧ دێڕ شیعرنو هەر یەکە لە ٣٠ تا ٥٠ وشە زیاتر نییە.

---

[٢] وەکو شاهیدێك خۆم لە ڕانیە گوێم لە کچۆڵەیەکی خزممان بوو کەبە یەك بین و بەئاواز هەڵبەستی(ماڵەکەمان خاوێنە)ی دەخوێندەوە، هەروەکو بەستەیەك یان هۆنراوەیەکی یاریی منداڵانەو هەرگیز بۆ ئەوە نەدەچووم ئەوەی دەیڵێ شیعری مامۆستا فەرەیدوون بێت، هەتا دواتر سەیرم کرد بۆ دەرکەوت.

گشتی بە کێشی بەئاهەنگی خۆماڵی ٧ بڕگەیی‌و ٨ بڕگەیی(تەنیا یەکێکیان نەبێت کە کێشی دەبڕگەیی‌یە) دەڵێی سروودێکن ئامادەن لە لێوی ناسکی منداڵانەوە دنیا پڕکەن لە جووڵەو ترپەو ئاواز.

شوێنەواری زۆر لە خۆکردن‌و جوینەوەو درێژەپێدانی ناپێویستیان پێوە دیارنییە، چونکە زادەی سۆزێکی ڕاستگۆیانەو هەستێکی ناسکی ڕۆمانتیکی شاعیرێکی کوردن، کوردێك کە مەسەلە دێرینەکەی نیشتمانەکەی بووەتە تابلۆیەکی خەم‌و خەیاڵ‌و ئاوات چوارچێوەی دەروونی پڕکردوەتەوە.

بابەتەکانی ئەم هەڵبەستانە لە دەوری دوو تەوەرەدا دەخولێنەوە، یەکەم ئەوەی لە ژینگەی منداڵی کورددا زۆرتر دیارە، کە ئەمەش شتە سەرند ڕاکێشەکانی سروشتی کوردستان دەگرێتەوە، وەکو هەڵبەستی (سمۆرە- ل٤) کە وێنەی ئەم گیاندارە بزێوە بۆ منداڵ دەنەخشێنێ‌و پێی دەڵێ: سمۆرە گیانلەبەرێکی ورياو دارەوانەو بۆ زستان گوێز هەڵدەگرێ.

لە هەڵبەستی(کارژۆڵە)دا دیمەنێکی ژیانی لادێ دەگێڕێتەوە، لەلایەکی تریشەوە، خۆشویستن و هۆگریی منداڵان بەم گیانلەبەرە ماڵیانە دەچەسپێنی. ئەگەرچی نەمزانی بۆچی ڕەوشتی بەدی وەکو فێلبازی و قەپاڵ و گازگرتنی داوەتە پاڵ سمۆرەو کاریلە؟ لە کاتێکدا بەرجەستەکردنی ئەم لایەنە لە هەدوو هەڵبەستەکەدا بەڕای من ڕابەری کردنێکی باش نییە بۆ منداڵان، چونکە لە جیاتی هۆگری‌و خۆشەویستی ڕەنگە لە ناهەستیاندا (لاشعور) ڕەنگدانەوەیەکی ناهەموار بەرامبەر بەم دوو گیانلەبەرەدا بچەسپێ.

لە هەڵبەستی(پەپوولە)دا، سەرباری وێنەکێشانی دیمەنی جوانی پەپوو لە کەئەویش دانیشتووی چیایە، کردەوەی چاکی پەپوولە کە پۆستەچێتی ناو گوڵانە پێ نیشانی منداڵان دەدا، لەبەرئەوە کە چاکەکەرێکی بێ دەنگە بۆیە خۆشماندەوێ.

**تۆ پۆستەچی گوڵانی** — **نامەبەری دڵانی**

**بۆیە خۆشەویستمانی** — **نموونەی مەبەستانی**

بەلام خۆزگە جۆری کردەوە چاکەکەی پەپوولەی زیاتر ڕوونبکردایەتەوە کە گواستنەوەی هەلالەو شیلەی گولانە، کە دەبێتە هۆی پیتێن کردن‌و وەبەرهێنانی دارو شینایی. واتە تەنیا بە ڕستەی(پۆستەچی ناو گولان) مانا بۆ مندالان زۆر روون نابێتەوە.

هەڵبەستی(بەهار) دیمەنی شوانی لادێو گوڵی شاخ پیشان دەداتو جوانیی بەهار بە خۆشەویستیی کوردستانەوە دەبەستێ.

هەرچی هەڵبەستی(کوێستان)ە ئەوە ئاوڕدانەوەیەکی جوانە لە جۆرە ژیانێکی کۆمەڵی کوردەواری. ژینی ئەوانەی مەڕو مالات بەخێودەکەن، هاوینان ئاژەڵەکانیان دەبەنە سەر چیا بەرزە فێنکەکان کە لەوەڕگای سروشتکردی لێیەو لەم وەرزەدا لەبن کەپرو ناو ڕەشماڵدا ژین بەسەردەبەن. کوێستانیش کە بەشێکە لە نیشتمان بۆیە لای شاعیر خۆشەویستە.

(لە دەشتایی‌و لە کوێستان وەك بەهەشتە کوردستان) لە هەڵبەستی(بەستە)دا خۆشەویستیی نیشتمان بەستەی سەر زاری شاعیرە کە بۆ مندالانی دەخوێنێ بۆ ئەوەی خۆشویستنی نەتەوەو ئامادەیی خۆبەخت کردنیان لە دڵ و مێشکدا بچەسپێنێ.

**بەستەیەکم لەسەر دەمە — پڕ لە ئاهەنگ‌و زەمزەمە**

**ئاوازی شمشاڵی شوانە — خوڕەی قەڵبەزەی کوێستانە**

**گوێم لێبگرە وا بۆت ئەڵێم — کوردم بۆ کورد سەر دائەنێم**

لە تەوەرەی دووەمدا ئەو هەڵبەستانە دەبینین کە نرخە جوانەکانی کۆمەلایەتی‌و پەروەردەیی دووپاتدەکەنەوە، مندالانی کورد خاندەدەن بۆ خوێندن(ل کوڕە کوردم)و بە شەوقەوە بخوێنن‌و لە قوتابخانەدا پاك و خاوێنی فێربن(ل ١١ دوکانی قوتابخانە)، دوای خوێندیش بەتایبەتی لە لادێدا مندالان ئیش بکەن‌و یارمەتیی دایك‌و باوکیان بدەن.

(ل ٩ خوێندن‌و ئیش کردن).

هەر لەم دەرگایەوە ڕێنوێنی قوتابیان دەکات بۆ دەرس ڕەوانکردن‌و یاریکردنی خۆش(ل٧ — میوان) هەروەها لە هەندێ خوو ڕەوشتی بەدی وەکو زۆرخۆری‌و

چلێسی(نەوسن — ل ١٣)و کردەی لاسارانە(چەقەوەسو — ل ١٤) وریایان دەکاتەوە بۆ ئەوەی لێی بە دووربن.

پیاوە بچکۆلە:

ئەو هەڵبەستانەی لەم نامیلکەیەدان بەگشتی نرخە جوانەکانی کۆمەڵایەتییان بە ئامانجگرتووە؛ وەکو خۆشەویستیی نێوان ئەندامانی خێزانو ڕاگرتنی پاکژیی لەشو ژینگەو ڕێزگرتنی دەرو دراوسێ. بە شێوەیەکی گشتی لە هەستو سۆزی منداڵانەوە نزیکن، ئاژەڵو گیاندارانی دەوروبەری منداڵان دەکەنە بابەتی خۆ، هەروەها خۆشویستنی گیانلەبەرانو بەزەیی پێدا هاتنەوەیان فێری منداڵان دەکەن، هەندێکیشیان چوارچێوەی ئاگاداریو زانیارییان فرەوانتردەکەن.

لە هەڵبەستی(باخ)دا ل — ٣٩ هەستی گیانلەبەر خۆویستنو جوانی ناسی پێشان منداڵان دەداتو فێریان دەکات کە لە باخی ناو ماڵدا کاربکەن.

**هەنگی باخ ناوروژێنم پەپوولە ناتۆرێنم**

**باخەوانێکم بۆ خۆم خزمەتی وا لە ئەستۆم**

هەرچی هەڵبەستی(بۆق)ە ل٤٠ ئەوە بۆ قۆناغی یەکەمی منداڵی لە ٢ تا ٥ ساڵە دەست دەدات، لەم قۆناغی زووەدا ئەو بووکڵانەی منداڵ یارییان پێ دەکات، ئەو کەلوپەلانەی بەکاریان دەهێنێو ئەو گیانلەبەرانەی لە نزیکیەوە دەژین کەلێنێك لە جیهانەکەی داگیردەکەن. بۆقیش وەکو(کۆتری پەڕبەپێو چۆلەکەبۆر، جووجەڵەو ڕێوی، بەرخۆلە) لەو گیانلەبەرانەیە کە سەرنجی منداڵ ڕادەکێشێت. کێشی حەوت بڕگەیی ئەم هەڵبەستە کێشی گۆرانیە فۆلکلۆرییەکانی کوردەوارییە، ترپەو دەنگی وشەکان، بەتایبەتی دووبارەبوونەوەی وشەگەلی: بۆق، قورباقە، قیڕەقیڕو دەنگی قەبەی قاف لەمانەو لە وشەی لاقو زەقدا، وەکو گۆرانیی منداڵانی گەڕەك، منداڵ بە ئاسانی دێتەبەریو دەیڵێتەوەو ترپەی مۆسیقاکەو دووبارەکردنەوە کە دەستەبەری ئەم کارەنو منداڵ لەو تەمەنەدا زۆر گوێ بە مانای ناوەڕۆك نادات[٢]، با بۆقیش سەرزل و چاوزەق

---

[٢] الاتجاهات الجديده فى پقافه الاگفال، النادى الپقاق العربى/ بيروت، ل ٨١.

نەبێتو سەری درێژکۆلەو باریكو چاو دەرپۆقیو بێت، ئەو(واتا منداڵەکە) هەر بەدەم ئاوازەوە دەڵێ:

**قیڕ قیڕ قوڕباقە بۆقی سەرزل چوار لاقە**

**بۆق بۆق، بۆقیلە سك سپی، چاو زەقیلە**

هەڵبەستی دراوسێ(ل ٤١) ناوماڵ(ل ٤٣) خووی خراپ( ل ٤٤) بریتین لە ئامۆژگاریکردنو پیشاندانی هەندێ کارو کردەوەی خراپو داواکردنی وازلێ هێنانیانو گشتیان نرخی بەرزی ڕەوشتی کۆمەڵایەتی دەنوێنن. لە هەڵبەستی(دراوسێ)دا ئەوەی چاکە تاکو ڕەوشت پیشاندانەکە نەبێتە فەرمانو ئامۆژگارییەکان باس دەکات:

**دوێنێ مامۆستا عوسمان قوتابیەکانی وەستان**

**ئامۆژگاری دەکردن قەدری دراوسێ بگرن**

ئەمانە زیاتر ڕووتێکردنو هۆنینەوەو قافیەدارکردنی ڕستەی ئامۆژگارین.... خەیاڵ و وێنەی شیعری وایان تێدا نییە کە هەست و سۆزی منداڵان ببزوێنن.

یەکێك لەو بابەتانەی کە شایانی جیهانی منداڵانە، بابەتی وەرزشە، هەڵبەستی(بۆڕبۆڕێن) نموونەیەکی یاریکردنی بە کۆمەڵی منداڵانەو هاندانی پێشبڕکێیە لە غاردان.

شیعرەکە وەکو گوڕو تاوی غاردان پڕ لە هەراو بزوتنەوەیەو بە چەند ئامرازێکی ڕێزمانی جووڵەو هاندانی زۆرجوان دەربڕیوە، وەکو:

- (با) بزانم کێ بە گوڕە؟
- (دەی) هەڕاکەن!
- (هەر) کەس ئامادە ڕاوەستێ.
- (ئەوا) ئەڵێم یەك ... دوو.. سێ.
- (وا) ئاسۆ کەوتە پێش هەموان.
- (ئەی) ئافەرین!

ئەمانە بەڵگەی هونەری زمان بەکارهێنانو چوونە ناو کۆڕی ئەدەبیانی منداڵانی فەرەیدون پیشان دەدەن.

هەر لەم بابەتە شیاوەش بابەتی هەڵبەستی(باخی جانەوەران)ە کە چوارچێوەی زانیاریی منداڵان فراوانتر دەکاتو خەیاڵیان بۆ لای ئەو گیانلەبەرانە دەبات کە نەی دیتوون، ئەوانەی لە باخی گیانلەبەراندا هەیە.. ئەم جۆرە باخەش لە ژینگەی کوردەواریدا نییە.

کاك فەرەیدون بەگشتی لە هەڵبەستو لە چیرۆکەکانیشیدا ژینگەی کوردەواریی ڕەچاوکردووە، بەتایبەتی ژینگەی لادێو کۆڵانەی گەڕەکە کۆنەکان. زۆر دیمەن هەیە لەوانەیە لە دوارۆژێکی کورتدا نەمێنن.

لە هەڵبەستێکدا(ل ٤٦) دەڵێ:

**من منالّم، دڵ ناسکم ئێسك سووکم، کارئاسکم**

**سوێسکەو بارەکەوی شاخم پەپوولەو بولبولی باخم**

ئەم جۆرە هۆنینەوەیە سەردەمێك لە کوردەواریدا باوبوو، شاعیران دەهاتن بە زمانی منداڵانەوە شیعریان دادەناو گوایا خۆیان دەخستە قاڵبی هەستوسۆزو لەشولاری منداڵانەوە، دیارە ئەمانە هەستو سۆزی شاعیرەکە نەك منداڵان دەردەبڕن، دەنا منداڵ بەخۆی نالێ: دڵ ناسكو کارئاسكو پەپوولەو بولبول. ئیدی دوای ئەم دوو دێڕە ژینگەی کۆمەڵی کوردەواریی(بەتایبەتی لای خەڵکی لادێو هەژاران) جاران دەردەخات کە زۆر پێویست بوو قوتابی ڕوو لە باوکی بکات:

**پێم بخوێنن، فێرم بکەن پەروەردەم کەن، تێرم بکەن**

**نەخۆش کەوتم دەرمانم کەن فێری ڕەوشتی جوانم کەن**

نەك هەستوسۆزی منداڵەکە ناگەیەنێ، بەڵکو بە زمانی منداڵەکەوە ئامۆژگاریی خاوەن منداڵان دەکات.

هەڵبەستی(باوك) ل٣٨ دەمەتەقێیەکە لە نێوان باوكو کوڕدا، هەر یەکە خۆشەویستیی خۆی بۆ ئەوی دی دیاریدەکات. وشەو دەربڕینو ڕستەکان باوو ناسکنو لە تێگەیشتنی منداڵ بەرەو ژوورترنین، ئەگەرچی هەندێ داڕشتەی مەجازی قورسیشی تێدایە، باوك دەڵێ: کوڕم من تۆم زۆر خۆش دەوێ

قەزات لە ماڵی من کەوێ

دێڕی دووەم ڕەنگ بێ بۆ خوێنەرو گوێگر کە منداڵانن ڕوون نەبێتو پێویست بەوە بکات مامۆستا بۆیان ڕوون بکاتەوە، ئەگەرچی ئەمە ئیدیەمێکی زمانی کوردییەو وەکو قسەی نەستەق گوتراوەو بەسەر زمانی نەوەی پێش ئێستاوە بووە، بەڵام نەو کەم دەبیسترێ. جاران یەکێك کە دوعای چاکەی بۆ منداڵان بکردایە دەیگوت:

- دەی قوربانە. قوربانی کوڕبم.
- قوربانی چاوت بم
- لە کاکتە.
- لە چاوی منت کەوێ.
- بەلاگێڕت بم. قەزات لە من کەوێ.
- لە دەورت گەڕێم.

وشەی(قەزا) ئەمڕۆ نامۆ حیسابەو کەمتر بەکاردێت. وەختی خۆی ئەم وشەیە هاوتای(بەلا) بەکاردەهاتو دەگوترا:؛ خوایە لە قەزاو بەلا بە دووربن. قەزاکە مەبەست چارەنووسی خوایییە لە قەزاو قەدەرەوە هاتووە. رستە نەستەقەکەش کە دەڵێ: قەزات لە ماڵی من کەوێ) مانای وایە بەلاو کارەساتی خراپ لە باتی تۆ بۆ من بێ با تووشی ماڵو سامانی من بێت.

هونەرێکی باشی ئەم هەڵبەستە لەوەدایە کە کورتەو درێژدانەدەمی تێدا نییە. ئەو دارشتە مەجازانەش وەکو:"تۆ گۆرانیی سەر زمانی، تۆ چرای ناو ماڵو تۆ باڵمی" لە هەڵبەستو گۆرانیو قسەی ناو کۆمەڵدا باوەو لەوانەیە منداڵ بە ئاسانی وەریگرێت. لەم هەڵبەستەدا شاعیر هەوڵیداوە ئەگەر لەبەر گیریی پاشبەند نەبێت(ئەویش جاروبار) وشەی نزیك لە تێگەیشتنو بەکارهێنانی ڕۆژانەی منداڵان بەکاربهێنێ. شیعرەکانیش کورتن، لە شێوەی دەمەتەقێ دانو هەوڵیداوە بە کەمترین وشە مەبەستی ناوەڕۆك دابرێژێت. کێشی هەڵبەستەکانیش کێشی خۆماڵییە کەم بڕگەو بزووتوو و بە زەمزەمەکانە.. دەق کێشی هەڵبەستی یاریو مەتەڵۆکی منداڵانە.

پیرێکی ریش درێژبوو:

لەم نامیلکەیەدا چوار هەڵبەستی تێدایە کە لە ئینگلیزییەوە وەری گێڕاونەتە سەر کوردی و ساڵی ١٩٨٥ بڵاوی کردوەتەوە. بەڕاستی هەڵبژاردنو وەرگێڕانی هۆنراوەو بڵاوکردنەوەی ئەم جۆرە هەڵبەستانە، هەنگاوێکی پێشکەوتووتری فەرەیدون دەنوێننو وا دیارە ئاسۆی روانینە هەڵبەستی منداڵانو تێگەیشتنی بنەما هۆنەرییەکانی فراوانتر بووە.

نووسەری شارەزای ئەدەبیاتی منداڵان(خومیسکی) دەربارەی شیعری منداڵان دەڵێ:"منداڵان خەیاڵێکی باڵگرتوو و بیری زۆری بەرجەستەیان هەیە، ئەوان کەیفیان بەو هەڵبەستانە نایە کە دەنگۆباس دەگێڕنەوە، بەڵکو کەیفیان بە هەڵبەستی قووڵ دێت. ئەم جۆرە هەڵبەستەش دەبێ دارشتن چاكو تەڕو بڕو پڕ لە وێنەی شیعری و ناوەڕۆك داهێنەرانە بێت. هەڵبەست کەشتیەك نییە(بەنموونە) ئامۆژگارییەکانی پێشڕەوانی(طلائع)ی پێ بگوێزرێتەوە! بەڵکو کارێکی هونەرییە، قسە لەگەڵ ژیریو شعوردەکات."[4]

ئەم هەڵبەستە وەرگێراوانەش پرشن لە خەیاڵی گەشو بیری وردو دیمەنی جوان جوان، بابەتەکانیان بە لای پێکەنینو گاڵتەوگەپدا دەشکێنەوە، چونکە منداڵ، بە سروشت، حەز لە دیمەنی سەیری پێکەنیناوی دەکات. لە ڕاستیشدا نابێ هەموو بابەتەکانی ئەدەبیاتی منداڵان چ هەڵبەستو چ چیرۆكو چ شانۆیی هەمووی هەڵوێستی بە ڕاستیی ڕووگرژو مۆنو ئەرکزانیو فەرمانبەری بێ ئاوڕدانەوەی دوور لە سەیرو پێکەنین بنوێنن، چونکە ئەم هەڵوێستانە لەگەڵ جیهانی منداڵاندا ناگونجێن. پێویستە کەسایەتیی منداڵان بە نەرمونیانیو ڕووخۆشی سنگ فراوانی نەك بە گرژیو ڕەقیو بەندەیی فەرمان ڕابهێنین.

١- پیرێکی ریش و درێژ بەدەست ردێنە درێژەکەیەوە داماوە. نازانێ چی بکات؟ چونکە کۆمەڵێك باڵدار هێلانەیان لەناو ریشەکەیدا کردووە؟

[4] ثقافة الاطفال، وزارة الثقافة و الاعلام، العراق، كتاب ١ -١٩٨٩

**٢- منداڵێکم سێبەرەکەی خۆی دەدوێنێ، تا پێکەوە سەمابکەنو بازبدەن، لەبەر ئاگری ئاگردان لەسەر دیوارێك وێنە بنەخشێنێ ئەو چی بکا، سێبەرەکەی لاسایی بکاتەوە.**

**٣- هەروەها هەڵبەستی(سابوونی لاسار)، کە لە گەرماوخانەدا منداڵ دەستی بۆ دەبات، لە دەستی ڕادەکاتو هەڵدەخلیسکێ. دەڵێی چاوشارکێی لەگەڵ دەکات.**

**سابونەکە فێڵی لێ دەکاتو لە بنکی تەشتە ئاودا خۆی دەشارێتەوە، بەلام نازانێ، ڕۆژ بە ڕۆژ تەنکتردەبێ!**

**٤- لەشیعری(تەنیا یەك دایك)دا شاعیر خەیاڵی منداڵ بە زەویو ئاسمانو باخو دەریادا دەگێڕێ، سەدان شتی جوانو خۆشەویستی پیشان دەدات؛ سەدان ئەستێرە، گوێچکە ماسی، چۆلەکە، بەرخۆلە، شەونم، هەنگ، سیپەڕەو پەپوولە.. ئەمانە بە سەدانو هەزارانن. بەلام یەك شت هەیەو لە هەموو شت خۆشەویست ترە ئەویش دایکە!**

**وەرگێڕ هەوڵیداوە لە وەرگێڕاندا شوێنەواری زمانی بیانی لابەرێتو بە کوردییەکی ڕەوانو بە کێشی خۆماڵی بیانکاتە هەڵبەستی کوردی. لەو بڕوایەدام هەڵبژاردنو بلاوکردنەوەی ئەم هەڵبەستانە ڕێ نیشاندانی هەنگاوی بەرەو پێشترە لە ڕێی بەرهەم هێنانی هەڵبەستی جوانو هونەری بۆ منداڵان.**

## هەشت هەڵبەستی گەلاڵە:

له ناو کاغەزو نووسراوەکانی مامۆستا فەرەیدوندا گەلاڵەی هەست پارچە شیعرم بەرچاوکەوت کە گشتیان لە ڕێچکەی ناوەڕۆك‌و شێوەی هەڵبەستە بلاوکراوەکانی دەرناچن. تەنانەت ناونیشانەکانیشیان وەکو(بەهار، بولبول، کارئاسك، هەنگ)ە کە ئەمانە پێوەندی خۆشەویستیی نێوانی منداڵ‌و گیانلەبەرانی دەوربەری پتەودەکەن‌و هەستی هۆگری و بەزەییی مرۆڤانەی لا گەشە پێدەکەن.

هەڵبەستی(کوڕە کوردم، لەدایك بوونی شیعرێك، هەنگ) خۆشەویستیی نیشتمان دووپاتدەکەنەوە. ئەوەتا لە هەڵبەستی(لەدایك بوونی شیعرێك)دا شیعر دەکا بە دەرمان بۆ دەردی نیشتمان‌و بەشداریی دەردەسەری‌و ناگزووری ژینی منداڵانی پێ دەکات.

له هەڵبەستی(هەنگ)یشدا سەرباری دووپاتکردنەوەی دۆستایەتیی نێوان منداڵ‌و ئەو زیندەوەرە چاکەی هەنگوینی شیرین بە منداڵ دەدات، شیعرەکە داوای کەش‌و هەوایەکی پڕ لە خۆشی‌و ئاشتی دەکات بۆ هەنگوکەو ڕێ نادات هەنگەکە زیزبکەن‌و شانەی لێ بڕووخێنن.

# چلەی مامۆستا فەرەیدوون

## سلێمانی ڕۆژی ١٩٩٢/١/٢

ەو بابەتانەی لە چلەی مامۆستادا لە سلێمانی
خوێندرانەوە، یاخود بۆ چلەکەی نوسراون

برای خۆشەویستم کاك شیروان/ بەڕێز

سڵاوێکی گەرم

زۆر بەداخەوە، بیستم کە کاك فەرەیدوون/ عەمری خوای کردووەو تەمەنی درێژی بۆ ئێوەو منداڵەکانی و کەسوکاری بەجێ هێشتووە.

پڕ بەدڵ هاوبەشی خەمتانم: هیوادارم خوای گەورە نیشتەجێی بەهەشتی نەمری بکات و بەئێوەش سەبووری بدات و لەهەموو قەزا و بەڵایەك بتان پارێزێت.

زۆریش بەداخەوە کە ناتوانم بێمە تەعزیەکە، بۆیە هیوادارم لوتف بکەن لە جیاتی بەندە سەرەخۆشیی لە مادامیی و منداڵەکانی و کەسوکارتان بکەن و هەر خۆشبن و خۆتان خۆشبن و هەر بژین بۆ

برای دڵسۆزتان

مام جەلال

١٩٩١/١١/٢٧

# لەچلەی قەڵەمێکی کەڵدا

شێرکۆ بێکەس

من خۆم نایڵێم(گۆیژە) ئەڵێ:
ئەمە چلەی کۆچی بازێکی پەڕووباڵ سپیی بەرزەفڕی بە چریکەی
نێو مێژووی هەتاو و سێبەرمە. من خۆم نایڵێم(ئەزمڕ) ئەڵێ:
ئەمە چلەی سەفەری گەواڵە هەورێکی عاشقی بەندەن و دەوەن و
ڕەوەزی سەر منە.
عاشقێ، سەودا سەرێ، شەیدایەك
کە هەر لەچاوکردنەوەی وشەیەوە
لە فامکردنەوەی قەڵەمی هزر و هۆشیەوە
ئاوێزانی گەردنی بەرزی زمانە شیرینەکەی کوردی و
باڵای خۆرەتاوی ئەم کوردستانە چاو سەوزە شۆخ و شەنگەبووە.
من خۆم نایڵێم، گردی مامەیارە ئەڵێ:
ئەم سوارەمان سوارێکی قژڕەشی مل کەڵی ئاوەزەنگی تەقێنی
بەرکاوی هۆرەی کوردایەتی بووە.
ئەستێرە نەوەیەکی بەجریوەی دارەکەی(ئەلیاسە قوجە)یە،
ئەو باپیرە گەورەیەی کە لە قەڵاچوالانی دوانزە سوارە و هەواری
جوامێرانەوە، لەگەڵ یەکەم کاروانی بەڕێکەوتوودا هات و
ئەویش بەردێکی بناغەی ئەم شاری داستانەی دانا.
تانجەرۆی خۆشەویستی نالیی
تانجەرۆی فرمێسکی درێژی ئەم مەڵبەندە سەرومل قرمزییە
ئەڵێت و من ناڵێم: ئەمە چلەی ئەو کوڕە زرنگ و
مەردەیە کە لە لانکەی شیعرە ئازاکانی کاکە فایەقیا، فایەق

بێکەسی ئامۆزا و مامۆستادا چاوی بەهرەی پشکووت و بۆ یەکەم جار
لە ئاگردانی هۆنراوە بەکڵپەکەی(ئەی وەتەن)ی ئەوەوە
ئاگری کوردایەتی بەربووەگیانی و ڕایچڵەکان و هەژاندی و دواترکردی
بە چراخانی نێو شەوی تاریك و نووتەك و چاو چاو نەبینی ئەم
ڕێوبانە بەژەنگ و ژار و تەمتوومان و تووناوتوونەی کوردستان
سووتانی و کردی بە مۆمی کافوریی سەرگاشە بەردەکانی
سیوەیل و بەگوڵ ئەستێرەی کاکۆڵی دار و درەختی ئالان و
بە شاهۆیەکی ئاسمانی ئەرخەوانیی ماوەت.
من خۆم نایگێڕمەوە – پیرەمەگرون – ی مووقەدەس ئەیگێڕێتەوە و
ئەڵێت: ئەم کوڕە قژڕەشە ڕۆح سووکە خوێن گەرمە دەم و پل
شیرینەم، ئەم دارقەزوانە ڕەنگ پیرۆزەییەی دەروونم، ئەم
ڕنووە بەفرەی سەرشان و ملم، هەر لە منداڵییەوە، قسەی
دانار داناری لە گوڵ هەناری بەژن سووری گوێ جۆگەی دامێنی من ئەچوو.
باڵای زیرەکیی ئەم جگەرگۆشە ئازیزەم لە باڵای تەمەن و لەشی هەڵکشاوتربوو.
ئەو وەختەی پێی نایە گوڵجاڕی هەرزەکارییەوە
ئەتوت: گوڵ خەندەرانێکی بەدەم باوەی، لێو بەخەندەی، زیوینی
بن بنارمە، ئەتوت: گوڵەبەڕۆژەیەکی دڵداری خۆرە. ئەتوت:
جوانوویەکی چوارپەل سپیی بزۆزی پێدەشتی نێو گیان و ڕۆحی
شارەزوورمە.
ساڵانە لەگەڵ یەکەمین تلەتلی بڵێسەکەی نەورۆز و
سەرهەڵدانی یەکەمین چڵە نێرگز و سوورهەڵگەڕانی گوڵاڵەدا
ئەمیش بیری گەشتر و کوانووی سنگی بەتیف وتاوتر و مێرگی
تەمەنی بۆن خۆشترئەبوو.
کاتێکیش بووە مامۆستا و لەبەر تەختەی ڕەشدا ڕاوەستاو
کلۆ تەباشیر بەدەستی چەپەوە و بەنێوان ڕیزە کورسیەکانی پۆلدا

کەوتە هاتوچۆ ئەمبینی:
چاوەکانی دووئەستێرکی زیرەکی و وشیاریی بوون و وەك شەپۆلی
بەر هەتاو شەوقیان ئەدایەوە.
"پیرەمەگرون درێژە بەقسەکانی خۆی ئەداو ئەڵێ"
ئەم هەر مامۆستای وانە ئاساییەکانی نێو قوتابخانە نەبوو.
بەڵکوو مامۆستای ئەو وانە نەهێنیانەش بوو کە لەنەوەکانی
کورد قەدەغەکرابوون، ئەم دەمامکە ساختەکانی دائەماڵی و
ڕووی ڕاستەقینەی من و شاهۆ و ئارارات و گومی وان و
باخەکانی قامیشلی ئەخستەوە پێش چاوانی کوروکاڵانی.
لەیەك کاتدا بەخۆشەویستیی مەهاباد و کەرکوك و دیاربەکر گوڵبارانی ئەکردن.
من خۆم نایلێم و ئەستێرەی سیوەیل ئەیگێڕێتەوە و ئەڵێ:
ئەوکاتەی نووکی قەڵەمیشی لە ڕووناکیی بیر و هۆشدا
کەوتە چینەو وشەکانیشی کەوتنە قاسپە قاسپ، ئەم
کەوێکی دەنگ خۆشی لاپاڵی لاپەڕەکانی ڕۆژنامەی
(ژین)بوو. لەو سەردەمەدا، وتارە نەوازە و دڵگیرەکانی
مامۆستا(ف) ، خوێنەران وەك ڕەشە ڕێحانەی
هەڵچوو بۆنیان ئەکرد و وەك نانی گەرم چاوەڕوانیان ئەکردوو
وەك بەهاری(کانی با) و(تووی مەلیك) بە پیریەوە ئەچوون.
من خۆم نایلێم و گڵەزەردەی بە عەشقی مانگ زەرد هەڵگەڕاو
ئەو ئەڵێت: لە ڕۆژگارێکدا کە نەخشەی عێراقی ساختەی
دزێوی کوردستان قوتدەر، سنووری دەستکردی شمشێر ئاسا،
لای زۆربەی خوێنەرانی ئەو سەردەمە بووبوون بە بیردۆزو
حەقیقەتێکی جێگیر و ئایەت و دەست بۆ بردنیان کفرێکی کورد
کوژانەبوو، لە ڕۆژگارێکدا کە بیری کوردستانیی وەك یەك
مەسەلەی ئایدۆلۆژی، نەك چەند مەسەلەیەك، دڵدارانی کەم و

بە پەنجەی دەست ئەژمێردران، فەرەیدون عەلی ئەمین، لە نێو دەستەی
ڕوناکبیرانی ئەو دەمەدا لاوێکی مەشخەڵ بەدەستیان بوو، ڕابەرێکی
چاوقایمی بیری کوردستانیی و سەرەمێرێکی کەڵی شۆڕشگێڕو
زریانێکی هەڵکردووی دەربەندی بیروباوەڕی کوردایەتی بوو،
من خۆم نایڵێم و دوندی(کەتوو) ئەڵێ: کاتێکیش بۆ یەکەمین
جار لە مێژووی تازەماندا، مرۆڤی پێشمەرگەی کورد، لە دەربەندی
بازیان و هەناوی بەردە قارەمانەوە سەری هێنایەوە دەرێ و
هەڵسایەوە سەرپێ و دیواری بێدەنگیی ڕوخاندەوە و زەمینی لە ژێر
پێی داگیرکەراندا تەقانەوە، ئا لەو دەمەدا، بوون بە پێشمەرگە
لە نێو ڕوناکبیراندا لە ئەڵماس دەگمەن تربوو. هێشتا سەرەتای
چنگ نانەچنگی شۆڕش و ژێردەستیی بوو، کە فەرەیدون عەلی ئەمین،
گفتار و کرداری جووتکردوو بوو بە هەڵۆی کێوان و دڕیدا بەشەوەزەنگ و
بوو بە کازیوەی مزگێنیی ئازادیی و ژیان!
من خۆم نایڵێم و شەهیدێکی سەیوان ئەڵێت:
خوێندکارێکی پۆلی بەردەستی مامۆستا(فەرەیدون عەلی ئەمین)بووم
ئەو لە گۆمی پیرۆزی کوردایەتی هەڵکێشام و یەکەمین وانەی
عەشقی سەربەستی و سەربەخۆیی پێوتم و – ئینجا بە بست بە بستی
نەخشەی ئەم کوردستانە ئازیزەدا منی گەڕان و چیرۆکی ڕەگ و ڕیشەی
خۆمی لە میدیاوە بۆ گێڕامەوە تا ئەگاتە سەر چریکە و هەڵمەتەکانی
ئاوباریك و دەرسیم و سەقز و تا پەتەکەی ملی قازی و هەر
ئەویش مەلاشووی بە شیعری حاجی و بێکەس و گۆران هەڵدامەوە و
دەرگای مێشکمی لەسەر هەتاوی ئازادیی کردەوە، ئەوسا ئیتر
منیش ئەو چراوگەی دەستی ئەوم وەرگرت و کەوتمەڕێ، کاتێکیش
لە بەرە بەیانێکی تەماویدا لە بەندینخانەی موسڵ چوومە
بەرپەتی سێدارە.. لەبەردەم مردنیشدا، هەر ئەو سروودەم

وتەوە کە بۆ یەکەمجار مامۆستام فەرەیدون عەلی ئەمین فێری
کردبووم.
من خۆم نایڵێم و منداڵانی زەرد و سووری وڵاتەکەم ئەڵێن:
شیعر و نووسینەکانی بابە فەرەیدون بۆ ئێمە لە نوقڵی ترش و شیرین
خۆشتر و، لە هەنگوین و گەزۆ شیرین تروو، لە فڕفڕۆکەی
ڕەنگاوڕەنگ جوانتر و لە بووکە شووشە چاو شینەکانمان ئێسك
سووکتربوون، ئەو قسەخۆش و بەتام و ئاودار و ئەو حیکایەتە
باڵ نەخشینانەی ئەو بۆی ئەکردین، دڵی بچووکی ئێمەی،
وەك پۆلە کۆتر لە ئاسماندا هەڵئەفڕاند. ئەیخستینە سەر شاباڵی
پێکەنین، لەگەڵماندا ئەدوا و ئەدوا و ئەدوا و وەڕس نەئەبوو.
وەك چۆن پەپوولە لە گوڵ، مانگەشەو لە گۆم، درەخت
لە کلووی بەفر، گژوگیا لە پرژە پرژی تاڤگە وەڕس نابن،
ئەویش ئاوا لە ئێمە بێواز و بێتاقەت نەئەبوو. ئەو دەروونی
ئێمەی لە باوك و دایکمان چاکتر ئەناسیی. ئێمە پاڵەوانانی دواڕۆژەکەی
ئەوین.
ئەی مامۆستا و هاوڕێم!
دووئاوانی ڕوونی گیانی هەردووکمان لە دەمێکەوە تێکەڵ
بە یەکتربوون، لە سەرچاوەی خزمایەتییەوە بۆ ڕووباری
فیکر و ساماڵی ڕوانینی چونیەکمان. بۆ یەکەمجار تۆ بووی
لە سێ دەرییەکەی ماڵە گەورەی بابە حاجیماندا، قسەت
بۆ کردم و شیعرەکانی باوکمت دایەوە بەگوێمداو، دواتریش
لە شانەی خەباتی نهێنیدا یەکمانگرتەوە، تۆ چرای دیوارکۆ و،
من شیعرێکی تازە پێڕەوکەبووم، ڕۆژهات و چوو، جارێکی
تر لە ئەشکەوتەکانی پشت(ماوەت)دا و لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا
دەستمان کردەوە ملی یەکتر. ڕۆژگارهات و ڕۆژگارچوو.

ئاگردانی خۆشەویستیی نێوانمان ساردبوونەوەی بە خۆیەوە نەدی.
ڕۆژگارهات و ڕۆژگارچوو. دوای نوشوستی شۆڕشی ئەیلول،
کاتێ یەکترمان بینیەوە، سەردەمێکی تاڵ و تار و ماربوو،
چەقۆیەك لە کوردستاندا نەمابوو، لەم سەر تا ئەو سەری ئەم نەخشەیە
تاریکستان بوو. وەختێکیش هەڵۆ سوورەکان چوونەوە شاخ
یەکترمان بینیەوە وتت"ئەوانە شەرەفی کوردیان کڕیەوە"
لە سەرەتای هەشتاکانیشدا، هاوین بوو، لە چیمەنەکەی ماڵی
خۆتاندا قەسیدە درێژەکەی(داستانی هەڵۆی سوور)م بۆ خوێندیتەوە
لە دواییدا پێت وتم"ئەمە بازدانێکی گەورەیە لە تاقیکردنەوەی
شیعری نوێی تۆدا" تۆ ئەوکاتەو چەند ساڵێ پێشتریش لە ژێر چەتری
پەیوەنداریی هیچ پارتێکدا نەمابوویت، بەڵکوو ئاسمانی کوردایەتی
چەترە گەورەکەی سەرسەری تۆبوو. هەموو پێشمەرگە و تێکۆشەرانی
بیری کوردستانیی لە هەر سەنگەرێکدابووبن خۆشەویست و ئازیزی تۆبوون
لەم دواییەشدا وەك هەر جگەر سۆزێکی ئەم خاك و ئاو و دار و بەردە،
ئەم گەلە ستەم دیدەیە، بەرەی کوردستانیی، تەبایی و یەکێتیی هەموو خەباتگێڕان
قەڵای هیوا و جێگەی ئومێدی گەورەی تۆ بوون.
بەر لە کۆچی ناوەختیشت... بە چەند ڕۆژێ
بەر لە سەفەری سەیوانت... بە چەند ڕۆژێ
بەرلەوەی وەك ئەستێرەیەك بپژێییتە
باوەشی ئەم مێژووە سورەمان و، بە چەند ڕۆژێ خۆش بەختانە
شەو و ڕۆژ پێکەوەبووین، ئەوکاتەی بێ دوودڵیی بڕیارتدا لەگەڵ
نووسەرانی سلەیمانیدا بە شداریی کۆنگرەی ڕاپەڕین لە شەقڵاوە
بکەیت، تۆ ئەو تاقە قەڵەمە چاو نەترسەبوویت کە جێنیشتەی
بەغدایش بوویت و بەڵام هەنگاوت لەگەڵ هەنگاوی ئێمەدابوو،
هەڵوێستت لەگەڵ هەڵوێستماندا بوو. دڵەڕاوکێ و ترسی گەڕانەوەی

ئەو سەرت بۆ بەغدا فڕێدایە ناو باخەکانی شەقلاوەوە.

کاتێکیش بۆ دواجارماڵئاواییمان لە یەککرد وتت"ئیتر بەغدا بۆ من نابێ و ئەمجارەیان بە ئێجگاری ئەگەڕێمەوە".

من خۆم ناڵێم و کوردستان ئەڵێ

فەرەیدون عەلی ئەمین:

دارسنەوبەرێکی هەمیشە سەوزی زاویتەی منە.

چەمی خوڕخوڕە و دار گێلاسێکی ورمێ و

هاوارێکی دیاربەکر و

مانگێکی شینی مێژووم و

لە گۆیژەیشدا دەم و چاوێکی هەمیشە دیاری

هەر چوار وەرزی ساڵی منە!.

## براوخوشکانی ئازیز

ئەدیب و ئەدەب دۆستان، کەسوکار و هاوڕێیانی مامۆستا فەرەیدون. گەلێکجار قەڵەم لە پێشی کارەساتێکی جگەربڕ و بەخورپەدا تووشی باران بڕانی نووسین و، هەنگاوی ووشەیش لە بەردەم بڕینی چیایەکی سەخت و سەرکەشا هەناسەسوار و شەلاڵی ئارەقەی ماندووبوون دەبێت. ووشەکانی منیش هەر لە سەرەتای ئەم کسپە ناوەختەدا بوونە ژاوەژاوێکی بێمانای ناوسەرم و قەڵەمەکەیشم لە پەنجەکانم تۆراو پێی ووتم: تۆ ئەتەوێت چەمەری بورکانێك بگێڕی و فرمێسك بۆ بوومەلەرزەیەك بڕێژی، بۆیە هەناسەت بڕناکات و لێزمەی چاویشت ئەدەنە قاتوقڕی. منیش هەربەدەم ئەو هەنسکانەوە پێمووت:"براله.. من کوردم و قاڵبووی مەینەت و زامی بەسوێ و فرمێسکی هەرگیز نەبڕاوەم، تاپۆی خەمەکانم سەرباری قەباڵەی خەمەکانی هەمووونیایەو، لووتکەی ئازارەکانیشم لە هەموو لووتکەکانی ئەم گەردوونە هەڵکشاوترە. با ئەم خەمەیش کلووی بەفری گەواڵە هەورێکی سپیبێ و داکاتەسەر کەندولەندی ئەو لەشەبریندار و بەخوێن شەلاڵەی کە گەردیلەیەکی تیانەماوە سەدانجار نووکەشمشێر نەیجنیبێ و هەزاران جاریش نەکولابێتەوە، خەمەکانی ئێمە لە بەهاری هەمیشەسەوزان و نەخۆری هاوینیان لێهەڵدێ و نەبایەکی خەزان هەڵیان دەوەرێنێ، ئەگەرچی میللەتی بێخەم لە پەپوولەی بێ چرا دەچێت، نە لە پەنایەکا ئارام دەگرێت و نە بەعەشقیش دەسووتێ.

لە کۆتایی ساڵەکانی پەنجادا مێردمناڵێکی عاشق بە ئەدەب و شاگردێکی هێشتا ناسەقامگیربووم، بەڵام هەموو ڕێبوارێك چاویشی ببەستیەوە هەڵەت لە نەرمان و، هەوراز لە تەختانی جیادەکاتەوە، منیش کە نووسینەکانی مامۆستا — ف — م لە ڕۆژنامەی ژیندا ئەخوێندەوە هەستمکرد ئەم زمانە لە گەلێك زمانی دی پاراووڕەوانترەو، باسەکانیش بەبڕشت و دەوڵەمەندن.

ئیتر لە هەر شوێنێکدا چاوم بە نووسینی ئەو مامۆستا – ف – یە بکەوتایە پێش باسەکانی ترم دەخستو، وەك شاگرد لەبەردەم مامۆستاکەیدا بە چۆکادەهاتم بۆ ئەوەی لە زمانی ئەدەب و بیرو باوەڕەکەیەوە شتێك فێربم.

زەمان هاوڕێیەتی من و ئەو مامۆستا گەورەیەی درەنگ خست، بەڵام کە یەکیشمان ناسی پێش هەمووشتێك مەسەلەیەکی هێند جەوهەری یەکیخستین کە جاری واهەیە دەیان ساڵی هەندێك تەمەنی هاوڕێیەتی ئەو پەیوەندیە جۆش نادات و ئەو ئاگری خۆشەویستیە هەڵناکات.

ئەوەیش ڕێگا پیرۆزەکەی نەتەوە خۆشەویستی و دوژمنایەتیە سەرسەختانەکەی داگیرکەر و نەیارانە. ئەمە سەرباری ئەو خۆشەویستیەی کە لە دیدی ئەدەبیەوە پێکیەوە گرێ داین.

من لە چاوی کاك فەرەیدوونا تەنیا درەوشانەوەی خۆشەویستی ئەم وولاتەم ئەبینی، لەسەریا بیروباوەڕێکی پتەوی کوردایەتی پێشکەوتنخواز، لە هەناویا مۆمێکی داگیرساو کە هەرگیز دەستی کوژاندنەوەی ناگاتێ و، لە سنگیا بەیازێکی سپی بێگەرد کە بە ووشەی ڕەنگاڵەیی لێواو لێوبوو، ووشەکان هەندێجار سادەوساکاریی منالێکی تەمەن هەشت نۆ ساڵی بوونو، جاریتریش ئەبوونە ئاسکە سرك و بزێوەکانی ساراتووناو توونەکەی نالی و مەحوی و ناسکی و جوانی گۆران و ڕەوانی و بێخەوشی پیرەمێرد، جاریوایش هەبوو باڵە بەرزەفڕەکەی شیعری بەرەو خوار دادەکشا تا لە دەشتە نەرم و نیانەکەی زمانی پەخشاندا چیرۆك و ڕەخنەو نووسینی تری پێدادەڕشت.

مەرگی مامۆستای گەورە و هاوڕێی ڕێگاو قەڵەممان کاکە فەرەیدون ئەمەندە کوتوپڕو ناوەختبوو کە لەنگەری هەموومانی تێکدا تۆبلێی کاك فەرەیدون بەڵێنی ئەوەی بە وولاتەکەی دابێت کە ئەگەر ڕۆژێك لە ڕۆژان بە ئازادی ببینێ و چاوی قێزەون و دزێوی بێگانەی تیا نەبێت گیانی خۆی پێببەخشێت؟ تۆبلێی شاگەشکەی ئەوە نەبووبێت کە لە هاتنەوەی ئەمجارەیدا لەباتی دەموچاوی پۆستاڵ ئاسای داگیرکەر لە شارە سەربەرزەکەیدا ڕووی گەش و بەبزەی پێشمەرگە و ڕۆڵە تێکۆشەرەکانی

دیبێت؟ بەڵام خۆبرا گەورەکە... هێشتا کاروانی سەرفرازیمان نەگەیشتبوە دوا مەنزڵ و ئاواتە هەرەمەزنەکەت نەهاتبووەدی، ئەی پەلەی ئەم کۆچەت چیبوو؟

لە کۆنگرەی ڕاپەڕینی ئەدیبانی کوردا کە ئەمساڵ لە شەقڵاوا بەسترا تاقە نووسەرێکبوو کە لە بەغداوە هاتبێت و، ئەمەندەشیی پێخۆش بێت کە زەردەخەنەی شادی لەسەرلێوی نەڕەوێتەوە. هەر ئەو کۆنگرەیەشبوو کە لە هەر کاتێك زیاتر شەو و ڕۆژی ئێمەی بەیەکەوە بەست و هەمیشە پێکەوەبووین، ئەگەرچی نەخۆشیەکەی هانگاوەکانی سست و لە جارانی کورتترکردبوو، بەڵام هێزو توانای گیانی و عەشقەگرگرتووەکەی باوەڕی کوردایەتی هەر لە کڵپەو بڵێسەدابوو. هەموو جارێکیش پێی ئەوتین: "ئێمە قەرزاری ئەوانەین کە دەرپێی کوردیان هەڵکێشایەوە و دیسان شۆڕشیان هەلگیرساندەوە.

لەم چلەی ماتەمینەدا کە بۆ مامۆستای گەورە و هێژامانی دەگێڕین بەناوی یەکێتیی نووسەرانی کورد لقی سلێمانیەوە، پڕ بەدڵ سوپاسی ئەو لایەن و کەسانەدەکەین کە هاریکاریان لەگەڵداکردین بۆ سازدانی، یەکێیی نووسەرانی کورد گەلێك بەداخە کە قەڵەمێکی کارامەو ئەدیبێکی نەترس و بوێری لە کیس چووە، یادی ئەو پیاوە جوامێرە لەویژدانی هەموو مرۆڤێکی خاك و گەل خۆشەویستا ئەژی و بەسەر زمانی هەموو قەڵەمێکی شەریف و سەربەرزەوەیە. سەرەخۆشی لە خۆمان و لە خێزان و کەسوکار و هاورێیانی دەکەین، درووود بۆ گیانی نەمری کاکە فەرەیدون و هەرشەکاوەبێت بیروباوەڕە هەمیشە زیندوەکەی، خۆشی و سەربەرزیش بۆ ئێوەی ئازیز کە ئامادەی ئەم کۆڕەبوون و هەربژین.

١٩٩١/١٢/٢٩

**رووف بێگەرد**

# ماموستا فەرەیدوون شۆڕەسواری مەیدانی ئەدەبی منداڵانی کوردبوو

سەرەتای ساڵانی حەفتا، بە کۆکردنەوە و، پێداچوونەوەی ئەو نوسین و بەرهەمانەوە خەریکبووم، کەوا بڕێك لە ماموستایانی خزمەتگوزاری ئەم نەتەوەیە بۆ منداڵانیان نوسیوە و، پەخشو بڵاویشیان کردۆتەوە، جا ئەو بەرهەمانە چ لە دوو توێی نامیلکەو کتێبی چاپکراودا بووبێت، یا لەسەر لاپەڕەی گۆڤار و ڕۆژنامە کوردییەکان بەدنیای منداڵ ئاشناکرابن.

ئەو دەمە پەڕاوێکی خنجیلانەو، ناوەڕۆك بەپێزم بەچاوکرد، کە بەڕاستی مایەی تێڕامان و، سەرنجدان بوو، ئەو پەڕاوەش(پاڵەوانی دوارۆژ بوو) کە بەدەست و خامەی ڕەنگینی هەردوو ماموستای هێژا و کورد پەروەر(فەرەیدون عەلی ئەمین و، عومەر عەبدولرەحیم) بوو کە ساڵی١٩٥٨یش لە چاپدرابوو، بەڵێ... تا ئەو ساڵانە لە نزیکەوە ماموستا فەرەیدوونم نەناسیبوو، وەك لە چاوی ئەو چەپکە شیعرە ناسکەی نێو دووتوێی ئەو کتێبەوە ناسیم، لێتان ناشارمەوە، ئەو کاتە چەند ساڵێك بەرودوا گەڕامەوە بۆ ئەو ڕۆژانەی کە لە ساڵانی شەستەکاندا ماموستای قوتابخانە سەرەتاییەکانی دەرەوەی شاربووم، زۆربەی ئەو هەڵبەستانەم لە دەمی منداڵانی گوندەکانی کوردستانەوە بەرگوێ دەکەوت، بەتایبەتی منداڵانی قۆناغی سەرەتایی، بەڕاستی. هەر ئەو وەختەبۆم دەرکەوتبوو کە ئەم هەڵبەستانە هەڵبەستی منداڵان خۆیانن و، بە ئارەزوو ویست و خواستی ئەوانیش دانراون و، لە دنیا تایبەتییەکەشیانەوە نزیکن و، لە جیهانی خەون و، خەیاڵ و، یاریکردن و، جمووجووڵی ڕۆژانەشیانەوە بەدەرنین.

ماموستا فەرەیدوون ساڵانێکی دوور و درێژی تەمەنی خۆی تەرخانکردبوو بۆ پێگەیاندن و، پەروەردەکردنی منداڵانی نەتەوەکەی. چ بەشیعرو، چ بەچیرۆك و، چ بە

لێکۆڵینەوە و، ڕەخنەو، دراسەکردنی.. دنیای منداڵ و، ئەدەبی منداڵ، خزمەتی دڵسۆزانەی خۆی کردووە.

به تایبەتی منداڵانی قۆناغی سەرەتای منداڵی، کە مامۆستای نەمر پسپۆرێکی لێهاتووبوو لە ناسینی باری دەروونی و سایکۆلۆژی ئەم قۆناغە ناسکەی تەمەنی منداڵی، کە هەموو کەسێك ناتوانێت لە بواری نوسیندا بۆیان سەرکەوتنی تەواو بەدەست بێنێت گەرچەکدارنەبێ بەزانستی دەروون شوناسی منداڵانی ئەم قۆناغەوە.

ئەمە سەرباری ئەوەش کە لە بواری ئەدەبیشدا مامۆستا فەرەیدوون دەست ڕۆیشتوو، خامە بەپێزو، دەست ڕەنگین بوو، ئەوەتا پەخشانەکانی.. ڕەخنەو لێکۆڵینەوەکانی شایەتی لێهاتوویی و، بەرزیی ئاستی ئەدەبی و، ڕووناکبیری ئەو دەدەن.

بەڕێزان شتێکی تازە نادرکێنم.. گەر بڵێم، هەموو خاوەن قەڵەمێك ناتوانێت لە بواری نووسین بۆ منداڵاندا سەرکەوتنی چاك بەدەست بێنێت، گەر بەڕاستی دڵسۆز و پەروەردەکار و، خزمەتگوزاری منداڵانی نەتەوە و نیشتمانەکەی نەبێت.

مێژووی ژیان و بیرەوەرییەکانی گەورە پیاوانی سیاسی و، پێشڕەوانی خەباتی ڕزگاری نیشتمانی و، کەڵە نووسەر و ڕووناکبیرانی دنیا، با بەنووسین و، لێکۆڵینەوەش لەسەر منداڵان و بۆ منداڵیشیان نەنووسیبێ.. بەڵکو بە شێوەیەکی دی خزمەتی منداڵانی نەتەوەکەیان کردووە و بەوپەڕی خۆشەویستی‌یەوە بایەخی تەواویان لە پێناوی پێگەیاندن و، پەروەردەکردنیاندا پێداون پێشیان لەسەرئەوە داگرتووە کە مرۆیەکی ساغ و سەلیم و هۆشمەند و هۆشیار بۆ سبەینێی خەبات... بۆ سبەینێی شارستانیەت و پێشکەوتنی ئادەمیزاد دروست ببێت، چونکە بەلایانەوە ئەرکی بەرەوپێشەوەچوونی ژیان دەکەوێتە سەرشانی ئەمانی پیاوانی ئەو سەردەم و ڕۆژگارە نوێیە.

من بێگومانم مامۆستا فەرەیدوونیش هەر لەم بۆچوون و، تێفکرینەوە، بەکردار و ڕەفتار، بەنووسین و تێکۆشان بەشێك لە ژیانی خۆی بۆ ئەم مەبەستە پیرۆزە تەرخانکردبوو.

مامۆستای ئەمر ساڵانێکی دوور و درێژ مامۆستای منداڵان بووە لە قوتابخانە سەرەتاییەکانی کوردستانداو، بەردەوامیش لە پێناوی گەیاندنی پەیامە پیرۆزەکەیدا شەونخونی و... ئازار و، ماندوبوونی چەشتووە و، وەك ڕابەر و، پەروەردەکارش دەوری خۆی بینیوە لەوانەیە هەر خۆشویستن و، لێ نزیکبوونەوە و، خواست و هیواو ئاواتە پیرۆزەکەی بووبێت کەوا نووسەرێکی دەست ڕەنگینی وای لە بواری نووسین بۆ منداڵاندا لێ دروست کردبێ.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لایەنێکی تری سەرەکی جگە لە خۆشویستن و، ناسینی منداڵ لە نزیکەوە و، تێکەڵاویی ژیانە سادە و پاکو بێگەردەکەیان مەرجێکی سەرەکی دی هەبێ.. بۆ سەرخستن و، پێشکەوتنی ئاستی هونەریی ئەو لە بواری نووسین بۆ منداڵدا، ئەویش.. بیروباوەڕێکی پتەو و سەقامگیرە بە نەتەوە و نیشتمانێکی ژێردەستەو ... چەوساوە، بێگومان خامەی نووسەرانی خاوەن بیروباوەڕی پێشکەوتوو هەمیشە دژی چەوساندنەوە و، زوڵم و زۆری نەتەوایەتی چەکێکی کوشندەیە بەڕووی گشت چەوسێنەر و، زۆردارێکدا.

هەر بۆیە بەو خاوەن قەڵەمانە دەوترێت، نووسەرانی شۆڕشگێڕ و، ئەدەبەکەشیان بە ئەدەبی بەرگری دەناسرێت.

من پێم وایە مامۆستایان(عبدولواحید نوری) و(فەرەیدوون عەلی ئەمین)... لە دوو ڕووی جیاواز و، لە دوو بۆچوون و ئایدۆلۆژیای جۆرا و جۆرەوە، بەنیسبەت گەلێکی ستەمدیدەی وەك گەلی کوردی ئێمە.. مایەی شانازیی ڕۆڵەکانی ئەم نەتەوەیەن و قەتیش لە بیرناچنەوە.

دیارە وەکو چۆن.. ئازەرییەکان شانازی بە شەهید(صەمەی بەهرەنگی) و، بولگارێیەکان بە(کرالیچیف) و، ئەڵەمانییەکان بە(بینۆبلۆدراو)... ڕووسییەکان بە(تۆسۆڤ) و) فەڵەستینییەکان بە شەهید(غەسان کەنەفانی)یەوەدەکەن، ئێمەش شانازی بەو مامۆستایانەوەبکەین کەوا تافی لاوێتیی خۆیان لە پێناوی پێگەیاندن و، گۆشکردنی منداڵانی نەتەوەکەیانەوە بەختکردووە، با هیچ نەبێ ناو بە ناو خۆیان و بەرهەمەکانیان لە کۆڕ و کۆبوونەوە ئەدەبییەکاندا بەسەربکەینەوە و، دامودەزگا

ئەدەبییەکانیش بەرهەمەکانیان سەرجەم بە شێوەی نوێ لە چاپ بدات و، لەسەریشیان بنووسرێ.

بەداخەوە ماموّستا فەرەیدوون زوو جێی هێشتین، من لەوباوەڕەدام گەر مەرگ وازوویەخەی نەگرتایە، ئەوا لەم سەردەمی ئازادی و، ڕاپەڕینەدا، بەرهەمی بەپێزتری دەخستەبەر چاوو دیدەی منداڵانمان.

لەم ساڵانەی دوایشدا کە من لە نزیکەوە تەواوناسیم و، لە بەغدا و... لێرە لە تەکیا دووسێ جار دانیشتم و، لە بارەی ئەدەبی منداڵانی کوردەوە قسەمان دەکرد، بە نیازبوو بەرهەمی تازەتر بخاتە بەر دەستی منداڵان و، چاونەترسانەتر بچێ بە گژ ئەو بەرهەمە کرچوکاڵ و... نووسینە بێپێزانەی کە لە پێناوی بازرگانێتیدا بەسەر منداڵی کوردیا ساغ دەکەنەوە...

دەبا بە هیوابین بۆ چاپکردن و، خستنە ڕووی سەرجەمی بەرهەمە ئەدەبیەکانی ماموّستا فەرەیدوون. دەبا بە هیوابین هەموو ساڵێك یادی نەمری و گەورەیی ئەو بکەینەوە.

**محەمەد رەشید فتاح**

**١٩٩١/١٢/١٩**

## دانیشتوانی خۆشەویست

خوشك و برایان

بەچاوێکی پڕ لە گریانەوە و بە دڵێکی پڕ لە پەژارەوە و بە ناوی بنەماڵەی خوالێخۆشبو فەرەیدوون عەلی ئەمینەوە بەخێرهاتنێکی گەرمتان ئەکەم و ئومێدەوارم کە هەموو لایەکتان تووشی هیچ خەم و ناخۆشییەك و دڵ تەنگییەك نەبن.

کۆچی دوایی کاك فەرەیدوون داخێکی گران و کارەساتێکی دڵ تەزینە نەك بۆ ئێمەی کەسوکاری بەڵکو بۆ هەموو هاوڕێکانیو برادەرانی و کەسانی کە ناسیبێتی، بۆ ئەو مامۆستا و ئەدیبە بەڕێزانەی کە زۆربەی ژیانی لەگەڵیانا بردۆتەسەر، کاك فەرەیدوون دەیوست بە هەموو جۆرێك خزمەتی میللەتەکەی بکات چ لەڕێگەی بەشداربوونی لە شۆڕشی کوردستاندا وەك پێشمەرگەیەکی ئازاو بلیمەت، لە ڕێگەی زمان و ئەدەب و مێژووی کوردەوە کە زۆربەی ژیان و کاتی خۆی بۆ تەرخانکردبو، لە ڕێگەی گۆشکردنی منداڵانی کورد بە شیعر و چیرۆکی هەمەڕەنگەو ڕەسەن و ئاماژەکردنی بۆ کوردستانێکی نوێ کە میللەتەکەمان تیایدا ئازاد و سەربەست بێت، جارجاریش لەڕێی ڕەخنەی ئەدەبییەوە دەستی لاوە ئەدیبەکانی ئەگرتو، بەرهەمەکانیانی هەڵئەسەنگاندن و بیروڕای خۆی دەرئەخستو هانی ئەدان بۆ بەرهەمی زیاتر و بەپیت، کاك فەرەیدوون وەك نیشتمان پەروەرێك ڕێگەی خەباتی نەتەوەیی پێشکەوتوخوازی بۆخۆی هەڵبژاردبوو، وەك نیشتمان پەروەرێك دەیویست ئامانجی میللەتەکەی بێتەدی و مافی چارەنووسی خۆی وەرگرێت و ئاڵای کوردستان شەکاوە بێت، ئیمانی بەڕێڕەوی دیموکراتیەت هەبو چ لەڕووی ڕامیاری و سەربەستی نوسینو دەرخستنیی بیروڕاوە، شاعیر و ئەدیبان و مێژوونوسانی کوردی خۆشئەویست و شانازی بە کەلەپوری میللەتەکەیەوە ئەکرد، تام و چێژی تایبەتی لە شیعرەکانی پیرەمێرد و گۆران و هەردی وەردەگرت، دژی ئەو نوسەرانە ئەوسا کەبەبێ ڕەوای حەق هێرشیان دەبردەسەر قارەمانی میللەتی کورد شێخ مەحمودی نەمر و شۆڕشەکانی، بەلام بەداخەوە نەیتوانی ئەو دراسە مێژووییەی کە لەم بارەوە دەستی پێکردبو تەواوی

بکات و مەرگ تەنی پێ هەڵچنیو خامەی شکاو ئەو ئاواتەی نەهاتەدیی کە لە مێژەوە خەونی پێوەدەبینی.

بە کۆچی دوایی کاك فەرەیدون کەلەبەرێکی دیاریکراو کەوتە دەرگای پەروەردە و ئەدەب و ڕۆشنبیریی و ڕەخنەی ئەدەبیەوە، کە هەر ئەدیبە لاوەکانمان دەتوانن ئەو کەلێنە پڕبکەنەوە.

سوپاسی گەرمی بنەماڵەی خوالێخۆشبو بۆ یەکێتی نووسەرانی کورد و گشت ئەو خوشك و برایانەی کە لە چلەی کۆچی دوایی کاك فەرەیدووندا ئەم کۆبونەوەیان سازدا، هەروەها سوپاسی گەرمی بێپایانی کەسوکاری خوالێخۆشبو بۆ هەموو حزبە نیشتمانیەکان و ڕێکخراوە دیموکراتیەکان و گشت ئەو خوشك و برایانەی کە بەشداری خەمیانکردین چ بە هاتنیان بۆ گۆڕستانی سەیوان و پرسەی خوالێخۆشبو ئەوانەی بەپرسەنامە سەرەخۆشی و بەشداری ئەم خەمە گەورەیان کردبوین، داواکارم لە یەزدان کە هەمووڵایەك توشی هیچ ئەشکەنجە و خەم و خەفەت و پەژارەنەبن و تەمەنی درێژی بۆ هەموو بەجێ هێشتبێ ئیتر خوشیو شادیتان ئاواتمانە.

**شیروان عەلی ئەمین**

**برای بەڕێز و ئازیزم کاك شیروان**

**لە پاش ڕێز و سلاو،**

**بە چاوێکی پڕ لە گریان و دڵێکی پڕ لە پەژارەوە، هەواڵی کۆچی دوایی براو هاوڕێی خۆشەویستم(کاك فەرەیدوون)م بیست. وەکو خۆتان ئەیزانن خوالێخۆشبوو، بۆ من گەلێك لە برایەك نزیکتر و خۆشەویست تر بوو، بەڕاستی لەدەستچوونی داخێکی گران و کارەساتێکی دڵتەزێنە و هەرگیز لە یادم ناچێ، من خۆم وەکو ئێوە و بگرە زیاتریش بەخاوەن پرسە ئەزانم و ئەبێ خەڵك سەرەخۆشی لە من بکەن، بۆیە نازانم چۆن و بە چ زمانێك سەرەخۆشی لە ئێوە و برایانی تر بکەم، خوا بە گەورەیی خۆی لێی خۆش بێت و سەبووری ئێوە و گەلاوێژخان و کاك جیهان و هەموو کەسوکاری تربدات، هیوام وایە خوادەست بەباڵی کوڕەکانییەوە بگرێت و ڕێوشوێنی باوکیان وننەکەن.**

**من، شەوی(٥/١٤)ی ئەم مانگە ئەم هەواڵە دڵتەزێنەم پێگەیشت، بەڵام ڕووی زەمانە ڕەش بێت کە لەم دوورەوە هیچ دەسەڵاتێکم نییەو نەخۆشی و سەرماوسۆڵەش بواری گەڕانەوەم نادەن، ئەگینا خوالێخۆشبوو گەلێك لەوە زیاتربوو کە من تەنها بە نامەیەکی سەرەخۆشی یادی بکەمەوە.**

**لە کۆتاییدا، لە خوای گەورە داواکارم سەبووری هەموو لایەکمان بدات و تەمەنی درێژی بۆ ئێوە و کوڕەکانی بەجێ هێشتبێ.**

**هەر بژین بۆ براتان**

**ئەحمەد هەردی**

**١٩٩١/١٢/١٨**

# بروسکەیەکی ڕەوا

**حەسیب قەرەداخی**

بەچ سەنگێ پیاو دەکێشن؟
بەچ دەنگێ پیاو بانگ دەکەن؟
بەچ مافێك گۆج و گەمژە پیاوی گەورە
بن ئاو دەخەن؟
کاك فەرەیدوون، من بە بڕوای کوردایەتی
تۆ دەکێشم،
بە هەنسکی فەرهەنگی خەم، وا لە نوێوە
ئەشکی گەرمت بۆ دەڕێژم.
من بە سۆزی پاڵەوانی دوارۆژی کورد
تۆ بانگ دەکەم،
بۆ کۆڵ و باری ئەم کۆچەت لە دەروونما جێ رادەخەم.
من دەمێکە ئەو گەمژانە رسوادەکەم..
لە پشتەوە پەڵی ووشەی بێ پێز و هێز
دەهاوێژن بۆ هەر مەزن
ئێوە شاسواری رێیەکن..
تەنها لەبەر ئالآی کوردا و
هەر بۆ بانگی ڕەوای مردن، دادەبەزن.

کە(تەرازوو) لاسەنگ ئەبێت
بێ دەنگی(هەڵوێستێ) کە زۆر گەورە

# پێشکەش بە مامۆستام
# (فەرەیدوون عەلی ئەمین) بێت

لەتیف قەرەداخی

هێشتا(پیت)م نەناسیبوو
(خەنجەر) لە(گۆشت) تێ پەڕیبوو
زۆرجار ئەگەیشت بە(ئێسقان)
بەڵام لای(تۆ) (سەر)دانەوان
لەو دەمە، بە ئاستەم نەبوو
خوێنە گەرمەکەت هەڵئەچوو
لەهاوارەکە هەڵئەسا
لە(گوند)ێکی پەنا ڕێدا
لە پانتایی، قوتابخانە
لە(میکرفوون)ی قێژانە
لەو ڕۆژە ڕەشەدا ئەتووت
ئەوەی نەمرێت تەنیا بۆ کورد
خاین و زۆڵ و نۆکەرە
ئەڵقە لە گوێی داگیرکەرە
...
زنجیر و کۆت نەیبەزانی
ئازار و سزا و لێدانی
هەتا(ووشە)یەك دەربڕین
(بەندیخانە) بوو، نان بڕین

(تۆ) لە ئاستی ئەو(مەزاتە)

(ووشەت) کڵپەی(گڕ)ی ئەگرت

بە ئاستەمێك(سڵ)ت نەکرد

(ئێمە)ی (زەرنەقووتە)ت فێرکرد

بۆ، وەرژان لە ڕووی دەزگا

لە(سروود)ی (ئەی رەقیبا)

دەنگمان گەیشتە کەشکەلان

لەگەڵ(ئێمە)دا ئەت ڤیژان

هەتا(دەرگا)یان لێگرتی

ئەی باڵدارە، دەنگ خۆشەکە

ئەو ڕۆژەی لە دەنگیان خستی

بۆ ئێمەی ئەو دەمەت نووسی

گەرجاری تریش بێمەوە

ئەم(بڕوایە) ئەگرمەوە

- - -

بەندیخانە، یەخەی گرتی

(کوردایەتی)یان نەکوشتی

هەر دەمێك هەڵئەسایتەوە

وەك(سوارە) ئەگەڕایتەوە

بۆ ناو سەنگەرەکەی مەیدان

ئەبوویتە پێشەنگی کاروان

- - -

کە پەنجە ئاڕاستەی(دڵ)بوو

زۆر(هەڵۆ) هێلانەی تێکچوو

لەگەڵ(ڕیوی) بوو بە قازی

هاوبیرانی، کوردایەتی
(کەنار)یانکرد لەمەیدانە
(سەنگەر)بوو، بە ئەو کەسانە
(مێش)بوون لە دەوری شیرینی
ووشەی(شۆڕش) ڕاپەڕینی
لە(فەرهەنگی) ئەوان نەبوو
مامۆستا لەدوای تێبینی
(قفڵ)ی لە دەرگای(ووشە)دا
جێهێشت محەکەکەی بڕوا
سەنگەری خەباتی چۆڵکرد
سەری بڵندی کزئەکرد
ووتی:- بۆ ئەمرۆ مابێ دەنگی
مانای ڕاستی، کوردایەتی

...

شێوەی(پەپوولە)یە هێمن
ئەفڕێت بێ ووشەیە وتن
بەووردی سەرنج ئەدا
لە هەندێکجار ڤین ئەڕژا
ڕەنگی جاران تۆرە نەبوویت
وەك(ئەی ڕەقیب)کەی(قەراخ)
بۆ ئەمجارەیان هەڵئەچوویت
بەڵام بۆ پاکی و بێگەردی
کەمن نەکرد، هەر گەورەبوویت
بە(بێدەنگیش) هەر گەورەبوویت

...

بەبێدەنگی بەجێت هێشتین
کام(ئازار)یان؟! بوو بە برین
(دڵ) و(لەش)ی دارزانی
ئەی دڵسۆزی کوردستانی
بەهەموو ڕەنگ ئەنجنکراو
ئەی(هاوبیرە)کەی ناو گەرداو
ئێمەش ڕێبوارێکی ڕێگەین
یەکا، یەکا بەدواتا، دێن
ئەگەر کەشتی لەنگەر بگرێ؟!!
گەر بڕیاری ڕاستی بدرێ
نەبەزیوو، بووی هەتا مردن
ئەی خاوەن هەڵوێست، ئەی مەزن

**سلێمانی**

**١٩٩١/١٢/٦**

# بۆ چلەی ماتەمی هاوبیر فەرەیدوون

**کامیل ژیر**

تەمەن هێشتا لە نێوانی سپێدە و خۆری بەیانی کوردستانێکی ئالۆز و پشێودا بوو،
ئەستێرەی بەختی نەهاتی کوردەواری، بێ جریوە و نادیار و لە ڕۆچوون و نشێودا بوو
نەک بە تەنیا خاکی زێڕینی بە هەشتی نیشتمانم بەشکراوە کۆلەوز و ژێرە پێ بوو
هەست و هۆشی ناپەرۆشی خەلکەکانی ناو سنووری خاکی خۆشم سرکراوە لارە ڕێ بوو
بیروڕایەك ڕەنگ و هێلی پاکژی بۆ بالەخانەی سەروەریی ئەم کوردستانە بڕشتایە
ئەو کەسانە بەر لە دوژمن بەختەوەربوون هەلگرانی بیری وایان لە بێشکەدا بکوشتایە
لەبەربوورە، بەبێ بەلگە ئەیاندانە بەر پلاری: نۆکەری بۆ سەرمایەداری خوێن مژە
بە نارەوا ئەیانکردن بە پاشکەوتە، کۆنەپەرست، بە شۆڤێنی، بەخوێنڕێژ و بەکوردکوژە!
پوورەهەنگی لاوەکانمان تەرمئەکران لە گەشبینی لە ڕێکخستن، لە ڕێبازی کوردایەتی
پێوانەکان ئاوەژووبوون، بەملکەچی بۆ داگیرکەر، ئەوترابیری کراوە و مەردایەتی
بانگەوازی ئەو ڕۆژانە لە دەروونی نەخۆشەوە، لە ڕێی خوادا، برایەتی گورگ و مەڕبوو
بەرامبەر ئەو بانگەوازە، نەك هەر گورگ، مەڕەکانی خاوەن شکۆش گوێچکەی نیزیان تەواوکەڕبوو

کەسێ داوای یەکبوونەوەی کوردستانی کەرت و پەرتی بکردایە، دەیان دەست و دەنگی ناساز
ڕاست و چەپ لێی ڕائەوەستان، وەکوهاندان بۆ تێشکان ئەیانزڕان بە تاوانی جیاوازی خواز
لەو گێژاو و بارودۆخە ناهەموارەی بالێکێشابوو بەسەر ئەم شوێنەوارە وێرانەدا
کۆمەلێ بیریکراوە لە گیانێکی لە خۆبوردووی جەربەزانەی بەهەلمەتی شێرانەدا
بەرد و بنچینەی تەلاریان بۆ فەلسەفەی کوردایەتی لەسەر خاکی کوردستانا پتەو دانا
فەرەیدوونی تازە خونچە چرایەکی هەلکراوی گەش و دیاری جێ هیوابوو لە ناویانا

- - -

ئێستا ئەی هاوبیری مەردی لە ژیانا دەرکەناری پاڵەپەستۆی هەرزەگێلانی نەتەوەم
ئەی هەستی ناسکی زامدار بەو تیغانەی لە ئاستی بزورگی تۆدا، خۆیان ئەبینی سووك و کەم
بنوو ئارام، ئەوا تەلاری پیرۆزی کوردایەتی سەربلند و ڕوو لە هەڵچوون و بالایە
ئەوا کوردستانی ئەمرۆ، بەو باوەڕەی تۆ چرای بووی، ڕێنمای بووی سەرتاسەری ئاوایە
ئەوەی ئەوسا لە کلۆری کولەکەدا بانگی ڕەوامان بۆ ئەدا بە پەرێزەوە و بەیەنهان
ئێستا سروودی ئاشکرای خۆش و سازی ئەوانەشە کە سەردەمێ ئەبوونە کۆسپی ڕێگەوبان
ئەوا کاروانەکەی کوردی قارەمانم لە پێشبڕکێی تێکۆشانا سەرکەوتووەو براوەیە
ئێستاکە ئالای کوردستان، لەویژدانی تێکڕای گەلا، لە بارەگای هاوبیرانا، شەکاوەیە

- - -

ئێستا ئەی هاوبیری مەردی لە ژیانا دەرکەناری پاڵەپەستۆی هەرزەگێلانی نەتەوەم
ئەی هەستی ناسکی زامدار بەوتیغانەی لە ئاستی بزورگی تۆدا خۆیان ئەبینی سووك و کەم
ئەوەی ئەوسا هەستی ئێمەی ئازارئەدا، پێ خزاوی لیتەی دراوەدەسگیراوی ڕاوو ڕووتە
ئێستا ئەو برنەو لە شانە تێکۆشەرە، بەخۆی بزانێ، نەزانێ، لەگەڵ داگیرکەرا جووتە

- - -

بەرێزەکان: ئێمە و فەرەیدوونی بینا، سێ خولی ساڵ پێش گلاسنوس پێڤ بیرێستروێکابووین

بەلام ئێمە نادیاری کوردستانێکی تاریك و گەلێکی دیلو خۆبەخۆش، ناتەبابووین
ئێمەوتمان ئاسۆی بیری کوردایەتی فراوانەو تێکۆشانمان بۆ نەتەوە جێی داخ نیە
کوردایەتی بڕوامانە و کالای بالای سەرتاسەری کوردستانە و کوردایەتی قۆناغ نیە
ئێمە وتمان خۆری ڕزگاری ئەبێ هەر لە دەم کەلی ڕاپەڕینی خۆمانەوە هەڵبێ لێمان
مژدەی خۆشی یەکگرتنی ڕیزەکان و سەرفرازیی دواجارەمان، لەم ڕێیەوە ئەدرێ پێمان
ئێمەوتمان کاتێ ئاشتی بۆ ئێمەی کورد، بۆ میللەتانی سەرزەوی گونجاو و ڕاست و ڕەوایە
هەر کۆمەڵە و بە ئامانجی دووری بگا، ئەمە سروشتی ژیانە و هەروابووە و هەروەهایە
ئەوەتا هەر هەمان بیرەو لە جیهانا، دوای حەفتا ساڵ ئاگر و خوێن، بۆتە چراو ڕێنماو هۆ
بۆ سەروەریی ئەو گەلانەی ڕاپەڕیون بۆ ئازادی ئالای بەرزی نیشتمانێکی سەربەخۆ

...

ئەی گیانی پاکی فەرەیدوون: ئێستا ئێمەی کوردیش یەکین، ئاواتی تۆ: نەتەوە کۆك و تەبایە یەکێتیمان کێو لەبەریا خۆی ناگرێ، مەرگی دژ و داگیرکەری ئەم کوردستانەی لەدوایە بەڵێ یەکین، ئەو جیهانەش دەرئەنجامی یەکگرتن و ڕاپەڕین و کۆچ و ڕەوی یەکتەن و گیان بوونە دۆستی گەلێکی بێ پشت و پەناو مرۆڤی زۆرلێکراوی خاکی وێرانی کوردستان بەڵێ یەکین، ئەوی ڕێزی یەکێتیمان بشێوێنێ، مۆرکی ناپاکی ئەبێتە تاجی شانی خوێنی پاکی شەهیدان و فەرەیدوونی بیروباوەڕ، ئەبن بەگڕ، ئەئاڵێنە لەش و گیانی ئەیکەن بەپەنگ ، بەخۆڵەمێش، ئەیدەنەبەر گەردەلوولی نەفرەتی مێژووی نەتەوەی کورد و گێتی ئەی نەتەوە، ئەی هاوبیران: فەرەیدوونی کوردایەتی لە گۆڕەوە بانگمان ئەکا بۆ یەکێتی

## بۆ دەستەی سەرپەرشتی چلەی خوالێخۆشبوو
## مامۆستا فەرەیدون عەلی ئەمین

سلاوێکی گەرم

لە چلەی ئەدیب و نووسەر و مامۆستا و مفکری کورد خوالێخۆشبوو فەرەیدوون عەلی ئەمین خۆمان بە بەختیار ئەزانین کە هاوکاری و هاوبەشی خۆمانتان لە چلەی پرشان و شکۆی ئەو کەڵەپیاوەدا بۆ دەرببڕین و لە ڕێی ئێوەوە سەرخۆشیمان بە هەموو هاوڕێ و دڵسۆزانی خوالێخۆشبوو کەسوکاری و خێزان و کوڕەکانی بگەیێنین، داوا لە یەزدانی گەورەئەکەین کە باخچەکانی بەهەشت جێگەی بێ.. جارێکی تر سەرخۆشیی و ماتەمینیمان...

**نووسینگەی ڕۆژنامەی**
**کوردستانی نوێ لە سلێمانی**
**١٩٩٢/١/٢**

**مام و پوورە خۆشەویستەکانم**

**خوشك و برایانی هێژام**

بەخێربێن بۆ دیداری چلەی مامۆستا فەرەیدوونی هاوڕێ و براتان سەرچاوی من هاتن، ئاسن، بۆ ئەوەی بەزەبر و زۆری زۆردار نەچەمێتەوە، دەخرێتە ناو بلێسەی ئاگری کورە و ئاوی ساردەوە، ئیتر ڕەق دەبێت و بەرگەی هەموو زەبر و زۆرێك دەگرێت، ئەو جیلەی کە باوکم و هاوڕێکانی بوون، لە ناو بلێسەی ئاگری شۆڕش و سەرما و سۆڵەی چیاکانی کوردوستاندا، وا چوختبوون، کە ئیتر نە بە قورسی باری ژیان و نە بە زەبرو زۆری دوژمنی زۆردار و دلڕەق، پشتیان نەچەمێتەوە و سەرشۆڕنەبن.

**برایان و مامە بەڕێزەکانم**

ژیان، بەنرخترین سامانی ئادەمیزادە. دەبێت وای بەریتەسەر، لە ئەنجامدا لێی پەشیمان نەبیتەوە. هەموو مرۆڤێك، لە دوا ڕۆژانی ژیانیا کردەوەی سالانی ژیانی هەڵدەسەنگێنێت، هەندێك هەن بەدوای ساماندا دەڕۆن و سامانێکی زۆر دەنێنەیەکەوە و هەندێك بەدوای جاە و دەسەلاتا دەڕۆن تا دەگەنە پایەی بەرز، هەندێکیش ڕێگای میللەت پەرستی دەگرن و ڕەنگە لەوڕێگایەدا توشی گەلێك گێچەڵ و دەرد و ئازاربن، بەلام سودێك دەگەیەننە میللەت و ولاتەکەیان. سامان لە پاش مردن هیچ کەلکی نامێنێ و پەرش وبلاو دەبێت جاە نامێنێت، بەلام کردەوەی چاك و خزمەتی میللەت و ولات، لە ویژدانی هەزاران هاوولاتی بەشەرەفدا هەر دەمێنێت.

ئێمە، بنەماڵەی خوالێ خۆشبوو فەرەیدونی عەلی ئەمین، کاتێ سالانی ژیانی باوکمان هەڵدەسەنگێنین، هەست بەبێ باوکی ناکەین. چونکە باوکمان، تەنها ئەوئێسك و گۆشتە نییە، کە لە خاکی ئەم ولاتەدا چاوی هەڵهێنا و گەڕایەوە بۆ ئەم خاکە. باوکمان ئەو ژیانەی لامەبەست بوو، کە ساڵەها لەگەڵ ئێوەی بەڕێزدا بۆ ئازادی ولات و خۆشبەختی میللەت تێدەکۆشا. ئێستایش، ئێمە شانازی بەوەوەدەکەین کە زۆربەی ژیانی، هاوڕێی ئینسانی بەشەرف و تێکۆشەری وەکو ئێوەبوو، وە ئێوەش، نەبیرەوەری

ئەو تێکۆشانە و نە ئێمەشتان فەرامۆش کردووە. لەبەرئەوە، وادەزانین باوکمان هەر زیندوە و هەمیشە وێنەی لە چیاو دەشتی ئەم کوردستانەدا دەبینین، ئەگەر بەکۆچی دوایشی دڵتەنگ بینو فرمێسکی بۆ برێژین، دڵمان بەم وڵاتە جوانە و ئێوەی دڵسۆزدەکرێتەوە.

زۆر سوپاس بۆ ئەو هەموو بەڕێزانەی سەرخۆشییان لێکردین و لەم ڕۆژەدا بیرەوەری باوکمانیان زیندوکردەوە دڵنیاتان دەکەین، ئێمەش هەمان ڕێگا دەگرین کە بەبیروباوەڕی نیشتمان پەرەوەری گۆشکرابێت، خوا لە ئێمەتان نەسێنێت، براو مامە بەڕێزەکانم، هەزارەها سلاوی ئەمەك و وەفاداری بۆ گیانی پاکی باوکی خۆشەویستم سوپاس بۆ ئێوەی خۆشەویست، بۆ یەکێتی نووسەرانی کورد، هەربژین، هەمیشە سەربەرزوو سەرفرازبن.

# بۆ مامۆستایەکی کورد و مەردی نیشتمانپەروەر

**دوکتۆر حوسێن محەممەد عەزیز**

کاتێ ساڵی ١٩٧٠ ڕێککەوتننامەی ١١/مارس بلاوکرایەوە، تەمەنم بیست ساڵ بوو، تازە بارەگەی لقی چواری(پارتی دیموکراتی کوردستان)، لە شاری(سولەیمانیی)، لە شەقامی(مەولەویی) و لە ماڵی(ڕەشەجەنجەڕ)کرابۆوە، ئێمەش، کۆمەڵێ لاوی کوردبووین، هەر لە زووەوە، هەمووومان(مەلایی)بووین.

لەبەرئەوەی، (پارتیی) ڕێکخستنی زۆر لاوازبوو، یا هەر نەیبوو، (بەکری حاجی فەرەج) داوای لێکردین، وەك پێشمەرگەی نێو شار، لە لقی چوارکاربکەین. ئەوەبوو، کۆمەڵێکمان بەدەم داواکارییەکەیەوە چووین، لەوانە: (لەتیفی قادرە فەندی برازای، عومەری جەیران، عەبەی فارس، غەفوور حەسەن"دەرسیم"...). ڕۆژانە، لە بارەگە چاودێرییماندەکرد و کاری سەرپێیی لقمان هەڵدەسوڕاند. شەوانەش، بە نۆرە ئێشکمان دەگرت.

ڕۆژێ، پاسەوانی دەرگەکەی نێوان دالانەکە و حەوشەکەی لق بووم، (برایمی حەمە عەلی) هاوڕێم هات و گوتی: بەڵکوو هەوڵێکم بۆ بدەی، نامەیەکی لقم بۆ وەرگری، تا لە ئامادەیی کشتوکاڵی(بەکرەجۆ) وەرگیرێمەوە. چونکە، ئەوکاتە، بە هۆی تەمەنەوە، لە خوێندن دەرکرابوو، ڕاژەی سەربازیی لەسەربوو. بەلام، بەپێی هێندێ خاڵی ڕێککەوتننامەکە، ئەوەی بە هەر شێوەیە، (لە ڕووداوەکانی باکووری عێراق!)دا، بەشدارییکردبوو، لە ڕاژەی سەربازیی ڕزگاریدەبوو و دەچووەوە سەر کارەکەی خۆی. هەر چەندە، ئەو کاتە ئەو(جەلالیی) و منیش(مەلایی)بووین، بەلام، زۆر هاوڕێبووین و ئەوەمان لێکنەدەدایەوە. بە کاك(بەکر)م گوت، یارمەتییبدا. ئەویش گوتی: بە کاك(عەبدولی سوران) دەڵێم. بەلام، بۆیاننەکرد، بیانوویان پێگرت و داوای پشتگیرییان لێکرد.

لەم قسانەدابووین، لەپڕ، پیاوێکی قۆزی چاکەتوپانتۆڵ لەبەری تێکسمڕاو، لە ژووری لق هاتە دەرەوە. پێشتر، نە لە لق و نە لە هیچ شوێنێکی دیکە نەمدیبوو. گەیشتە ئاستی ئێمە و هەرچاوی بە(برایم) کەوت، گوتی: کاکە(بلە)، ئەوە لێرە چیدەکەی؟ ئەویش، بەسەرهاتی خۆی بۆ گێڕایەوە. مامۆستاش یەکسەر، پاندانەکەی و پارچەیە کاغەزی دەرهێنا، چەن وشەیەکی لەسەر نووسی و گوتی: ئەمە بەرە بۆ کاك(عەبدول). کاتێ مامۆستا ڕۆی، لە(برایم)م پرسی: ئەوە کێبوو؟

گوتی: مامۆستا(فەرەیدوون عەلی ئەمین)بوو، لە قوتابخانەی سەرەتایی مامۆستام بوو.

تەماشای ئەو بیرە تیژ و ئەمەکە گەورەیەکەن، ئەو مامۆستا بلیمەتە، چۆن خوێندکارێکی قۆناغی سەرەتایی خۆی بیرنەچۆتەوە و بەسەریکردۆتەوە! دوایی، نامەکەی مامۆستام بردە ژوورەوە، یەکسەر واژۆکرا و کارەکەی جێبەجێبوو. بەڵێ، پێشتر ناوی مامۆستا(فەرەیدوون)م بیستبوو، بەڵام، ئەوە یەکەمجاربوو، بە دیداری ئەو مامۆستا ئێسکسووکە خوێنشیرینە شادبم. هەر لە خۆمەوە، خۆشمویست، زۆر پیاوێکی بەڕێز دیاربوو. پاشان، لە کۆتایی ساڵی١٩٧٠دا، بە هۆی هاوڕێم(عەلی تۆفیقی حەسەنە قووچ)ەوە، بە بیر و ڕێبازەکەی(کاژیك) ئاشنابووم، ئیدی، هێندەی دیکە لام خۆشەویستر و بەڕێزتربوو. چونکە، ئەو سەردەمە، سەردەمی ئایدۆلۆژیابوو، هەر کەسێ بۆنی ئەوەی لێبهاتایە، نەتەوەیی بووایە و لە بیرەکەی خۆتەوە نزیکبووایە، یا لە یەکرێکخراودا کارتانبکردایە، بێئەوەی بزانی، چۆن مرۆڤێکە، ڕەوشتی کۆمەڵایەتیی چۆنە، لە دوورەوە و کوێرانە، خۆشتدەویست و داکۆکییت لێدەکرد. بەڵام، بەداخەوە، تێڕوانینێکی زۆرهەڵەبوو، چونکە، هێندێ لەو کەڵەنەتەوەییانە، نەك هەر شایانی ئەوەنەبوون و نین، خەڵك گوێیان لێبگرێ و دوایانکەوێ، بەڵکوو، هەر ڕێزیشیان لێبگیرێ، چونکە، ڕاستتروایە، بێئەوەی گوێ بە باوەڕ و ئایدۆلۆژیابدرێ، هەموو کەسێ، بەپێیکردار و ڕەفتاری خۆی، ڕێزی لێبگیرێ!

دوای ئەوە، لەگەڵ نووسینەکانی مامۆستادا، ئاشنایەتییەکی تەواوم پەیداکرد، هەرچییەکی دەنووسی، بە کوڵودڵەوە دەمخوێنەوە، بە تەوایی، هۆگری نووسینەکانی

بووم و وەك دەڵێن: بستم بە قەرزنەدەدان. بە تایبەتیی، هۆنراوە ڕەنگین و سەنگینەکەی(نوقڵێ)، کارێکی زۆری، لە تەلی هەست و سۆز و هۆشمکرد. ڕەنگە، گەر بڵێم، یەکەمینجار، (شێخ مەنسووری حەفید)، ئەو هۆنراوەیەی لە(سولەیمانیی) بڵاوکردەوە، هیچ لە ڕاستیی لام نەدابێ، چونکە، من لە زمانی ئەوەوە بیستم و پێشئەوەی لە(بەغدا)وە بیهێنێ، لە کەسی دیکەم نەبیستبوو، هەر هەمووشی لەبەربوو!

سەیر ئەوەیە، لەو سەردەمەی دەسەڵاتی کورددا، لە سەر پلە و پایە، لەسەر پوڵ و سەرمایە، فڕانفڕانێ بوو، کەس سەرکەس نەدەپەرژا، هەر کەسە، هەوڵی بۆ خۆی دەدا، شتێ بۆ خۆی بپچڕێ. کەچیی، لەبری ئەوەی، کارێکی شیاو بە مامۆستا بسپێرن، ڕێزی ئەو چەن ساڵەی خەبات و پلە ڕۆشنبیرییەکەی بگرن، دوای دە ساڵ پێشمەرگەیی بە شاخەوە، بۆ نێوەڕاستی(عێراق) گواستیانەوە و کردیانەوە بە مامۆستای سەرەتایی، بە مەرجێ، ئەو کوردانەی لە خوارووی(عێراق)یش بوون، هەموویان بۆ(کوردستان) گێڕانەوە، ئاخر، بە چ ویژدانێ ڕەوایە، بەو شێوەیە، هەڵسوکەوت لەگەڵ مامۆستایەکی کورد پەرەوەری ڕووناکبیری ناسراوی کورددا بکرێ!!

هێندەی من ئاگاداربم، مامۆستا(فەرەیدوون)، ساڵی١٩٧٢، بەیەکجاریی، وازی لە ڕیزەکانی(کاژیك) هێنا، سەری خۆی کزکرد و دانیشت. چونکە، هیچ باوەڕ و هیوایەکی، نە بە سەرکردایەتیی ئەو کاتەی کورد و نە بە هاوبیرەکانی خۆی نەمابوو، هەر ئەوەش وایلێکرد، کاتێ ساڵی١٩٧٤، جەنگ لە(کوردستان) نوێبووەوە، خۆی کەنارگیرکا و ئەم جارە، بەشداریی لەو شۆڕشە قرخنەدا نەکا، هەر چەندە، سەرانی شۆڕشەکە و نەتەوەییەکان، زۆریان پێناخۆشبوو و وەڵامیشیان بۆ نارد، بەڵام، نە وەڵامیدانەوە و نەڕاشیکرد!

ساڵی١٩٧٣، لە ڕیزەکانی(کاژیك)دا، کۆمەڵێ گەنج، لە سەرکردایەتیی ڕاپەڕین و داوای چاکسازیی و گۆڕانکارییاندەکرد. ئەوە بۆ یەکێکی وەك من، وەك کارەبا گرتبێتمی، وابوو، بە تەواویی ڕایچڵەکاندم. چونکە، لەسەر ئەو بیرو ڕێبازە، لە ڕیزەکانی(پارتیی)دەرکرابووم و بە توندییش، لەلایەن دەزگا سیخوڕییەکەی(پاراستن)ەوە، چاودێریی و دژایەتیدەکرام. ئیدی، بە تەواویی بۆم

ڕوونبۆوە، (كاژیك)، تەنیا ناوی زل و دێی وێران نەبێ، هیچی دیكە نییە، وەك دەڵێن: دووكانی بەكر و دوو قاڵب سابوون بوو!

لەنێو ئەو گەنجە خوێندەوارە خوێنگەرمە ڕاپەڕیوانەدا، دوو هاوبیرم ناسی، كە لە نزیكەوە، لە من پتر، ئاگاداری باری ڕێكخراوەكەبوون و مامۆستاشیان، باشدەناسی. یەكێ لەوانە، (شێركۆی هەژاری موكریانیی)بوو، داخێكی زۆری لە دڵدابوو، گەلێ شتی پڕ لە سەیرو سەمەرەی، لە سەركردایەتیی بزووتنەوەكە دەگێڕایەوە، دەسەڵاتی هەبووایە، هەر هەموویانی پاكتاودەكرد! ئێرە جێی ئەوە نییە و با جارێ بمێنێ، بەڵكوو، گەرمەرگ مەودابدا، لە هەلێكی دیكەدا، هەموویان تۆماركەم.

بەڵام، زۆر بە باشە، باسی مامۆستای دەكرد و پێشییەوە سەرسامبوو. لەگەڵ ئەوەشدا، ڕەخنەیەكی لە سەری هەبوو، دەیگوت: ئەو كاتە، من(جەلالیی)بووم و لە بنكەی ڕۆژنامەی(ئەلنور) كارمدەكرد. لەبنیشەوە، پێوەندییم بە مامۆستاوە هەبوو. دەمتوانی، زۆر بە ئاسانیی، سەركردەكانی(جەلالیی) لە(بەغدا) بكوژم، چونكە هەفتانە، لەوێ كۆبوونەوەیان هەبوو. كەچیی، مامۆستا لە سەر ئەو كارە ڕازیی نەبوو.

كاتێ لە(بەغدا) بینیم، ئەوەم لێ پرسی، گوتی: ڕاستیكردووە.

گوتم: هۆكەی چی بوو؟

گوتی: ئێمە بۆ بمانكوشتنایە و بۆكێمان لە نێوببردنایە؟ (شێركۆ) ئاگای لە ڕەوشی شۆڕشەكەنەبوو، ئێمە، چەن بارمان خراپبوو، بە چ شێوەیە، دژایەتیی دەكراین، (مەلا مستەفا)، ڕێی(كۆمۆنیست)ەكانی دابوو، بە ئاشكراكاربكەن، كەچیی، ڕێی ئێمەی نەدەدا و دانی پێدانەدەنایـن! دوای ئەوە، هەموویان هاوڕێمانبوون و كێدەیگوت، شۆڕشەكەی(مەلا مستەفا) سەردەكەوێ، ئەی گەر شۆڕش تێكچوو، نابێ، لایەنێكی دی هەبێ، داكۆكیی لە كوردبكا؟!! بۆچوونەكەشی ڕاست دەرچوون.

ساڵی١٩٨٠، لە سەركردایەتیی(پاسوك)ەوە، چەن نامەیەك بۆ هێندێ نووسەر و هۆنەری نیشتمانپەروەری كوردی وەك: (شێركۆ بێكەس، ڕەووف بێگەرد، حەمەی حەمە باقیی، سەباحی غالبی، ناسر حەفید...) نووسرا و بەدەس من گەییشتن. نامەیەكی تایبەتییش، بۆ مامۆستا(فەرەیدوون) هاتبوو، دەبووایە، خۆم بەدەسیی

بمگەیاندایە. ئەو کاتە، مامۆستا لە(بەغدا) دەژیا، نە دەمناسی و نەناونیشانیشیم دەزانی. لەبەرئەوە ناچاربووم، کۆمەڵێ برادەر کۆکەمەوە، بە ناوی گەشت و ڕابواردنەوە، سەرێ لە(بەغدا)بدەین. یەکێ لەو برادەرە خۆشەویستانە، کاک(نیهاد)ی ئامۆزای مامۆستابوو. ئەوەبوو، مانگی ئۆکتۆبەر، هەموو پێکەوە، بەرەو پێتەخت کشاین. بەڵام، کەسیان نەیاندەزانی، مەبەستی ڕاستەقینەی گەشتەکەی من چی بوو، جگەلەوەی، کەسیشیان نەیاندەزانی، نامەی تایبەتیی فەرمیی مۆرکراوی سەرکردایەتیی(پاسۆک)م، بۆ مامۆستا پێیە. دوای ڕۆژێ لە(بەغدا)، بە کاک(نیهاد)م گوت: بیستوومە: مامۆستا لێرە دەژی، بۆ سەرێکی لێنەدەین. گوتی: زۆرباشە و منیش، بە کاک(نیهاد)م گوت: تەنیا من و تۆ دەچین و لای برادەرانی دیکەی خۆمان باسی مەکە.

ماڵەکەیان زۆر دووربوو، وا بزانم، لە گەڕەکی(عامریی)یە بوو. ئێسگەی پاسێکی بۆ دەسنیشانکردبووین، خۆی لەوێ، بە ترومبیلێکەوە چاوەڕێیدەکردین. هەرچی چۆنێ بوو، گەیشتینە ماڵەوە. کاک(نیهاد) بە یەکدی ناساندین. کەمێ دانیشتین و مامۆستا، هەر لێم ورد دەبۆوە. منیش، خۆم پێناساند و گوتم: کوڕی فلان کەسم و لە زانکۆی(سولەیمانیی) مامۆستام. یەکسەر، باوکمی ناسی و زۆر بە گەرمیی، هەواڵی پرسی. پاشان، خوان ڕازایەوە. بەدەم نان خواردنیشەوە، هەروا چەن شتێکی گشتیمان، لە سەر زمان و وێژەی کوردیی باسکرد.

دوای ئەوەی نانمانخوارد، کاک(نیهاد)چوو، جگەرەبکێشێ، دووقۆڵیی ماینەوە، ڕووی دەمی تێکردم و گوتی: هەروا هاتی، یا کارێك بە من هەبوو؟

منیش، دەسم بە گیرفانمداکرد، نامەکەم دەرهێنا و دامێ. گوتم: ئەم نامەیە، لە هاوبیرانی(پاسۆك)ەوە، بۆ بەڕێزت هاتووە. تکایە، ئێستە مەیخوێنەرەوە، ماوەیەکی دیکە، خۆم بە تەنیا دێم و ئەوکاتە، وەڵامم بدەرەوە.

گوتی: (نیهاد) دەزانێ؟

گوتم: نەخێر، کەس نازانێ. ماوەیەکی دیکەدانیشتین، (چا) و میوەمان خوارد، پاشان، بە ئۆتۆمبیلەکەی خۆی گەیاندینی. پێش ئەوەی بڕۆین، تێلێفونی کار و ماڵی خۆی بۆ نووسیم.

بەڕاستیی، هەر چەندە، ئەوە یەکەمین جاربوو، لە نزیکەوە، قسە لەگەڵ مامۆستا بکەم، بەڵام بۆم ڕوونبۆوە، تا چ ئەندازەیە خوێندەوارە، چەن ڕووناکبیرێکی گەورەیە، چ پیاوێکی بەڕێز و دەس و دڵ ئاواڵەیە.

دووەمین سەردان، مانگی مارسی ساڵی١٩٨١ بوو. بە تەنیاچووم و تێلێفۆنم بۆ کرد، هات بە دوامدا، پێکەوە سواربووین و چوینەوە بۆ ماڵەوە. پشوویەکماندا و ئەم جارەش، نانمانخوارد. پاشان، بە تێروتەسەلیی، باسی ڕەوشی(کوردستان) و(پاسۆك)م بۆ کرد. زۆر بە باشیی گوێی بۆ ڕاگرتبووم، بە هیچ شێوەیە، قسەکانی پێنەدەبڕیم. بەڵام، ناو بە ناو، پرسیاری لێدەکردم و منیش، وەڵامم دەدایەوە. نازانم، بۆچی هەر لە خۆمەوە، هەموو باوەڕێکم دابوویە، زۆر بە ڕاشکاویی بۆی دەدوام. چونکە، ئەوە دووەمین جاربوو، یەکدی ببینین و ئەویش، ماوەیەکی زۆربوو، لە هەموو شتێ دابڕابوو؟!!

پاشان، نۆرەی ئەوهات و ئەوەی دەیگوت، نەیدەگوتەوە. داخێکی زۆری شۆڕشی١١سێپتێمبەری لە دڵدابوو، لەو بارەیەوە گوتی: زۆر لە مێژبوو، لە هەموو شتێ تێگەیشتبووم، باوەڕم بە شۆڕشەکە و سەرکردایەتییەکەی نەمابوو. بەڵام نەمدەوێرا، وازی لێبێنم و بگەڕێمەوە. چونکە، لە لایەکەوە، کۆمەڵی(جەلالیی) لە نێوشارەکاندابوون، گەر بگەڕامایەتەوە، دەبووایە، لە ژێر کۆنترۆڵی ئەواندا بوومایە، یا لەگەڵ میریی بوومایە، لە هەر دوو بارەکەشدا، سەرکردایەتیی شۆڕش، بە جاشیان دادەنام و دووریشنەبوو، بیانکوشتمایە. لەبەرئەوە، چاوەڕێی گفتوگۆیەك بووم، (مەلا مستەفا) لەگەڵ میرییدا ڕێککەوێ، منیش بگەڕێمەوە و بۆ خۆم دانیشم. شتێکی سەیری بۆ گێڕامەوە. گوتی: لە دانیشتنێکدا، بە(مەلا مستەفا)م گوت: ئێمە وەك(کاژیك) داواکارین، ڕێمانبدەن، بنکەیە بکەینەوە، پێشمەرگەکانمان کۆکەینەوە و بە سەرکردایەتیی بەڕێزتان، درێژە بە خەباتی خۆمانبدەین، هەر وەك ڕێتان بە(پارتی کۆمۆنیستی عێراق) داوە، هێزی پێشمەرگە و بنکەی تایبەتیی خۆیان هەبێ.

(بارزانیی)ش، زەردەخەنەیە گرتی و لە وەڵامدا گوتی: بابیری لێبکەمەوە.

کەچیی، دوای ماوەیە، (سامی عەبدولڕحمان) و(نووریی شاوەیس)هاتن، گلەییان لێکردم و گوتیان: سەرۆك(بارزانیی) دەڵێ: (فەرەیدوون) داوای لێکردووم، (پارتیی) هەڵوەشێنمەوە و ببم بە سەرۆکی(کاژیك)، ئێوە دەڵێن چی؟

هەڵبەتە، هیچ یەکێ لە ئەندامانی پەلیتبیرۆی(پارتیی) نەیانوێرابوو، دەم هەڵهێننەوە، تەنیا گوتبوویان: ئێمە، لەگەڵ بڕیاری بەڕێزتانداین و خۆتان چۆنی بە باشدەزانن، وابکەن!

مامۆستاش، بەتەواویی نیگەران وبێ هیوابوو بوو، پێگوتبوون: ئەوە(مەلا مستەفا)، هەم وەڵامەکەی بە ئێوەدا بۆ من ناردۆتەوە. هەم هەڕەشەشی لە ئێوەکردووە، تا ئەندامێکی گوێڕایەڵبن، لە نێو خۆشتاندا ڕێککەون و ئاژاوە نەنێنەوە. ئەگینا، من شتیوام نەگوتووە! وتی: ئەو بەسەزمانانە، ئاوێکی سارد، بەدڵیانداکرا و بەدڵخۆشیی گەڕانەوە!

پاشان، زۆر بە درێژیی، باسی بزووتنەوەی نەتەوەیی کوردیی بۆ کردم، بە تایبەتیی، لە دامەزراندنی(کاژیك)دوا، داخێکی زۆری لە دڵدابوو، وەك ئەو هەموو ماوەیە، چاوەڕێی یەکێ بووبێ، دەردی دڵی خۆی بۆ هەڵڕێژێ. منیش، واگوێم بۆ گرتبوو، لە خۆشیاندا، چاو و دەمیشم، چەپکە گوڵی گوێی گرتبوو!

دەربارەی تێکۆشانی خۆی گوتی: ساڵی١٩٦١، شۆڕش بەرپابوو، منیش، وەك کوردێکی نەتەوەیی، پێوەندییم بە شۆڕشەوەکرد. ئەوکاتە، لەگەڵ(مام جەلال، حیلمی عەلی شەریف، نەوشیروان مستەفا...)دا، لە(چەمی ڕێزان)بووین. خوا هەڵناگرێ، زۆر بە باشە، باسی ڕۆڵی نیشتمانپەروەرانەی ئەوانی کرد. گوتی: هەوڵێکی زۆرم لەگەڵدان، شۆڕشەکە، لە سەر ڕێبازێکی نەتەوەییانە بڕوا، هیچ کەڵکی نەبوو. بەڵام، (نەوشیروان مستەفا)، پتر لە ئەوانی دیکە، لە دید و بۆچوونەکانی منەوە نزیکبوو، لە زۆر شتیشدا، هاودەنگ و هاوبیربووین، زۆر لەگەڵی خەریکبووم، لەگەڵ ئێمە کاربکا، بەڵام، سەری نەگرت و پێی گوتم: تازە، من بەڵێنم بە کاك(برایم) و هەڤاڵانی دیکەی(پارتیی)داوە، کاریان لەگەڵ بکەم. جەختی لەسەرئەوەش کردەوە، کە پیاوێکی سەرڕاست و کوردێکی

نەتەوە پەرەوەری ڕاستەقینەیە! بە کورتیی، لە نامەکەی سەرکردایەتییدا، هێندێ شتیان بۆ ڕوونکردبۆوە و داوایان لێکردبوو، وەك برای گەورە و سکرتێری گشتیی(پاسۆك)، کاریان لەگەڵ بکا. ئەویش، زۆر بە ڕاشکاویی گوتی: ئەوە(فەرەیدوون) نییە، بێتە سەر خوانی ئامادە! بەڵام، لە ڕاستییدا، لە دووشت زۆر زویربوو:

یەکەم: لە سەرەتای مانگی یەکی ساڵی١٩٧٥دا، بە ناوی سەرکردایەتیی هەرێمی باشووری(کاژیك)ەوە، بلاڤۆکێ بلاوکرایەوە، جگە لە(جەمال نەبەز)، هەموو ئەندامانی سەرکردایەتیی پێشوویان دەرکردبوو، لە نێو ئەو ناوەنەشدا، ناوی مامۆستا هاتبوو، بە مەرجێ، ئەوان خۆشیان، زۆرباش دەیانزانی، مامۆستا، هەر لە ساڵی١٩٧٢ەوە، وازی لە کارکردن هێناوە!

دووەم: گوتی: کاتێ ئێوە(پاسۆك)تان دامەزراند، ئایا، پرستان بە من کرد؟ ئێستە دەزانن، کارەکەتان بۆ بەرێوەناڕوا، پەنا بۆ من دێنن، تازە پاش چی؟!!

لە ڕاستییدا، من هیچ وەڵامێکم پێنەبوو، چونکە هەموو قسەکانی ڕاستبوون، بەڵام، سوور دەمزانی، هۆکە هەر ئەوە نییە، بەڵکوو، لەو ڕۆژانەدا، کەم کەس هەبوو، خۆی بۆ ئەو کارە پڕ لە مەترسیی و ناخۆشە تەرخانکا، ئەویش، ماوەیەکی زۆربوو، لە کاری پێشمەرگایەتیی و پارتایەتیی دابڕابوو. لەبەرئەوە، کاتێ گەڕامەوە، نامەیەکم بۆ هاوبیرانی دەرەوە نارد و نووسیبووم: مامۆستا، بە هیچ شێوەیە ئامادە نییە، کارمان لەگەڵ بکا، ئیدی لەوە پتر، پێویست ناکا، هەوڵی لەگەڵ بدرێ، بەڵکوو، باشتر وایە، پشت بە خۆمان ببەستین.

مانگی شەشی هەمان ساڵبوو، جارێکی دیکە، بەزمەکە سەریهەڵدایەوە، نامەیەکی دیکەیان بۆ نارد منیش، بە هەمان شێوە گەیاندم. لە نامەکەدا، هێندێ قسەی توند و پلاری تێدابوو، هێندەی دیکە، مامۆستای لە هاوکاریی و هاتنە پێشەوە دوورخستەوە. تکام لێکرد، زویرنەبێ، گەر ترووسکاییەك بەدیدەکا، ئەوا گوێ بە نێوەڕۆکی نامەکە نەدا و کارمان لەگەڵ بکا.

گوتی: ڕۆڵی تۆ لەم کارەدا چییە؟

گوتم: لێپرسراوی ڕێکخستنەکانی نێو شارم.

گوتی: گەر من قایلبم و کاربکەم، ئەوا ناتوانم، لە(بەغدا) بمێنمەوە، بەڵکوو دەبێ، بچمە دەرەوە. ئایا تۆ ئامادەی، لەگەڵ من بێی؟

گوتم: دڵنیاتدەکەم، ڕۆژێ پاش و پێش ناکەوێ و پێکەوە دەڕۆین.

گوتی: ئەی بۆ بە تەنیا ناڕۆی؟

گوتم: ئاخر، ئەوەی من دەیزانم، تۆ نایزانی.

گوتی: چۆن؟

گوتم: تۆیان بۆ تەبایی و چاکسازیی دەوێ، چونکە، بەڕاستیی پێت دەڵێم: ئەوە پارت نییە، کۆمەڵێ برادەر و کوردی دڵسۆزن، پێکەوە خەباتدەکەن، لە هەمانکاتیشدا، لە نێو خۆیاندا، زۆر ناکۆکن و پێکەوە هەڵناکەن.

گوتی: کەوایە، ئەو برا گەورەیی و سکرتێری گشتییە، بە من ناگرێ و هەر پیرۆز بە خۆیانبێ.

گوتم: نیازم وایە، سەرێ لە دەرەوەی وڵات بدەم، چاوم بەو هاوبیرانەی ئەوێ بکەوێ، بزانم، بە هەمووومان شتێ بە شتێ ناکەین.

گوتی: وەك کێ؟

گوتم: ئەوی تۆ بیناسی، ڕەنگە، هەر(جەمال نەبەز)بێ.

گوتی: سەری خۆتی لەگەڵ مەیەشێنە، کەڵکی نییە و هەرگیز ناگەڕێتەوە.

پرسیم: دیارە، باشی دەناسی.

گوتی: بەڵێ. تابڵێی پیاوێکی زیرەك و چالاکە، هەر بۆ ئەوە باشە، بە تەنیا لە ژوورێکدا دایبنێی، هەموو پێویستییەکانی نووسینی بۆ دابینکەی، بۆ خۆی هەر بنووسێ. چونکە، دڵی زۆر ناسکە و تاسەر، دانووی لەگەڵ کەس ناکولێ.

پاشان گوتی: زۆرت پێدەچێ.

گوتم: نازانم، لەسەر شێوەی کار و ڕەوشی کوردستان دەوەستێ

گوتی: بە قسەی من بکە، گەر ڕۆیشتی، بڕوانامەکەت لەگەڵ خۆت بەرە، نەوەك نەگەڕێیتەوە، لەوێ سەری خۆت گزکە و خوێندنەکەت تەواوکە.

دواجار، له(سولەیمانیی) بینیمەوه، خزمێکیان مردبوو، له پرسەکەیدا دانیشتبوو. له دەرەوەی پرسەکه بینیم، خۆشهاتن و سەرەخۆشیم پێکەوه لێکرد.

گوتی: چی تازه هەیه؟

گوتم: هیچ گۆڕانکاریی و شتێکی نوێ نییه. بەڵکوو، ڕۆژ به ڕۆژ، بەرەو خراپتر دەڕوا. بەم زووانەش، کۆچدەکەم. ئەو کاته، جەنگی نێوخۆ، له نێوان لایەنەکاندا، له لووتکەی تێپەڕاندبوو!

گوتی: بیرت نەچێ، بڕوانامەکەت لەگەڵ خۆت بەری.

ئەوەبوو، ڕۆژی(١٩٨١/٧/١٣)، بەرەو(ئەورووپا)، ملی ڕێمگرت و له ناچارییدا، ئەو ڕۆشتنەی ڕۆشتم، نەگەڕامەوه. هەر چەنده خۆم زۆر تینووی خوێندن بووم، بەڵام، ڕاسپاردەکەی مامۆستام هەر لەبیربوو، کاتێ هەموو شتەکانم، به تەواویی بۆ ڕوونبۆوه، بڕیارمدا، نەگەڕێمەوه و خوێندنەکەم تەواوکەم، وا بزانم، ئەوەش، ڕاستترین بڕیاری بووبێ، له ژیانی خۆمدا دابێتم و هەرگیز لێشی پەشیمان نیم.

نزیکەی ده ساڵ و نیوم پێچوو، لەو ماوه درێژەدا نەمتوانی، سەردانی نیشتمانەکەم بکەمەوه، تا له(١٩٩١/٣/٧)دا، ڕاپەڕینه گەورەکەی کۆمەڵانی خەڵك بەرپابوو. ئەوەبوو، لەگەڵ کاك(شێرکۆ بێکەس)، له ڕێی(ئێران)ەوه گەڕاینەوه، ئێوارەی ڕۆژی(١٩٩١/١٠/٧) گەیشتینه نێو شار، هێشتا دەنگی تەقه و تۆپی سێیەمین ڕاپەڕین دەهات.

دوای سێ ڕۆژ، چاوم به دوکتۆر(عەبدوڵڵا ئاگرین)کەوت. گوتی: دەزانی، مامۆستا(فەرەیدوون) لێرەیه و حەزدەکا، چاوی پێت بکەوێ.

گوتم: منیش زۆر حەزدەکەم.

هەمان ئێواره، سواربووین و ڕۆیشتین. مامۆستا، له گەڕەکی(هەواره بەرزه) له ماڵی دایکیبوو. که چووین، له ڕێوه، زۆر به گەرمیی خۆشهاتنی لێکردم. دەسێ بیجامه و ڕۆبێکی نێو ماڵی لەبەردابوو، لەسەر کورسییەك دانیشتبوو، هەر قاچی، لەسەر هەردوو لێواری عەلادینەکه دانابوو، هەر دوو دەستیشی، به سەریدا شۆڕکردبۆوه و خۆی گەرمدەکردەوه، زۆری سەرمابوو، نەخۆشبوو و تای لێهاتبوو.

ئەوشەوە، تەقەی خۆشیی دەسپێکرد. لەبەرئەوە، زۆر دانیشتین. باسێکی زۆری ڕەوشی نەتەوەیی و ڕامیاریی کورد و(کوردستان)مان کرد. ئەوی زۆرگرنگە و دەمەوێ، لێرەدا باسیکەم، ئەوەیە، گوتی: ئەم ڕژێمە، بەم زووانە ناڕوخێ، (سەدام) هەروا بە خۆڕایی، واز لە دەسەڵات ناهێنێ. خوێنێکی زۆر دەڕژێ.

بەڵێ، تا ئەو کاتەی ئەو ڕژێمەش ڕوخا، ئەو دید و بۆچوونە، هەر ڕاستبوو. ئیستەش، ئەو ڕووباری خوێنە، هەر بەردەوامە.

پاشان گوتی: بەڵام دەبێ، بە هەمووومان، ئەم ئەزموونە بپارێزین و پشتگیریی بکەین.

دواکاتیش، بە بزەیەکەوە گوتی: ئەو چەن ساڵەی لە دەرەوەبووی، هیچت خوێند؟

یەکسەر زانیم، مەبەستی چییە، بۆیە گوتم: ڕاسپاردەکەی تۆم پشتگوێ نەخست و خوێندنی خۆم تەواوکرد. پاشان، بە درێژیی و لە هەموو ڕوویەکەوە، باسێکی(یەکێتی سۆڤێت)م بۆ کرد، زۆری پێخۆشبوو. ئیدی، کاتێ دەنگی تەقەی خۆشیی بڕا، ئێمەش، وردە وردە، قسەکانمان تەواوکرد و ماڵاواییمان لێکرد.

ڕۆژی٢٥/١٠/١٩٩١، گەیشتمەوە(سوید). دوای ماوەیە بیستم، مامۆستا(فەرەیدوون)، لە(بەغدا) و لە نەخۆشخانە، ڕۆژی٢٥/١١/١٩٩١ کۆچیدواییکردووە، بە داخەوە، ئەو مامۆستا تێکۆشەرە، هەمووی٥٨ ساڵ ژیا و نەتەوەی کورد، ئەو پیاوە مەردەی لە کیس چوو!

هەر چەندە، لە ژیانی خۆمدا، هەموو چەن جارێ، مامۆستام بینیوە، بەڵام، بەڕاستیی، تا بڵێی، پیاوێکی زۆر پڕ و ڕووناکبیربوو، کەسێتییەکی بەهێزی تایبەتیی خۆی هەبوو، هەمووکەس و لایەنەکان، ڕێزیان لێدەگرت. هەرچی چۆنێبێ، مامۆستایەك بوو، کۆمەڵێ منداڵی کوردی، بە زانست و بیری نەتەوەیی پەروەردەکرد، ڕازەی زمان و وێژەی کوردییکرد، نەك هەر بەدەم، بەڵکوو، بە کردەوەش کوردایەتییکرد، مەلی دڵی، تەنیا هەر، بۆ نەتەوە و نیشتمانەکەی خۆی دەیخوێند.

دەتوانم، بێ دوودڵیی بڵێم: لە هەموو ئەندامەکانی دیکەی سەرکردایەتیی(کاژیك)، کەسێتیی بەهێزتر، ناسراوتر، ئازاتر، ماندووتر و خۆشەویستتربوو، زۆر ڕیاڵبینانەتر،

بیری دەکردەوە، جێی ڕێزی کۆمەڵانی خەڵك بوو، پتر دڵی بە کێشەکەوە دەسووتا و خەمی بۆ ژێردەسیی کورد دەخوارد، ڕێزی خۆی دەگرت، پیاوی هیچ سەرکردە و لایەنێ نەبوو، سەر بە هیچ دەزگایەکی سیخووڕیی نەبوو، هەوڵی بۆ پارە، پلە و پایە نەدەدا، درۆی لەگەڵ هاوبیرەکانی خۆیدا نەدەکرد، ئەوەی لە دڵیدابوو، لەسەر زمانی بوو، ڕاسگۆبوو، پیاوێکی ترسنۆکیش نەبوو. بەڵام، بەداخێکی گرانەوە، تا لە ژیاندابوو، بە ئاواتەکانی خۆی نەگەیی، هەرواش سەری نایەوە، بێئەوەی، بە(گەزۆی خاو و میوە بەتام)ەکەی خۆی بگا، یا بزانین، (نوقڵێ) خانم کێبوو!

نوقڵێ! سەرچاوەی هێز و ئیلهامم

نوقڵی گەزۆی خاو، میوەی بە تامم

نوقڵێ! نوقڵی ئەوسای ژینی من

نوقڵێ! چقڵی چاوانی دوژمن

هەزاران سڵاو لە گیانی پاکی بێ، بەهەشتی بەرین، جێی هەمیشەیی بێ، یاد و یادگاری هەر زیندووبێ!

سولەیمانیی

٢٠٠٥/١٢/٢٥

# ئەلبومی وێنەکان

تێبینی : ئێمە بۆ ئەم ئەلبوومە گەلێ وێنەی ترمان لەلابوو، بەڵام هەر ئەمەندەمان لێ هەڵبژاردن. وێنەکانیش هیچیان ڕۆژ و ساڵی گرتنیان دیاری نەکرابوون.

دوو وێنەی دیوی دەرەوەو ناوەوەی ماڵی حاجی ئەمینی کاکە حەمە کە ئەکەوێتە سەر سەرەتای شەقامی "گۆران"ی ئێستاو بەرجادە کەوت. هەر لەم ماڵەدا خوالێخۆشبوو لە دایک بووەو گەورەبووە.

**وێنەیەکی مێژوویی لەگەڵ سەرکردەی ڕەحمەتی مەلا مستەفای بارزاندا. لەڕاستەوە یەکەم و دووەم نەناسرانەوە، پێدەچێ لە کوردەکانی باکووربن. ئەو کەسەی پشتەوە کاک دارای کاکە حەمەیە کە لە (لەندەن) دائەنیشێ.**

چەند وێنەیەکی خێزانی لەگەڵ منداڵانی خزم و کەس وکاردا و
هەروەها لەگەڵ مەلا عەلی باوکیدا

لەگەڵ خوالێخۆشبوو کاك عەبدولی سوران و
کاکە محەمەد عەزیزدا

هەر لەگەڵ ئەواندا

لەگەڵ خزمە نزیکەکانی خۆیدا

لەگەڵ منداڵانی خزمو کەس و کاردا

لەگەڵ هاوسەرەکەی و خوشکی و ئاسۆو ئالانی کوڕیدا. لەسەرچنار

سەیرانێکی خێزانی. لە ڕاستەوە خوالێخۆشبوو ئایشەخانی دایکی و هاوسەرەکەی ناهیدەخان و خۆی و کاک جیهانی برای و خوالێخۆشبوو گەلاوێژخانی خوشکی.

لەگەڵ کاک ئەنوەر فەخری هاوڕێیدا

لەگەڵ هەندێ لە هاوڕێ نزیکەکانی خۆیو کاک جیهانی برایدا

وێنەیەکی خێزانی. لەڕاستەوە خوالێخۆشبوو ناهیدەخانی هاوسەری و ئاسۆی کوڕی وگەلاوێژخانی خوشکی و کاك جیهانی برای.

وێنەیەکی خێزانی. لەگەڵ ناهیدەخانی هاوسەری و منداڵەکانی خۆیی و کاك شیروان و کاك جیهانی برای و هەندێ لە منداڵانی خزم و کەس وکاردا.

**لەڕاستەوە: خەسرەو ئەحمەد میرزا، فەرەیدون عەلی ئەمین، ڕەوف بێگەرد، شێخ لەتیف**

# ناوەڕۆك

زنجیرەی کتێبە چاپکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم ساڵی ا

| ناوی کتێب | نووسینی | وەرگێر |
| --- | --- | --- |
| ٣٣٧-ئەفسانەی کتێب | کۆمەڵێ نووسەر | یاسین |
| ٣٣٨-کۆ چیرۆك | ڕەووف بێگەرد | |
| ٣٣٩-قەدری جان | مەریوانی عومەر دەوڵەت | |
| ٣٤٠-ئیتیك لە ڕۆژنامەوانیی کوردیدا | شوان ئادەم ئەیڤەس | |
| ٣٤١-تیشکێك لەسەر ڕۆمان | عەبدولڕەحمان مونیف | شیرین |
| ٣٤٢- لە گوڵەوە هەتا سووتوو | شێرکۆ بێکەس | |
| ٣٤٣-محەمەدی قازی کێیەو... | ئا:سەیدعەلی ساڵحی | ڕێباز م |
| ٣٤٤-ئافاتەکانی بنەماڵەی... | عەتا محەمەد | |
| ٣٤٥-فەلسەفەو لاهوت لە... | د.حەمید عەزیز | |
| ٣٤٦- دیوانی مەولەوی | | |
| ٣٤٧- لەئەدەبی ڕووسییەوە | | ئەنوەر |
| ٣٤٨-لاوێتی لە پیریدا | ئەمین ڕوەیحە | تۆفیق |
| ٣٤٩-فیکری خۆرئاوا | هاشم ساڵح | شوان |
| ٣٥٠-کلاولارو قەرەچی | د.ئیبراهیم قەرەچی | ئەحمە |
| ٣٥١-گەڕان بە دوای ماناکانی شیعریدا | عەتا قەرداغی | |
| ٣٥٢-هەڵدانەوەی دەفتەرەکانی شیعرو.... | مەحمود دەروێش | جەمال |
| ٣٥٣- ئێستا مەنگو بێگیانە | ئۆکتاڤیۆپاز | ئەدیب |
| ٣٥٤-نیتشەو پاش تازەگەری | د. محەمەد کەمال | |
| ٣٥٥-بازاڕی بۆنفرۆشان | دلشاد عەبدوڵلا | |